# سەردەم 28

ئابی
2003
ســـــــاڵی پێنجەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی



خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 1303473

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە (14665/615 و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( e~mail )ەوە

sardamnet@www.sardam.net

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك

## • فیكر و فەلسەفە



## • ڕەخنە و لێكۆڵینەوە



## • گفتوگۆ



## • لە ئەدەبی گەلانەوە

نرخی (8) هەشت دینارە

# بەرەو ئارکیۆلۆژیای فیکری ئیسلامی

## دەروازەیەك بۆ بیری محەمەد ئارکۆن

**هاشم ساڵح**

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

هەر لە ساڵانی 1978–1979 وە چوومەتە ناو وەرگێڕانی کارەکانی محەمەد ئارکۆنەوە، واتە پانزە ساڵ پترە سەرقاڵی تەرجەمەکردنی ئارکۆنم و تا ئێستا پتر لە حەوت کتێبیم وەرگێڕاوە، ئەمە جگە لە چەندین وتار و پەراوێز و شەرحی دووردرێژ و هەروەها ژمارەیەك گفتوگۆ و چاوپێکەوتن لەگەڵیدا لە پێناوی روونکردنەوەی فیکری ئەم پیاوە و گەیاندنی بە خوێنەران. بەڵام سەرباری ئەم کارانە هەمیشە هەستم بەوە کردووە کە هێشتا ئەم ئەرکە تەواو نەکراوەو تا ئێستاش فیکری ئارکۆن بۆ خوێنەری رۆشنبیر قورسە، لێرەو لەوێ چەندین نامەی گلەیی و ناڕەزاییم بۆ هاتووەو داوا دەکەن هەوڵبدەم زیاتر فیکری ئارکۆن روون بکەمەوەو بەشێوەیەکی ئاسانتر بیخەمە ڕوو، ناڕەزایی ئەو کەسانەش تەنها لە وەرگێڕانی ئەو وتار و کتێبانەدا نەبوو کە لە سەرەتادا وەرمگێڕاون و پتر وەرگێڕانێکی حەرفی بوون و لەو ئەزموونەدا لاواز بووم، بەڵکو لەو کتێب و لێکۆڵینەوانەش تێنەدەگەیشتن کە بەم دواییە وەرمگێڕاون و پتر توانام بەسەریاندا شکاوەو زیاتر لە فیکر و تەوەرە سەرەکییەکانی تێگەیشتووم، لە ڕاستیدا توێژەر – وەرگێڕ لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار و ساڵەکاندا ڕۆشنبیریی فراوانتر دەبێت و زانیاریی پتر دەبێت و باشتر دەتوانێت فیکرێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بگوازێتەوە.

کەواتە سەرباری ئەو هەموو کۆششەی ئەنجامم داوە کەچی هێشتاکە فیکری محەمەد ئارکۆن فیکرێکی قورسە و بگرە لە تەوەر و بنچینە سەرەکییەکانیدا فیکرێکی داخراوە بۆ خوێنەری عەرەبی، لەبەرئەوە بیرم لەوەکردەوە ڕێگەیەکی تر

بدۆزمەوە بۆ خستنەڕووی بیری ئەم بیریارە, بیرم لەوە کردەوە خۆم راستەوخۆ وتار و لێکۆڵینەوە لە بارەی بیری ئارکۆن بنووسم لە جیاتی ئەوەی وەریبگێڕم و پەراوێزی بۆ بکەمەوەو شەرحی بکەم, تۆ بڵێ باشتر وایە هەردوو شێوەکە تێکەڵ بکەم واتە هەم لە بارەیەوە بنووسم و هەم وەریانبگێڕم و پەراوێزیشیان بۆ بکەم. جا لەبەرئەوەی من بۆ ماوەی پانزە ساڵ خەریکی خوێندنەوە و تەرجەمەکردنی ئەم بیرە بوومە و خۆیشم لە ناو هەمان ئەو کەشوهەوا فیکرییەدا بووم کە بیری ئارکۆنی بەرهەمهێناو گەشەی پێدا, هەستم بەوەکرد کە من قودرەتی ئەوەم هەیە بچمە ناو ئەم کارەوە و ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرم کە تا ماوەیەکی نزیکیش جورئەتی ئەوەم نەدەکرد خۆمی لە قەرە بدەم. وتم باشە مادامەکی من لە تەرجەمەکردنی ئارکۆندا تا ئەم ئاست و سنوورە هاتووم و چەندین ساڵیشە لەگەڵ ئەم فیکرەدا دەژیم, بۆچی هەوڵنەدەم خۆم بابەتێك بنووسم و وردە وردە تەوەرە سەرەکییەکانی بگرم و زاراوە و میتۆدە زانستییەکەی شیبکەمەوە؟ پاشان نوسینی راستەوخۆ جیاوازە لە وەرگێڕان, نووسین بەرپرسیاریەکی گەورەترم دەخاتە سەرشان, بەڵام ئازادیەکی زیاترم پێدەبەخشێ لە شەرحکردنی ئەم بیرە و گرێدانی بە ژینگە زانستیەکەی و بەو رەوتە فیکرییانەی دیکە کە لە گۆڕەپانەکەدا هەن. بەمجۆرە جومگە سەرەکییەکانی فیکری محەمەد ئارکۆن باشتر و روونتر دەردەکەون و خوێنەریش لەسەرچاوەو کاریگەریەکانی ئاگادار دەبێت. بەم شێوەیە ئارکۆن نابێت بە "ئەفسانەیەك" و بە لوغزێك لە کاتێکدا ئەو بەردەوام رەهەندەکانی ئەفسانەی رووت کردۆتەوە و ریشەی مێژووگەریی فیکری ئیسلامی ئاشکرا کردووە, ئەمە جگە لەوەی ئەم کارە توانای ئەوەم پێدەبەخشێ وەڵامی ژمارەیەکی زۆری ئەو پرسیارانە بدەمەوە کە خوێنەری عەرەبی لە بارەی کەلەپووری ئاینی خۆی و کەلەپووری خۆرئاوایی و مەسیحی و ئیسلامی و بەگشتی لە بارەی (دیاردەی ئاینی) رووبەڕووی خۆی دەکاتەوە. ئەمەش بە تەبیعەتی حاڵ بەرەو ئەوەم دەبات لەو زاراوانە بکۆڵمەوە کە محەمەد ئارکۆن بەکاریان دەهێنێ و لە لێکۆڵینەوەی فیکری ئیسلامیدا پراکتیزەیان دەکات, وەك دەزانرێ ئەو زاراوانە هۆی بنەڕەتی قورسیی فیکری ئارکۆنن کە خوێنەر ناتوانێ بە ئاسانی لێیان تێبگات، ئەوەندە بەس نییە ئەو زاراوانە بە تەنها وشەیەك یان تەنانەت بە رستەیەکیش تەرجەمە بکرێن، بەڵکو دەبێ بە درێژی شیبکرێنەوە و هۆی سەرهەڵدانی ئەو زاراوانە لە فیکری ئەوروپیدا روون بکرێتەوەو لەسەر دەستی کێدا داهێنراون و لە چ ژینگەیەکی گفتوگۆی زانستیدا گەشەیان کردووە و.. هتد, هەروەها دەبێ بەدوای ئەو هۆکارانەشدا بگەڕێین کە وای لە ئارکۆن کردووە هەندی زاراوەی دیاریکراو هەڵبژێرێت و ئینجا بۆچی لەسەر لێکۆڵینەوەی فیکری ئیسلامیدا پراکتیزەی کردوون و چۆنی پراکتیزە کردوون و تا چ ئەندازەیەك لەو پرۆسیسەدا سەرکەوتوو بووە.. هتد.

وەك دەزانرێ ئەو زاراوانە سەر بەو زانستەن کە بە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان ناودەبرێ, دەبینین هەندێ کەس تەنها قسە لەسەر "زانستە مرۆڤایەتییەکان" دەکەن, بەڵام من پێم وایە باشترین ناو بریتییە لە: "زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان" چونکە مەسەلەکە تەنها لێکۆڵینەوە نییە لە تاکە کەس یان مرۆڤ لە خۆیدا, بەڵکو لێکۆڵینەوەیە لە مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگادا, واتە لێکۆڵینەوە لە بونیاد و میکانیزمی کۆمەڵگا. ئەم چەشنە لێکۆڵینەوەیە لەم سی ساڵەی دواییدا

تەشەنەی سەندووە و بگرە لە ناوەندە زانستیەکاندا بووە بە میتۆدۆلۆژیەکی باو. میتۆدی زانستەکانی وەکو: زانستی کۆمەڵایەتی (سۆسیۆلۆجیا) و زانستی دەروون (سایکۆلۆژیا) و شیکردنەوەی دەروونی و ئەنترۆپۆلۆژیا و زانستی مێژوو و زانستی زمانەوانی و زانستی بەراوردکاریی ئاینەکان.. هتد, هەموو ئەمانە هاوشان و هاوکارن لە پێناوی تێگەیشتن لە کۆمەڵگا و تێگەیشتن لە مرۆڤ. خۆرئاواییەکان چەندین قۆناغی گرنگیان بڕیوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگاکانی خۆیان بێگومان لە ژێر رۆشنایی ئەم زانستانە و زاراوە و میتۆدەکانیاندا. ئەم کارە گەیشتۆتە ئاستێك کە ئیتر گوندێك یان شارێك یان قۆناغێکی مێژوویی دوور یان نزیك نەماوەتەوە نەکەوتبێتە ژێر لێکۆڵینەوەی ئەم زانستانە بەشێوەیەکی ورد و پڕ لە ئامار و بونیادگەریانە. لەبەرئەوە کاتێك خۆرئاواییەکان پلان بۆ ئایندەی کۆمەڵگاکانی خۆیان دەکێشن, دەزانن لەسەر چ بنەمایەك پلان دابنێن, چونکە ئەوان هەموو پێدراو و زانیاریەکیان لەبەردەستدایە و دەتوانن بە شێنەیی لێکۆڵینەوە و کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن, کەچی ئێمە شتێکی زۆر کەم لە بارەی کۆمەڵگاکانی خۆمان یان مێژووی خۆمان دەزانین, بێگومان مەبەستم لە زانین و مەعریفەیەکی زانستی باوەڕپێکراوە نەك بۆچوونی گشتی باو یان حوکمدانی پێشوەخت. ئەم جۆرە بۆچوونە گشتی و پێشوەختانە لە هەموو شوێنێکی ناوچەکانی ئێمەدا هەن و ئەمەش وەهمی ئەوەمان لە لا دروست دەکات گوایە کۆمەڵگاکانی خۆمان دەناسین, لە راستیدا ئێمە لە ژینگە و لە منداڵی و لە ئایین و لە مەزهەبەکانی خۆمانەوە بە هەڵە و خۆڕسکانە ئەو زانیاریانەمان وەرگرتووە. ئەمە لە کاتێکدا مەعریفەی زانستی بەر لە هەر شتێك ئەوە لە ئێمە دەخوازێت کە سنوورێك بۆ ئەو زانیارییە پڕ لە هەڵە و بۆ ئەو کلێشە سۆسیۆلۆژیە قەبەیە دابنێین.

من لێرەدا لەسەر مەسەلەی زانستێتی زانستە وردەکان و زانستێتی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان ناوەستم, ئەمە مەسەلەیەکی ئیپستیمۆلۆژیی قەبەیە و پێویستی بە چارەسەرێکی سەربەخۆ هەیە. تەنها ئەوەندە دەڵێم کە زانستە مرۆڤایەتییەکان سوودی لە میتۆدەکانی زانستە سروشتییەکان وەرگرتووە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زانستیی ئەزمونگەری لە مرۆڤ و کۆمەڵگا بکۆڵێتەوە, هەموو ئەمەش بۆ ئەوەیە تا راڤەکردنێکی زانستی بۆ رەفتاری مرۆڤ لە کۆمەڵگادا بکرێ هەروەها بۆ میکانیزمەکانی کۆمەڵگا و چۆنێتی ئیشکردنی ئەو میکانیزمانە. زانستە مرۆڤایەتییەکان ویستوویەتی بگاتە یاساگەلێك هەمان حەتمیەتی یاساکانی زانستە وردەکانی هەبێت, بۆیە زاراوەو میتۆدەکانی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان شایستەی ئەوەن لە گۆڕەپانی عەرەبیدا بناسرێن و بگرە بەسەر لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا و مێژووماندا پراکتیك بکرێن بۆ ئەوەی بە باشی لە کۆمەڵگاکان و لە مێژووی خۆمان تێبگەین. جا لەبەرئەوەی محەمەد ئارکۆن یەکەمین توێژەری گەورەی موسڵمانە کە من ناسیبێتم عاشقی ئەو رۆحە زانستیە نوێیەیە و ئازادانە میتۆدەکانی لەسەر ئیسلام پراکتیزە کردووە, چەندین ساڵی دووردرێژیشە بایەخی من چۆتە سەر ئەم بیریارە. دوای ئەوەی چەندین بابەت و کتێبی ئارکۆنم وەرگێڕاو ژمارەیەکی زۆری بابەتە وەرگێڕاوەکانیم لەلادا کەڵەکە بوون, بیرم لەوە کردەوە چۆن زاراوەکان کۆبکەمەوە و بە چ شێوەیەك رێکیان بخەم و بیانخەمە بەردەستی خوێنەران. لە راستیدا من هەمیشە ئەو ئەرکەم دوادەخست و لەگەڵ خۆمدا دەمووت دەبێ بۆ ماوەیەکی زیاتر

چاوەڕێ بکەم تا ئەو کاتەی بابەتە وەرگێڕدراوەکان زۆرتر دەبن و ئیتر دوای ئەوسا دەست دەکەم بە کاری تاوتوێکردن و پیاچوونەوەو ڕێکخستن، بەڵام لەبەرئەوەی محەمەد ئارکۆن تا ئەمڕۆش بەردەوامە لە پرۆسەی توێژینەوەی زانستی و تا ئێستاش فیکر بەرهەمدەهێنێ و ئاگاداری گشت ئەو زاراوانەیە کە کتێبخانەی خۆرئاوایی لە زانستە جیاجیاکاندا بەرهەمیدەهێنێ ئەمە واتا من دەبێ تا بێکۆتا چاوەڕێ بکەم. بۆیە بڕیارم دا سنورێك بۆ ئەو دواخستن و ئەو دوودڵیەم دابنێم و دەست بکەم بە جیاکردنەوە و ڕێکخستنی ئەو زاراوە زانستیانەی لە گۆرەپانی زمانە ئەورووپییەکانەوە (بە تایبەتی زمانی فەرەنسی، سەبارەت بە کارەکان و وەرگێڕانەکانی من) هاتونەتە ناو زمانی ئێمەوە، بەمجۆرە من کۆمەڵێ شتی باش دەخەمە بەردەستی خوێنەر کە دەبێتە یارمەتیدەرێکی باش بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی بابەتە وەرگێڕدراوەکان، ئەوسا خوێنەر دوچاری ناتێگەیشتن و زەحمەتی رستەکان و تەمومژیی ئەو زاراوە بیانیانە نابێت کە – وەك هەندێ کەس دەڵێن – فیکری ئارکۆن پڕە لەو جۆرە زاراوانە.

بەر لەوەی بچمە ناو پرۆسەی جیاکردنەوەی زاراوەکان و تەعریبکردن و شەرحکردنیان، هەوڵدەدەم روخسارە بنچینەییەکانی ئەو تێڕوانینە ئیپستیمۆلۆژیە گشتیە بخەمە ڕوو کە محەمەد ئارکۆن لە میانەیەوە کاردەکات. ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە هەموو فیکرێکی بەرپرسیار – واتە فیکرێکی وردبین و جیدی – پشت بە هەندێ زاراوەو کەرەستەی مەعریفی و پشت بە میتۆدەکان دەبەستێت. هەر فیکرێکیش کۆمەڵێ زاراوە و میتۆدی ڕۆشنی نەبێت لەو خانووە دەچێت کە دینگە و دیواری نەبێت یان وەکو ئەو قسەیە وایە کە لە هەوادا پەرت دەبێت. ئەو شتەی کە فیکری جیدی – واتە فیکرێك بەرپرسیارە لەو شتانەی دەیانڵێ – لە فیکری ناجیدی و بەتاڵ جیادەکاتەوە، بریتییە لەوەی: فیکری جیدی هەر لە سەرەتاوە شوناسی خۆی ئاشکرا دەکات و زاراوە و میتۆد و بنەماکانی خۆی دیاری دەکات، پاشان داوا لە خوێنەر دەکات دواجار لە خودی ئەو فیکرە بپێچێتەوە، بە واتای: ئایا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست پراکتیزەی کردووە یان نا؟ ئاخۆ بە درێژایی ڕێگا خۆی بە میتۆدەکان بەستۆتەوەو بەڵێنەکانی خۆی بەجێهێناوە یان نا..؟

کاتێك سەیری ڕێچکەی فیکریی محەمەد ئارکۆن دەکەین دەبینین هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە تاوەکو ئەمڕۆ دەستی کردووە بە بەرهەمهێنانی توێژینەوەی زانستی لە بارەی ئیسلام – تەنها ئیسلام –، هەروەها دەبینین ئارکۆن هەر لە سەرەتاوە کارەکەی خۆی لەسەر جیاکردنەوەیەکی روونی نێوان دوو تێڕوانین یان دوو میتۆد بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاستییەکانی ئیسلام دامەزراندووە: تێڕوانینی یەکەم یان میتۆدی یەکەم بریتیە لە میتۆدی خۆرهەلاتناسی تەقلیدی، یان ئەوەی ئارکۆن بە "ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی" ناوی دەبات. میتۆدی دووەم بریتیە لە "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" کە ئارکۆن خۆی پەیڕەوی دەکات و لە ڕووی تیۆری و پراکتیکیەوە بنچینە زانستیەکانی پەرەپێدەدات.

ئێمە شتێك لە فیکری محەمەد ئارکۆن تێناگەین ئەگەر ئاگاداری ئەو جیاکارییە بنچینەییە نەبین کە هەر لە سەرەتاوە لە نێوان ئەو دوو زاراوەیەدا دایمەزراندووە و بە درێژایی سەرانسەری ڕێچکەی زانستی خۆی پەیڕەویی کردووە. ئەم جیاکارییە – وەك دواتر دەیبینین – بازدانێکی نەوعی یان ئیپستیمۆلۆژی دەنوێنی نەك پۆلێنکردنێکی

رووکەشانەی جیاوازییە میتۆدیەکان. ئارکۆن لە راستیدا یاوەریی ئەو قەڵەمبازە ئیپستیمۆلۆژی و میتۆدییە گەورەیە دەکات کە هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە لە گۆڕەپانی فەرەنسیدا ئەنجام دراوە.

## ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی

دەبینین ئارکۆن زۆر جار زاراوەی ئیسلامیاتی کلاسیکی (یان ئیسلامۆلۆژی کلاسیکی) لە بری زاراوەی خۆرهەڵاتناسی (ئۆرێنتالیزم) بەکاردێنێت, چونکە وشەی "خۆرهەڵاتناسی" زیاد لە پێویست لەوتێنراوە بە هۆی ئەو مشتومڕە ئایدیۆلۆژییە توندەی لانی کەم لە شەستەکانەوە ورووژێنراوە. لێرەدا دوو تێکستی بنچینەیی ئارکۆن هەیە (واتە دوو تێکستی میتۆدی و تیۆری) لە بارەی ئەو زاراوەیە دەدوێ. یەکەمیان پێشەکی چاپی سێهەمی کتێبی (چەند وتارێك لە بارەی فیکری ئیسلامی) 1984و دووەمیان بەشی یەکەمی کتێبە ناودارەکەی بە ناوی (بەرەو رەخنەگرتن لە عەقڵی ئیسلامی) چاپی یەکەم 1984. جگە لە تێکستێکی دیکەی گرنگ کە راستەوخۆ باسی بابەتی خۆرهەڵاتناسی دەکات بە ناوی (گوتارە ئیسلامیەکان, گوتارە خۆرهەڵاتناسیەکان – و فیکری زانستی).

بێگومان لێرەدا چەندین ئاماژەی درێژ یان کورت هەیە بۆ ئەو گفتوگۆ میتۆدگەرایییە گەورەیەی بەردەوام ئارکۆنی سەرقاڵ کردووە و لە نوسینە جیاجیاکانیدا بڵاوبونەتەوە, لە کوێدا پێویستی کرد لێی دەدوێین و سەرەتای دەستپێکردنیشمان یەکەمین کتێبی قەبەی ئارکۆنە بە ناوی (هیومانیزمی عەرەبی لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا).

ئارکۆن لە دەقی یەکەمیدا – واتە پێشەکی کتێبی: چەند وتارێك لە بارەی فیکری ئیسلامی – بەمجۆرە ئەو زاراوەیە پێناسە دەکات: "ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی بریتییە لە کۆی ئەو مەعریفە خۆرئاواییەی لە بارەی ئیسلامەوە نووسراوە هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم".

ئەم مەعریفەیە (واتە: خۆرهەڵاتناسی, یان ئیسلامیاتی کلاسیکی) رۆڵێکی ئیجابی هەبووە لە هەڵگیرساندنی ئەو شتەی عەرەبەکان پێیدەڵێن: "بووژانەوە" یان "رێنیسانس" (واتە: رێنیسانسی عەرەبی). گرنگترین دەستکەوتی خۆرهەڵاتناسی – کە کەمتر شوێنی رەتکردنەوەو مشتومڕە – بریتییە لە: چاپکردن و ساغکردنەوەی ژمارەیەك لە تێکستە کلاسیکیە عەرەبی – ئیسلامیەکان, ئەو تێکستانەی بۆ چەندین سەدە بیرچووبوونەوە تەنانەت لە لایەن موسڵمانان و خودی کەلەپووری ئیسلامیش. دەرهێنانی ئەو تێکستانە لەمەرقەدەکانیان و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەیان لەسەر رێگەی فیلۆلۆژیی (واتە فیقهی زمانەوانی) تا ئەمڕۆش دوورە لەوەی کۆتایی بێت, چونکە لێرەدا ژمارەیەکی زۆری دەستنوسی شاراوە و لەبیرچوو هەیە کە لە کتێبخانە جیهانییەکاندا پەنهانن و تا ئێستاش ساغ نەکراونەتەوەو رووناکییان نەدیوە. ئاشکرایە کە میتۆدی فیلۆلۆژیی وردبین یەکێ لە جیاکاریە بنەڕەتیەکانی ئیسلامیاتی کلاسیکی پێکدەهێنێ, جێی داخە ساغکردنەوەی تێکستە ئیسلامیە دێرینەکان لە دنیای عەرەبیدا پەیڕەوی سادەترین رێسای ئەم میتۆدە فیلۆلۆژییە ناکات کە هەر لە سەدەی شانزەهەمەوە لە خۆرئاوادا بۆ ژیاندنەوەی کەلەپوری گریکی – لاتینی پڕۆسەکراوە.

ئەمە سەبارەت بە لایەنە پۆزەتیڤەکانی میتۆدی فیلۆلۆژی, ئەی لە بارەی لایەنە نێگەتیڤەکانی دەتوانین چی بڵێین؟ ئارکۆن دەڵێ: "بە پێچەوانەی

ئەمەوە وا دیارە ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی لاواز و پەرپووتە بە تایبەتی کاتێ کە بنەما و رێسا جێگیرە پەنهان و ئاشکراکانی دەپشکنین و هەروەها کاتێك لە نزیکەوە میتۆدەکانی و پاشان تەئویلەکانی (بێگومان بۆ ئیسلام) دەپشکنین بۆمان دەردەکەوێت چەندە لاوازە. من ئەمە دەڵێم و ناشمەوێ بخزێمە ناو ئەو دادگاییکردنە تۆمەتکاری و ئایدیۆلۆژییەی لە دژی خۆرهەڵاتناسی دەکرێت وەك چۆن ئەمرۆ ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیرانی عەرەب و موسڵمان ئەم کارە دەکەن. ئەوان تەنها بەوەندە واز دەهێنن کە دەیانەوێ بەرگریکردنێکی کوێرانە لە ئیسلام یاخود ئایدیۆلۆژیایەکی دوژمنکارانە شوێنی خۆرهەڵاتناسی بگرێتەوە یان بەڕوویدا بوەستێیتەوە. ئەمە لە کاتێکدا گرفتی راستەقینە لە ئاشکراکردنی بنەما جێگیر و شاراوەکانی خۆرهەڵاتناسیدایە, واتە گرێدانی بەوەی بشێت ناوی بنێین: سیستمی کولتوریی سەر بەچەرخی کلاسیکی لە خۆرئاوادا".

بەمجۆرە دەبینین ئارکۆن لە ئاستی ئیپستمۆلۆژییەوە رەخنە لە خۆرهەڵاتناسی دەگرێت نەك لە ئاستی ئایدیۆلۆژی, بە پێچەوانەی ئەو کارەی زۆربەی – ئەگەر نەڵێین هەموو – رۆشنبیرە عەرەب و موسڵمانەکان دەیکەن. دیسان ئارکۆن دەڵێ: "کاتی ئەوە هاتووە گرایشی مۆرالیستی – یان ئەوەی گوایە مۆرالیستیە – و وەعزدادانی باوی عەرەبی ئیسلامی تێپەڕێنین. هەروەها دەبێ ئەو گوتارە ئایدیۆلۆژیە پڕ لە ژاوەژاو و سادەگۆییانەش تێپەڕێنین کە هیچی وای بۆ خاوەنەکانیان تێناچێت. دەبێ هەموو ئەو شتانە تێپەڕێنین بۆ ئەوەی بخزێینە ناو رەخنەیەکی ئیپستیمۆلۆژیی قووڵەوە بۆ ئەم دوو سیستمە فیکرییە: لە سەرێك سیستمی عەرەبی – ئیسلامی کلاسیکی, لە سەرێکی تر سیستمی خۆرئاوایی". دەتوانین بڵێین ئارکۆن هەموو ژیانی خۆی بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆژە رەخنەییە گەورەیە تەرخان کردووە.

بەڵام دەقی دووەم کە تیایدا لە بارەی ئیسلامیاتی کلاسیکی (واتە خۆرهەڵاتناسی تەقلیدی) دەدوێ, بریتییە لە: "بەرەو ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" و لەوێدا دەڵێ: "ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی بریتییە لە گوتاری خۆرئاوایی لە بارەی ئیسلام, واتە گوتارێك هەوڵی عەقڵانیکردن دەدات لە تێگەیشتنی ئیسلامدا. بەڵام وشەی ئیسلامۆلۆژی (*Islamologie*) و خودی زاراوەکە داهێنانێکی تەواو خۆرئاواییە. چونکە موسڵمانەکان تەنها لە بارەی ئیسلام قسە دەکەن وەك چۆن مەسیحیەکانیش هەمان شت دەکەن کاتێ لە بارەی مەسیحیەت قسە دەکەن".

کەواتە دوای ئەوەی ئەم وشەیە لە زمانە بیانیەکاندا داهێنرا, لە رێگەی وەرگێڕانەوە وشەیەکیان لە زمانی عەرەبیدا بۆ دۆزییەوەو لە راستیدا ئەمە لە لای ئێمە لە زۆربەی زاراوە و چەمکەکاندا روودەدات. جیا لەبەرئەوەی خۆرئاواییەکان (لە خۆرهەڵاتناسان و غەیری خۆرهەڵاتناسانیش) لەم سەردەمەی ئەمڕۆماندا زانست بەرهەم دەهێنن و ئێمەش بە حازری وەریدەگرین, ئەوا ناچاردەبین چەمك و زاراوەکان وەربگێڕین هەروەکو چۆن واتا و هزر و فیکرەکانیش وەردەگێڕین. بێگومان ناشبێ بە چاوی سووکەوە سەیری ئەو کۆششە گەورانە بکەین کە لە پێناوی پرۆسەی گواستنەوە و وەرگێڕاندا خەرجکراوە, وەرگێڕان کارێکی ئەوەندە سادە و ئاسان نییە وەك هەندێ کەس بەو جۆرە وێنای دەکەن. ئەگەر ئێمە تا ئەمڕۆش ناتوانین لە بواری زانستیدا داهێنان بکەین ئەوا لایەنی کەم با بتوانین وەرگێڕانی چاك بکەین.

هەرچۆنی بێ، ئارکۆن وایدەبینێ ئەم زانستە تا ئەمڕۆش لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریی بۆ نەکراوە تا جۆری میتۆدەکەی و سروشتی گریمانەکەی و لایەنە دیار و نادیارەکانی دەربخات. ئارکۆن لێرەدا دەیەوێ ئەو کارە ئەنجام بدات. ئاخۆ ئارکۆن چ رەخنەیەك و چ خەوشێکی دیکە لە ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکیدا دەبینێت؟ ئەو هەر لە سەرەتاوە تێبینی ئەوە دەکات کە "ئیسلامۆلۆژی کلاسیکی ئەرکی خۆی لە لێکۆڵینەوەی ئیسلامدا قەتیس دەکات لە میانی نووسینەکانی گەورە فیلۆلۆژیستان و رووناکبیرە ئیسلامییە کلاسیکییەکان. لە سەرەتادا وا دەردەکەوێ کە ئەم میتۆدە زۆر وردبین و بابەتییە. زانای ئیسلامۆلۆژی (یان خۆرهەڵاتناس) دەزانێ کە خۆی کەسێکە لە دەرەوەی بابەتی لێکۆڵینەوەکەیدایە و خۆی لە هەر جۆرە حوکمدانێك بە دوور دەگرێت، ئیدی تەنها ناوەڕۆکی تێکستە ئیسلامییە کلاسیکی و نوێیەکان دەگوازێتەوە و وەریاندەگێڕێتە سەر زمانە بیانییەکانی وەکو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و ئیتالی و.. هتد.

بەمجۆرە زانای ئیسلامۆلۆژی وەك رێنیشاندەرێکی سارد و وشك لە مۆزەخانەدا، رەفتار دەکات. ئەو تەنها تابلۆکانت پیشان دەدات بێئەوەی هەقی بەسەر شتێکی ترەوە هەبێت، واتە بێئەوەی راڤەیان بکات یان هەڵیانسەنگێنێ یاخود لە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی تابلۆکاندا یارمەتیت بدات. بەڵگەش بۆ ئەمە دەبینین ئەو پەیوەندییە یان ئەو داپچڕانەی موسڵمانە هاوچەرخەکان لەگەڵ ئەو تێکستانەدا – واتە تێکستی خۆرهەڵاتناسان – هەیانە، بەلای زانای ئیسلامۆلۆژییەوە گرنگی نییە و وەك خۆیان دەڵێن: ئەمە ناچێتە ناو بازنەی پسپۆریی ئێمەوە و ئەمە مەسەلەیەکی ناوخۆیی و تایبەتییە و پەیوەندی بە موسڵمانەکان خۆیانەوە هەیە و پەیوەندی بە ئێمەوە نییە.

بەڵام ئێمە دەزانین کە مەسەلەی (بەردەوامێتی) و (داپچڕان) سەبارەت بە مێژوونووسانی فیکر شتێکی زۆر گرنگە و نابێ خۆیانی لێ لابدەن ئەمە ئەگەر بیانەوێ بەشێوەیەکی جیدی کارەکەیان ئەنجام بدەن. ئەمە جگە لەوەی کە مەسەلەی بەردەوامێتی و داپچڕان تەنها بەشێوەی تیۆری یان ئەبستراکتی لێیناکۆڵرێتەوە بەڵکو بەشێوەیەکی واقیعی هەستپێکراو و پشکنینی مەیدانی لێیدەکۆڵرێتەوە. تەنها ئەم رێگەیە رادەی پەیوەندی یان نەبوونی پەیوەندیی موسڵمانە هاوچەرخەکان بە تێکستە کۆنەکانیان ئاشکرا دەکات. ئەوەندە بەس نیە موسڵمان بڵێ من موسڵمانم و ئیتر ئێمەش پێمان وابێت کە ئاگاداری تێکستەکانی کەلەپورەکەی خۆیەتی (بە تایبەتی تێکستە گەورەکانی چەرخی دامەزراندن: واتە تێکستی گەورە فیلۆلۆژیستان و دامەزرێنەرانی مەزاهیبەکانی وەکو ئیمامی شافعی و ئیبن حەنبەل و ئیبن مالك و ئەبوحەنیفە و جعفر الصادق و عبدالله بن اباض و.. هتد، پاشان تێکستی کەلامناسان و فەیلەسوفان و موعتەزیلەکان، ئەمە جگە لە تێکستی گەورەی دامەزراندن واتە قورئانی پیرۆزو هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەر و تەفسیرەکان و کتێبەکانی ئەخبار و مێژوو.. هەموو موسڵمانان لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو تێکست و کتێبانە نین.

رەخنەیەکی دیکە لە ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی ئەوەیە: تەنها ئیسلامێك کە شوێنی بایەخی "خۆرهەڵاتناس" یان زانای ئیسلامیاتی کلاسیکییە لە راستیدا ئەو ئیسلامە رەسمییەیە کە پابەندە بە دەوڵەت و دەسەڵات و زمانی پەتی و رۆشنبیریی نوخبەوە. بگرە ئەو توێژەرە عەرەب و موسڵمانانەی

بۆیان دەرەخسێ بێن بە مامۆستا لە زانكۆكانی ئەوروپا و ئەمریكادا و پرۆسەی ئیسلامۆلۆژی دەكەن, لەم رووەوە شوێن پێی خۆرهەڵاتناسەكان هەڵدەگرن, واتە ئەوانیش تەنها بایەخ و گرنگی بە ئیسلامی رەسمی دەدەن. ئەمە واتا ئەوان لە گۆڕەپانی لێكۆڵینەوەدا هەموو ئەم لایەنانەی خوارەوە دوور دەخەنەوە:

1–هەموو گوزارشتێكی زارەكیی ئیسلام, بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بەو میللەتانەی نووسین نازانن وەكو بەربەر و ئەفریقییەكان و جەماوەری میللی و نەخوێندەوار بە گشتی.

2–ئەو شتانەی نەنوسراون و نەوتراون, واتە ئەو شتانەی كەسێ ناوێرێ بیانڵێ یان بیاننووسێ بە هۆی سانسۆرێكی ئایدیۆلۆژیی توند و دەسەڵاتی تاكە حزب بەسەر هۆیەكانی راگەیاندندا (واتە ئەو شتە بدركێنیت كە بیری لێناكەیتەوە, یان لە ناخی خۆتدا بیر لە شتێك بكەیتەوە بێئەوەی بوێریت بیدركێنیت. لێرەوە هەژموونی دووڕوویی و نیفاق لە گۆڕەپانی عەرەبی – ئیسلامیدا زاڵدەبێت).

3–ئەو شتەی نەنووسراوە بەڵام وتراوە و لە كۆڕ و كۆبوونەوە و مزگەوت و قوتابخانەو زانكۆدا گێڕدراوەتەوە و حیكایەت كراوە. خۆرهەڵاتناس هەمیشە بە "تێكستە شەرعییەكان"ی ئیسلامی كلاسیكی قەتیس دەكرێ, یان بە نووسینەكانی ریفۆرمیستە سەلەفییەكانی سەدەی نۆزدەهەم, كەچی لێكچەرێكی زیندووی وەكو لێكچەرەكانی محمد سعید رمضان البوطي فەرامۆش دەكات گەرچی ئەم پیاوە دەتوانێ لە یەكێ لە مزگەوتەكانی دیمەشقدا هەزاران كەس لە دەوری خۆی كۆبكاتەوە. هەروەها دەكرێ ناوی متولي الشعراوي لە میسر بهێنین, یان ناوی وتاربێژەكانی مزگەوت و واعیزە گەورەكان, لە راستیدا ئەمانە كاریگەرییەكی زۆر گەورەتریان لەسەر میللەت هەیە وەك لە تێكستە كلاسیكیەكان. لە راستیدا خۆرهەڵاتناسە نوێیەكان گرنگی بە وتارەكانی سەلەفییە نوێیەكان دەدەن, هەروەها گرنگی بە نووسینەكانی رێبەری بزوتنەوە ئوسوڵییەكانی وەكو راشد الغنوشي یان حسن ترابي و ئەوانیتر دەدەن و دەقەكانیان وەردەگێرنە سەر زمانە ئەوروپییەكان بێگومان لە تێڕوانینی بەرژەوەندییەكی سیاسی خێرا و راستەوخۆوە پتر لەوەی لە تێڕوانینی شیكردنەوەیەكی قووڵی ئیپستیمۆلۆژییەوە بێت و دواتر لەم خاڵە دەدوێین. ئەوان بە پلەی یەكەم دەیانەوێ خزمەتی كۆمەڵگاكانی خۆیان بكەن نەك خزمەتی كۆمەڵگا ئیسلامییەكان.

4–فەرامۆشكردنی ئەو تێكستانەی گوایە ئۆریجینال نین, واتە فەرامۆشكردنی ئیسلامی شیعی و اباضي (یان: خارجي) و تەنها بایەخ بە ئیسلامی سوننی دەدەن و پێیان وایە ئەم ڕەوتە نوێنەرایەتی هەموو ئیسلام دەكات, یان ئیسلامی ئۆرسۆدۆكسی (ئیسلامی "راست و دروست" بەو پێیەی رەوتەكانی تر بیدعەن). لە واقیعدا ئیسلامی سوننی جگە لە تیۆریزەیەكی عەقائیدی دۆگمایی شتێكی تر نییە, ئەمیش لە دواییدا هاتووە بۆ ئەوەی پاساوی ئەو شتانە بكات كە روویانداوە و رەواییەك بخاتە بەر ئەمری واقیع (واتە ڕەواپێدانی زنجیرەیەك كاری مێژوویی و سیاسی كە لە سەردەمی ئومەوییەكانەوە بەزەبری هێز سەپێنراون. ئومەوییەكان یەكەم كەس بوون ئاینیان زەوت كرد و بە دەسەڵاتی سیاسیەوە گرێیاندا, واتە ئاینیان بۆ رەوایەتی دەسەڵاتی خۆیان بەكار هێنا كە لە ڕێگەی هێز و ستەمەوە بە دەستیان هێنا). ئیسلامی سوننی پەیوەستێكی بەهێزی بەو دەسەڵاتە سیاسیانەوە هەیە

کە لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە (661ز) تا ئەمڕۆ بە دوای یەکدا هاتوون, کەواتە دەبێ دان بە ڕەوایی ئیسلامی خارجی و ئیسلامی شیعیشدا بنرێ بۆ ئەوەی دیالۆگ لەگەڵ ئیسلامی سوننیدا ئەنجام بدرێ و مەزهەبە ئیسلامییەکان یەك بگرن.

5–فەرامۆشکردنی هەموو سیستەمە سیمیۆلۆژی – سیمانتیکییە نازمانەوانییەکان (واتە ئەو سیستەمەی لە ڕێگەی ئیحا و هێما و ئاماژەوە دەلالەت دەبەخشێ, یان ئەوەی پێی دەوترێ "زمان"ی نازمانەوانی). بۆ نموونە ئەو ئەفسانانەی لە باوکان و باپیرانەوە بە میرات ماونەتەوە (حیکایەتەکانی داپیرە یان باپیرە لە شەوانی زستاندا) هەروەها عیبادەت و سروود و مۆسیقا و چۆنێتی ڕێکخستنی کات و شوێن و ئاوەدانکردنەوەو چۆنێتی ڕێکخستنی شەقامەکانی شار و دیکۆری ناوەوە (تەنانەت دیکۆریش زمانی خۆی هەیە) هونەری بیناسازی و هونەری شێوەکاری و جلوبەرگ و متبەخ و بونیادەکانی خزمایەتی و بونیادە کۆمەڵایەتییەکان. بە گشتی سەرجەمی ئەو نیشانەو هێمایانەی لە کۆمەڵگادا هەن (یان ئەوەی رۆلان بارت–ی ڕەخنەگری فەرەنسی پێیدەڵێ "ئیمپراتۆریای نیشانەکان" یان ئیمپراتۆری سیمیۆلۆژی).

لە ڕاستیدا زانستی ئیسلامیات –ئیسلامۆلۆژی – (یان: خۆرهەڵاتناسی) هەموو بایەخی خۆی لە لێکۆڵینەوەی بیری سێنتەریزمی زمانەوانی – یان لۆگۆسێنتەریستی *Logocentriste* – قەتیس کردووە، واتە (تیۆلۆژی – لاهوت – فیلۆلۆژی – فیقهی زمان – فەلسەفە). بە مانایەکی تر بایەخدانەکانی خۆی لە لێکۆڵینەوەی تێکستە تیۆرییە دێرینەکان قەتیس کردووە و ئەوانی دیکەی فەرامۆش کردووە. تەنانەت ئەم چەشنە لێکۆڵینەوەیەش پتر ئەبستراکتییە و لە ناو تێڕوانینی ئایدیالی مێژووی تەقلیدیی فیکرەکان پرۆسە دەکرێ. بەمجۆرە ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی ئەم شتانەی خوارەوەی فەرامۆش کردووە: گرفتی قەبە و ئاڵۆزی پەیوەندیی ئاڵوگۆڕ و مەرجداری نێوان ئیسلام بە سیفەتی دیاردەیەکی ئایینی/ و نێوان هەموو ئاستەکانی تری بوونی بەشەری (واتە فاکتەری کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی و مێژوویی و زمانەوانی و سێکسیو... هتد). واتە بە شێوەیەکی گشتی و لە تێڕوانینێکی ئەبستراکتییەوە لە ئیسلام کۆڵراوەتەوە وەك بڵێی ئیسلام لە سەرووی کات و لە سەرووی شوێن و لە سەرووی کۆمەڵگا و مێژووەوە وەستابێت, گوایە ئیسلام کار لە کۆمەڵگا و مێژوو دەکات بێئەوەی کۆمەڵگا و مێژوو کار لە ئیسلام بکەن, گوایە ئیسلام هەموو مێژوو و چەرخەکان دەبڕێ بێئەوەی هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا بێت (ئەمە تێڕوانین و گۆشە نیگای سەرجەم تیۆلۆژیای کلاسیکییە نەك تەنها لە ئیسلامدا بەڵکو لە مەسیحییەت و لە جولەکەشدا هەیە). ئەم چەشنە تێڕوانینە پێی وایە ئایین هیچ پەیوەندییەکی بە ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ماتریالییەکانەوە نییە و ئایین لە سەرووی ئەم شتانەوەیەو ناکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە. ئەمە لە ڕاستیدا تێڕوانینێکی ئایدیالیستییانەیە و ناتوانێ لە بەرامبەر تاقیکردنەوەدا خۆی بگرێ. ئەمەش زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییە نوێیەکان سەلماندوویانە، بۆ نموونە سۆسیۆلۆژیای ئایینی و زانستی مێژووی ئایینەکان و زانستی بەراوردکاریی ئایینەکان.

## مۆرکی پەراوێزیی خۆرهەڵاتناسی لە ناو گۆڕەپانی زانستی خۆرئاواییدا

لەبەرئـــەوەی لـــەلای ئێمـــە نـــاوی گـــەورە خۆرهەڵاتناسان ڕەونەقدار و نێودارە, پێمان وا دەبێ ئەمانــە لــە وڵاتــی خۆیشــیاندا هــەمان ناوبــانگ و ڕەونەقیان هەیە. لە واقیعدا مەسەلەکە – وەك ئارکۆن دەڵـــێ – بـــە پێچـــەوانەوەیە, کاریگـــەریی خۆرهەڵاتناســـەکان ناچــێتە دەرەوەی دیوارەکــانی بەشــی لێکۆڵینــەوەی خۆرهــەڵات لــە زانکۆکــانی خۆرئـاوادا, هـەروەها ئەمانـە هـیچ کاریگەرییـەکیان لەســەر ڕەوتــی زانســتی خۆرئــاوادا یــان فیکــری خۆرئاواشدا نییە, دیسان ئەمانە کاریگەرییەکی زۆر لاوازیان لەسەر ڕای گشتیی خۆرئاوادا هەیە.

ئایـا دەکـرێ کاریگــەریی خۆرهەڵاتناسـان لـە گۆڕەپانی فەرەنسی (یان پاریسیدا) بەراورد بکەین بە کاریگـەریی توێـژەرێکی وەکو, بۆ نموونـە, کلـۆد لیڤــی شــتراوس کــە پســپۆڕە لــە لێکۆڵینــەوەی ئەفسـانەکانی کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکانی ئـەمریکای لاتینی؟ یان ئایا دەشێت کاریگـەریی ئەمان بەراورد بکـەین بـە کاریگـەریی فەیلەسـوفێکی وەکـو میشـێل فوکۆ کە پسپۆڕە لـە لێکۆڵینـەوەی فیکـری ئـەوروپی؟ یـان بـەراوردی بکـەین بـە فیرنـان برۆدێـل یـەکێ لـە ڕێبــەرانی زانســتی مێــژووی نــوێ لــە فەرەنســە؟ تەنانـەت چـەند نـاوێکی وەکـو لـویس ماسـینیون یـان گۆسـتاف فـۆن گرینبـاوم یـان جـاك بێـرك نـاتوانن لـە بەرامبــەر نــاوی شــتراوس و فۆکــۆ و فیرنــان برۆدێــل بوەســـتن. کەچـــی ئـــەو ناوانـــە (واتـــە نـــاوی خۆرهەڵاتناســان) لــەلای ئێمــە زۆر بــاو و نــاودارن. هۆیەکەیشـــی دەگەڕێتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی کـــە خۆرهەڵاتناسـان بـە زۆری بـەوە ناسـراون کـە سـەر بـە میتۆدی کلاسیکیی خۆرئاوان, واتە سەر بە میتـۆدی پۆزەتیڤیسـتی مێژووگـەرایی و ئیتنیـی سـێنتەریزم. ئەمانە زۆر بە کـەمی بەرامبـەر بـە نوێکـاریی میتـۆدی کراونەتــەوە, واتــە بەرامبــەر بــەو میتۆدانــەی لــەم دواییــەدا ســەریان هەڵــداوەو گۆڕانکــاریی گــەورەیان بەســـەردا هـــاتووە, واتـــە میتـــۆدی سۆســـیۆلۆجیا و ئــەنترۆپۆلۆجیا کــە لــە ســەرەتای شەســتەکانەوە نەخشەی مەعریفیی خۆرئاوایان بە تەواوی گۆڕیوە. ئێمــە دەزانـــین کرانـــەوەی میتـــۆدی بەنـــدە بـــە هەڵوێستێکی فیکری و دەروونی.

بە واتا: ئایا دەشێت میللەتانی دیکـەی غـەیری ئەوروپی هەمان ئەو شوێنگە مرۆڤایەتییەیان هـەبێت کە میللەتانی ئەوروپی هەیانە؟ ئایا دەشێت زمـان و کولتـووری میللـەتانی غـەیرە ئـەوروپی شایسـتەی هــەمان لێکۆڵینــەوەبن و ئایــا هــەمان ئــەو یاســا و ڕێسـایانەیان بەسـەردا پراکتیـك دەکـرێ کـە بەسـەر زمان و کولتووری میللـەتانی ئەوروپیدا کراوە؟ یان لێـرەدا تەنانـەت لـە ئاسـتی میتـۆد و لێکۆڵینـەوە و زاراوەشــدا جیاوازییــەکی ڕەگــەزی هەیــە؟ لــە ژێــر ڕۆشنایی وەڵامی ئەم پرسیارانەدا هەڵوێستی هـەموو توێـــژەرێك یـــەکلا دەبێتـــەوە: ئایـــا لـــە ڕووی ئیپستیمۆلۆژییەوە سەر بە مۆدێرنیتەی فیکرییە یان نا؟ ئـاخۆ سـەر بـە خۆرهەڵاتناسـیی کلاسیکییە یان خۆرهەڵاتناسیی نوێ؟

## ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی

کەواتە محەمەد ئارکۆن دەیـەوێ ئیسـلامۆلۆژیی پراکتیکـی شـوێنی ئیسـلامۆلۆژیی کلاسـیکی (یـان خۆرهەڵاتناسی) بگرێتـەوە. بەڵام ئایا مەبەسـتی لـەم زاراوەیە چییە؟ ئەگەر لەمـە تێبگـەین ئـەوا لـە گرنگـی ئـەو پـرۆژە گەورەیـە تێدەگـەین کـە ئـارکۆن هـەر لـە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری ئیسلامی خۆی لە قەرەی داوە. پڕۆژەکەی ئارکۆن خواستێکی

گـەورەی هەیـە و تـا دوورتـرین سـنوور دەکشـێ، ئەگەرچی زۆرجار ئەم پرۆژەیە (واتە ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکـی) خـۆی لـە پشـتی دارشـتن و تـەعبیری خاکـــەڕا و وریـــای توێـــژەرێکی ئەکادیمیـــدا دەشـارێتەوەو لـە ڕاسـتیدا بـەرەو ئـەو سـەرەنجامەت دەبات کە خۆی مەبەستێتی بێئـەوەی هەست بکـەیت کە بەربەست و شوراکانت بڕیوەو تابووکانت پێشێل کـردووە یـان لـە ئاسـتی مەعریفیـدا بـازی گـەورەت داوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو توانا پەروەردەییە "پیداگۆجییە" گەورەیـەی ئارکۆن کە دەتوانێ تێزە فیکرییـــە هـــەرە ترسـنـاك و شۆڕشـــگێڕییەکان بـــە کۆمـەڵێ دارشـتنی مەخمـەلی جـوان و نـەرم و هـێمن بەرگپۆش بکات.

لـــە ڕاســـتیدا ئـــارکۆن دەیـــەوێ ئاگـــایی و هۆشیاریی ئیسلامی لە کەش و قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاســـتەوە بگوازێتـــەوە بـــۆ قۆنـــاغی تازەگـــەری (مۆدێرنیتـــە) بێئـــەوەی دوچـــاری شـــۆك و ڕاچـــەنین ببێت. بەڵام ئایا ئەمە مومکینە؟ ئاخۆ ئەم ئاگاییە لە ساتێك لە ساتەکاندا پارچە پارچە نابێت وەك چۆن ئەمە لە ئاگایی مەسیحی لە ئەوروپادا ڕوویدا ئەو کاتـەی لـە سـەدەی هەژدەهەمـەوە بـەر مۆدێرنیتـەی زانسـتی و فیکـری کـەوت؟ بـە مانایـەکی تـر: ئـاخۆ نرخـــی ئـــەو گواســـتنەوەیە نـــادات تـــا لـــە کـــۆت و پێوەندەکانی ڕزگاری بێت؟ ئایا لێرەدا ڕێگایەکی تر هەیە بۆ ڕزگـار بـوون؟ ئەمانـە تـەنها پرسـیارن و لـە پەراوێزی فیکری ئارکۆندا دەیانخەینە ڕوو، دەشێت لەم باسە درێژەدا چەند جارێکی تر بەم پرسیارانە بگەینـەوە. ئـارکۆن لـەو دکتـۆرە دەچـێ دەیـەوێ نەشتەرگەری بۆ نەخۆش بکات بێئـەوەی نەخۆشەکە هەست بە ئازار بکات یان هەست بە کەمترین ئازار بکات، لەبەرئەوە بە وردبینییەوە حیساب بۆ هەموو شتێ دەکات بۆ ئەوەی نەخۆشەکە دووچاری شۆك نـەبێت یـان لەسـاتەوەختی نەشـتەرگەریدا نـەمرێت، ئـــەو دەزانێـــت ئاگـــایی هاوچـــەرخی ئیســـلامی ئاگاییـــەکی نەخۆشـــە و بگـــرە زۆریـــش نەخۆشـــە، ئـەویش دەیـەوێ ڕزگـاری بکـات نـەك بیکوژێـت. کەرەسـتەو ئـامێری ئـەو نەشـتەرگەرییە بریتییـە لـە ئیسـلامۆلۆژیی پراکتیکـی، ئێسـتاش کـاتی ئـەوە هـاتووە تایبەتمەندییـەکانی ئـەم میتـۆدە و زاراوە ئاکتیڤەکانی ڕوون بکەینەوە.

ئـارکۆن لـە دەقـی یەکەمیـدا لـە کتێبـی "چـەند وتارێك لـە بارەی فیکـری ئیسلامی" دەڵێ: "ڕۆجێ باستید کتێبێکی چاپکرد بە نـاوی -ئەنترۆپۆلۆژیای پراکتیکـی- ئێمـەش لـەوێوە زاراوەی ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکـی بـەکاردەهێنین. ئێمـە لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا لەم بیرە بنچینەییەوە دەست پێدەکەین کە: ئیسلام وەکـو هـەموو ئایینـە گـەورەکانی تـر، کـەم و زۆر، ئیلهامی بەسـەرجەمی ئەو "بەهایانە" بەخشیوە کە بناغـەی بونیـادی گشـتیی کۆمـەڵگا ئیسـلامییەکان پێکـدەهێنێ و بـەرگی مەشـروعیەتی بەبـەر ئـەو بەهایانـەدا کـردووە. بەڵام ئەم کۆمەڵگا ئیسلامییانە هـەر لـە سـەدەی نۆزدەهەمـەوە دوچـاری چـەندین لەرزینی گـەورە "یـان بـازدانی گـەورەی پێشـکەوتن" وەك ئـــەو پێشـــکەوتنانەی هـــەر لـــە ســـەدەی شـــانزەهەمەوە لـــە کۆمـــەڵگا خۆرئاواییـــە مەسیحییەکاندا ڕوویدا، لە حاڵەتێکی واشدا هەندێ ئەرکی پراکتیکی بەرهـەم دەهێنـرێ کە مومکین نییـە توێـــژەرە زانســـتییەکان فەرامۆشـــی بکـــەن یـــان چاوپۆشی لێبکەن، هەر ئەم ئەرکە پراکتیکیانەشە کە بەرنامـەی ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی پێکدەهێنێ کـە ئێمـە لـە سەرانسـەری کارەکانمانـدا خسـتوومانەتە ڕوو، ئەمەش لـە بنەڕەتدا لـەم کارە گرنگـەدا قـەتیس دەکرێ: خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی سەرانسـەری کەلەپووری ئیسلامی".

ئارکۆن مەبەستی لەم دوو زاراوەیە "رەخنەگرانە" و "سەرانسەری" چیە؟

مەبەستی لە هەڵوێستی رەخنەگرانە: تەبەنیکردنی هەموو ڕێگەکانی پشکنین و ئەو لێکۆڵینەوە زانستییانەی کە خۆرئاوا بەسەر خۆیدا پراکتیزەی کردوون و تا ئەمڕۆش پراکتیزەیان دەکات لە پێناوی جێهێشتنی قەیرانە تایبەتییەکانی خۆی, بەڵام لەگەڵ تەبەنیکردن و وەرگرتنی ئەو میتۆد و لێکۆڵینەوە زانستییانە دەبێ کەمێك دەستکاری بکرێن و لە هەندێ شوێندا راست بکرێنەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ حاڵەتی ئیسلامدا بگونجێن و قابیلی پراکتیزەکردن بن بەسەر کەلەپووری ئیسلامدا نەك وا دەربکەوێ کە بە زۆر سەپێنراون, ئەمەش وا لە فیکری ئەمڕۆی ئیسلامی – هەروەها فیکری عەرەبیش – دەکات کە پابەندی ئەم پێداویستییەی خوارەوە بێت:

جیاوازیکردن لە نێوان خەباتی ئایدیۆلۆژی – سیاسی لە سەرێك, و زەرورەتی هەرسکردنی دەستکەوتە زانستییەکانی خۆرئاوا لە سەرێکی تر. بەڵام لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا و لە هاوسەنگیی هێزە باوەکاندا پێدەچێ ئەم چەشنە جیاوازیکردنە زەحمەت بێت ئەمە ئەگەر مەحاڵ نەبێت. لێرەدا زەرورەتی ئایدیۆلۆژی زاڵ دەبێت بەسەر زەرورەتی ئیپیستیمۆلۆژیدا, لەبەرئەوە دەڵێم: دەشێت پێداچوونەوەی رەخنەگرانەی کەلەپووری ئیسلامی, بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ, بۆ ئەو توێژەرە موسڵمان و غەیرە موسڵمانە گۆشەگیرانە پاوان بکرێت کە لەو بوارەدا کاردەکەن, مەبەستم ئەو کەس و ئەو توێژەرانەی قایلن بەوەی بەشێوەیەکی گشتگیر باوەڕ بە پرەنسیپەکانی میتۆدی زانستی بهێنن هەروەها باوەڕ بە بیرۆکەی گەڕان بە دوای مانادا و دەرکێشانی ماناکان لە میانی سەرجەم ئەزموونە کولتوورییەکانی مرۆڤ نەك لە میانی تەنها ئەزموونێکەوە, واتە دەبێ ئەزموونی ئیسلام و ئەزموونی ئایینەکانی دیکەی وەکو مەسیحییەت و یەهودیەت و بوزییەت و.. هتد لەگەڵ یەکتر بەراورد بکەین, واتە ئەزموونی هەموو ئایینەکان بخەینە ناو بەراوردکارییەوە بۆ ئەوەی کەمێك عەقڵ و تێگەیشتنی خۆمان فراوان بکەینەوە.

ئەمە محەمەد ئارکۆن لە دەقی یەکەمیدا لە بارەی چەمکی ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکییەوە وتوویەتی, ئەی لە دەقی دووەمیدا چیی وتووە کە بە ناونیشانی "بەرەو ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" نووسیویەتی؟ لێرەدا و لە میانی ژماردنی ئەم خاڵانەی خوارەوەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ئارکۆن هێڵە پان و گشتییەکانی سەرجەم پرۆژە فکرییەکەی خۆی دەکێشێ. ئەو لە کاتێکدا بنەماکانی میتۆدی نوێ دیاریدەکات, دەبینین بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کەموکورتییەکانی میتۆدی کلاسیکی ئاشکرا دەکات:

1–ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی بە مۆرکە عەمەلی و پراکتیکییەکەی جیادەکرێتەوە نەك مۆرکی تیۆری یان ئەبستراکتی لە لێکۆڵینەوەی ئیسلامیدا. ئەمە واتا زانای ئیسلامۆلۆژی لەو مەسەلە گرنگ و گەرمانەوە دەست پێدەکات کە موسڵمانان دەیخەنە بەردەمی خۆیان یان ڕووبەڕووی خۆیانی دەکەنەوەو لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەردەوام دوچاری دەبن. بێگومان تێگەیشتن لە ئێستا بەر لە هەرچی پێویستی بە تێگەیشتنە لە ڕابردوو, واتە تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی بابەتییانەی دەقە ئیسلامییە گەورەکان و بە تایبەتی قورئان. میتۆدی بێلایەن یان میتۆدی بێلایەنگیری (واتە میتۆدێکی سارد و دەرەکی و وەسفگەرایی) کە خۆرهەڵاتناسی کلاسیکی پەیڕەویی دەکات, ناتوانێت لە بارودۆخەکە تێبگات.

ئەگەر بیەوێ تویژینەوە زانستییەكەی بەشێوەیەكی كامڵ جێبەجی بكات دەبێ زیاتر و زیاتر ڕۆبچێتە ناو پرۆسەی مەعریفەوە, واتە لێكۆڵینەوەی وەسفی بەس نییە بەڵكو دەبێ تێراو بكرێ بە لێكۆڵینەوەی تەفكیكی – ڕەخنەیی لە پێناوی دەرهێنانی حوكمە گشتییەكان.

2–زانستە مرۆڤایەتییە نوێیەكان لە خۆرئاوادا, سەر لە بەر و لە ڕەگەوە, مەرجەكانی پرۆسیسەكردنی فیكری زانستیی هەڵگێڕاوەتەوە, ئەمە لە كاتێكدا فیكری ئیسلامی (واتە فیكری عەرەبی و توركی و فارسی و پاكستانی و گشت ئەو فیكرەی بە زمانە ئیسلامییەكانی تر نووسراوەتەوە) بە دەست دواكەوتنێكی گەورەوە دەناڵێنێ و سێ سەدەش تێدەپەڕێنێ (ماوەی جیاوازیی مێژوویی نێوان فیكری ئیسلامی و فیكری ئەوروپی دەگاتە سێ سەد ساڵ, ئێستاكە فیكری ئیسلامی هەست بە ئاسەواری شارستانیەت و ئەو لەرزینە گەورانە دەكات كە لە خۆرئاوا لە سەدەی شانزەهەمەوە دەستیان پێكردووە و ئەو شتەیان بەرهەم هێناوە كە دەشێت ناوی بنێین "بیری نوێ"). فیكری ئیسلامی بە هەموو كۆپییەكی عەرەبی یان فارسی یان توركی یان پاكستانی.. هتد تا ئەمرۆش كەوتۆتە ژێر قورسایی هەژموونی سیستمی بیری سەدەكانی ناوەڕاستەوە, یان بە پێی گوزارشتی میشێل فوكۆ: سیستمی ئیستیمۆلۆژیی سەدە تاریكەكان, یان ئیپستیم *Epistem*, و مەبەستمان لە ئیپستیمی سەدەكانی ناوەڕاست ئەمەی خوارەوەیە:

تێكەڵكردنی ئەوەی ئەفسانەییە – و ئەوەی مێژووییە, نەبوونی قودرەتی جیاكردنەوەی ئەفسانەیی لە مێژوویی, پاشان پۆلێنكردنی دۆگماییانەی بەها ئەخلاقی و ئاینییەكان, ئینجا جەختكردنێكی لاهوتیانەی ئەو گوتەیەی كە دەڵێ كەسی ئیماندار باشترە و لە پێشترە لە كەسی بێئیمان, یان موسڵمان لە ناموسڵمان چاكتر و لە پێشترە, پاشان پیرۆزكردنی زمان و پێداگرتن لەسەر ئەوەی ئەو زمانە لە خوداوەیە و دروستكراوی بەشەر نییە, ئینجا جێگیر بوونی ئەو مانایەی لە ڕێگەی پێغەمبەر و فەرموودەكانیەوە لە خوداوە گەیشتۆتە بەشەر, پاشان باوەڕهێنانێكی ڕەها بەوەی كە ئەو مانایە لە لایەن فوقەهاكانەوە بەشێوەیەكی كامڵ و تەواو ڕاڤە كراوەو ڕوون كراوەتەوەو پارێزراوە و گواستراوەتەوە بۆ وەچەی ئیمانداران بەبێ هیچ ناتەواوی و لابردن و بێئەوەی هیچی لێ ون بێت, پاشان باوەڕهێنان بەبوونی عەقڵێكی نەمر یان عەقڵێكی ئەزەلی و هەتا هەتایی كە هیچ گۆڕانكاری و ئاڵوگۆڕێكی بەسەردا نایەت و هەروەها باوەڕهێنان بەوەی ئەو عەقڵە لە سەرووی مێژووەوەیە یان سنوورەكانی مێژووش جێدەهێڵێ چونكە كانگاكانی خۆی لە گوتەی خوداوە وەردەگرێ. دیسان پێیان وایە ئەم عەقڵە بناغەیەكی ئەنتۆلۆجی وای هەیە بەسەر هەموو مێژووگەراییەكدا بەرز دەبێتەوە (واتە لەگەڵ گۆڕانكاریی زەمەن و سەردەمەكان, ئەو عەقڵە ناگۆڕدرێت و پارێزراوە) ئەمانە ئەو باوەڕە جێگیر و بنچینەییانەن كە هزر و زەینی خەڵكی لە سەدەكانی ناوەڕاستدا داگیر كردووە. بێگومان بەشی هەرە زۆری تایبەتمەندییە گەورەكانی ئەم ئیپستیمەی سەدەكانی ناوەڕاست تا ئەمڕۆش تەنانەت لە فیكری هاوچەرخی مەسیحی لە خۆرئاواشدا بوونی هەیە و چالاكە, ژمارەیەكی زۆری ڕووناكبیرە مەسیحییە خۆرئاواییەكان – هەروەكو ژمارەیەكی گەورەی موسڵمانەكان – تا ئەمرۆش مێژووگەرایی عەقڵ ڕەت دەكەنەوە و باوەڕیان وایە تێكستەكانیان

دووره لــە هەڵــە و ئــەو تێکســـتانە پەیوەنــدییان بە مێژووەوە نییە.

3-بە پێچەوانەی ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکییەوە، ئیســـــلامۆلۆژیی پراکتیکــــی لـــــە تێڕوانینێکـــــی ئــەنترۆپۆلۆژیی فراوانــەوە لــە ئیسـلام دەکۆڵێتــەوە، ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی وایدەبینێ ئیسلام بریتییە لــە یــەکێ لــە دەرکەوتــەکانی دیــاردەی ئــاییینی، دیــاردەی ئــاییینی یــان "دیــاردەی پیرۆزگــەرایی" دیاردەیــەکی ئەنترۆپۆلۆژییــە بــەو مانایــەی هــیچ کۆمەڵگایــەك خــاڵی نییــە لــەو دیاردەیــە، سـا ئــەو کۆمەڵگایــە کۆمەڵگایــەکی ســـەرەتایی بێــت یـــان پێشـکەوتوو، کـۆن بێـت یـان نـوێ. ئـەم تێڕوانینـە تەنانـــەت ســـەبارەت بـــە فیکـــری پێشـــکەوتووی خۆرئاواش تێڕوانینێکی زۆر تازەیە.

لێـــرەوە، ئیســـــلامۆلۆژیی پراکتیکـــی لــــە رەگوڕیشـەوە جیاوازە لـە ئیسـلامۆلۆژیی کلاسـیکی. ئێمـە دەزانـین ئامـانجی ئیسـلامۆلۆژیی کلاسـیکی - واتــە خۆرهەڵاتناســی- بریتییــە لــە: خســتنە رووی کۆمــەڵێ زانیــاریی وەســفی و ورد - واتــە زانیــاریی دەرەکــی و سـارد - لـە بـارەی ئیسـلام بـۆ جەماوەری خۆرئــاوایی کــە هــیچ شــتێ لــە بــارەی ئیســلامەوە نازانێـــت. خۆرهەڵاتناســـی (یـــان ئیســـــلامۆلۆژیی کلاســـــیکی) ناچــــێتە نـــــاو لێکۆڵینەوەیـــــەکی رەخنەگرانــــەی بـــــەراوردکاری تـــــا ئیســــــلامیش بەیەکســــانی بخاتـــــە بـــــەردەم مەســــــیحییەت و یەهودیەتــــەوە. بــــەڵام ئامــــانجی ئیســــلامۆلۆژیی پراکتیکی (واتە میتۆدی محەمەد ئارکۆن) بە تـەواوی جیاوازە، ئارکۆن دەیـەوێ لە میانی دوو تێڕوانینـی کامڵەوە لـە ئیسـلام بکۆڵێتـەوە کـە رەچاوی ئـەم دوو خاڵەی خوارەوە دەکەن:

ا-ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی دەیەوێ بچێتە نـاو ڕووبەڕووبونەوەیـــەکی پـــڕ لــــە ململانێـــوە لەگـــەڵ کەلــەپورێکی درێــژ لــە تەقلیــدی پیرۆزگــەرایی کــە دەیەوێ هەڵوێستی ئیسلام لـە بەرامبـەر ئایینـەکانی تـر جیابکاتـەوە، واتـە هەڵوێسـتی هێرشـکاری کـە لـە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بە میرات ماوەتەوە، دەبێ لە جیــاتی ئەمـــە هەڵوێســـتی بـــەراوردکاری شـــوێنی بگرێتــەوە. ئـارکۆن وایــدەبینێ ئـەم ئەرکـە ئــەوەمان لێــدەخوازێ خۆمــان بخزێنینـــە نــاو گــەورەترین پرۆســەی ڕزگــارکردنی نـاوخۆیی فیکـری ئیسـلامی، ئــەویش لــەو پرەنســـیپە ئیپســـتیمۆلۆژییەوە کـــە گاسـتۆن باشـلار لـە بارەیـەوە دەڵـێ: مـومکین نییـە فیکـری زانسـتی لـە بوارێکـدا سـەربکەوێت تـەنها لـە پاش رووخانـدنی ئـەو زانیارییـە هەڵانەدا نـەبێت کە لەو بوارەدا باڵا دەستن، سا لەبەرئـەوەی ئێمـە لە نـاو بازنەی ئاینێکی دیاریکراودا پـەروەردەبووین پێمـان وا دەبـێ کـە هـەموو ئـەو شـتانەی وەرمـان گرتـوون راست و دروسـتن و هـەر شـتێکی تـری دەرەوەی ئـەو بازنەیــە هەڵــە و لــە ڕێ لادانــە. کەواتــە پێویســتە یەکەمجار لـە خۆمانـەوە و لـە نـاو خۆمانـەوە دەست بکەین بە پرۆسەی ڕزگاری.

ب-ئیســـــلامۆلۆژیی پراکتیکـــی چـــالاکییەکی ئــاکتیڤی زانســـتییەو لەگـــەڵ تێکـــڕای فیکـــری هاوچـەرخدا هاوکـارە، لەبەرئـەوە نموونـەی ئیسـلام وەردەگــرێ و لــە ئیســلام دەکۆڵێتــەوە هــەروەکو لــە ئاینـەکانی دیکـەی وەکو یەهودیـەت و مەسیحیەت و بوزیــەت و هیندۆسـیەتیش دەکۆڵێتــەوە، واتــە لــە تێڕوانینێکـەوە کـە بەشـداری لـە دەوڵەمەنـدکردنی ئــەنترۆپۆلۆژیای ئاینیـــدا بکـــات (ئــەنترۆپۆلۆژیای ئــاییینی واتــە لێکۆڵینــەوە لــە ئاینــەکان لــە میــانی بــەراوردکردنیان و دۆزینــەوەو کەشــفکردنی خاڵــە هاوبەشـــەکانی نێوانیـــان)، ئەمـــە ئـــەو تێڕوانینـــە بەرفراوانەیــە کــە هەلومــەرجی تایبــەتی ئیســـلام تێدەپـــەڕێنێ و دەگاتـــە حاڵـــەتی ئیمانـــداری و

ئایینخوازی بە سیفەتی رەهەندێكی ئەنترۆپۆلۆژی لە رەهەندەكانی مرۆڤ لە هەموو كات و شوێنێكدا (واتە لێكۆڵینـــەوە لـــە دیـــاردەی ئـــایینی یـــان دیـــاردەی پیرۆزگەرایی لە میانی گشت ئاینەكانەوە نەك تەنها لـە میـانی یـەك ئاینـەوە, پیرۆزگـەرایی و پیرۆزكـردن دیاردەیـەكی ئەنترۆپۆلۆژییـە و هـیچ كۆمەڵگایـەكی بەشەری خاڵی نییە لەو دیاردەیە). لەم تێڕوانینـەوە محەمەد ئاركۆن دەستی كردووە بە خوێندنەوەیەكی تری قورئانی پیرۆز و هەندێ لە تێكستە ئیسلامییە كلاسیكییە گەورەكان. بۆچی؟ چونكە ئەو دەیەوێ لە ناو خودی فیكری ئیسلامیدا كۆمەڵێ پرسیاركردنی نوێ بوروژێنێ, ئەو چەشنە پرسیارانەی ماوەیەكی دوورودرێژە سەبارەت بە فیكری مەسیحی پرسیاری زانـراو و ئاشـنان (بێگومـان مەبەسـت لـە فیكـری مەسـیحی خۆرئاوایـە نـەك خۆرهـەڵات) لەبەرئـەوەی فیكـری مەسـیحی لـە خۆرهـەڵات تـا ئێسـتاش لـەم لایەنـەوە پاشـكەوتووە ڕێـك وەكـو فیكـری ئیسـلامی (بڕوانـــە بـــارودۆخی مەســـیحییە عەرەبـــەكان كـــە ئـــەمانیش لـــە هـــەمان هەســـتیاریی ئـــایینخوازیی ســـەدەكانی ناوەڕاســـتدا دەژیـــن بـــە پێچـــەوانەی مەسیحییە ئەوروپییەكان كە لە ناو كەشی مۆدێرنەدا دەژیـن) ئەمـەش مانـای وایـە ئـایین پەیوەسـتە بـە بـارودۆخی كۆمـەڵگا و بـە پلـەی پێشـكەوتن یـان پێشنەكەوتنی كۆمەڵگاوە.

ئـاركۆن دەیـەوێ فیكـری ئیسـلامی لـە چـاو فیكری مەسیحی خۆرئاوایی هەروا بە پاشكەوتوویی نەمێنێتەوە, بۆیە ئاركۆن قورئانی پیرۆز دەخاتە سەر مەحـەكی رەخنـەی مێـژوویی و بەراوردكارییـەوە, پاشان مەحەكی شیكردنەوەی زمانەوانی تەفكیكی و لێوردبوونـەوەی فەلسـەفی كـە تـەركیز دەكاتـە سـەر چـــۆنێتی بەرهـــەمهێنانی مانـــا و مەرجـــەكانی بڵاوبوونەوەو گۆڕانكاری و لەنێوچوونی ئەو مانایە, مانـا هـەتا هـەتایی و ئـەزەلی نییـە, بـەڵكو ئـەویش هەڵدەوەشێتەوەو گۆڕانی بەسەردا دێ و پاشان ئاوا دەبـێ هـەروەكو چـۆن پێـدەگا و شـكڵدەگرێ, مانـا كاتێـك هەڵدەوەشـێتەوە كـە گروهێـك لـە ماوەیـەكی دیـاریكراوی زەمەنیـدا لەسـەری ژیـاون. ئـاركۆن لـە ڕێگەی ئەم ڕۆشنكردنەوە تازەیەوە بۆ قورئانی پیرۆز دەیـەوێ بگاتـە نوێكردنـەوەی فیكـری ئـایینی بـە مانای فراوانی وشەكە, نەك بە تەنها بیری ئایینی لە ئیسـلامدا. ئـەو دەیـەوێ تێگەیشـتنی ئێمـە بـۆ دیـــاردەی ئـــایینی تـــازە بكاتـــەوە بێگومـــان لـــە ڕێگـــەی پراكتیزەكردنـــی میتـــۆدە نوێیـــەكان لەسەر لێكۆڵینەوەی ئیسلام هەروەكو چۆن بیرمەندە ئەوروپییـــەكان ئـــەو میتـــۆدە تازانـــەیان بەســـەر لێكۆڵینـــەوەی مەســـیحیەت و یەهودیەتـــدا پراكتیك كردووە.

## ناكۆكییەكی ئیپستیمۆلۆژیی دیكە لە نێوان ئیسلامۆلۆژیی پراكتیكی و ئیسلامۆلۆژیی كلاسیكی

ئـەم ناكۆكییـە لـە مانـەی خـوارەوەدا خـۆی دەنوێنێ:

—ئیســـــلامۆلۆژیی كلاســـــیكی (یـــــان خۆرهەڵاتناسیی تەقلیدی) بەسیفەتی سیستمێك لە ئیسلام دەكۆڵێتەوە كە بریتی بێت لە كۆمەڵێ بیری تەجریـدی تایبـەت بـە خـۆی وەك بڵێـی ئـەو بیرانـە گەوهەری جێگیر و نەگۆڕن و گۆڕانكارییـان بەسـەردا نایـــەت و بـــە مێـــژوو نالـــوتێنرێن و ملكەچـــی مێژووگـەرایی نـابن, وەك وتمـان ئەمەیـە تێڕوانینـی مێژووی تەقلیدیی بیرەكان و ئەم چەشنە تێڕوانینـە پێـی وایـە فیكرەكـان بـە سـەربەخۆیی لـە دەرەوەی بارودۆخە كۆمەڵایـەتی و هەلومەرجە ماتریالییـەكان هەن وەك ئەوەی لە بۆشاییدا و لـە سەرووی واقیع و لە سەرووی شتەكانەوە بن.

-بەڵام ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی وەك دیاردەیەکی ئایینی ئاڵۆز لە ئیسلام دەکۆڵێتەوە لە پەیوەندیدا بە چەند فاکتەرێکی وەکو سایکۆلۆژی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و..هتد. لەبەرئەوە ئیسلامیاتی پراکتیکی میتۆدی ئەم زانستانە بەکاردەهێنێت:

1-میتۆدی شیکردنەوەی دەروونی.

2-زانستی دەروونی فەردی و جەماعی.

3-زانستی مێژوو (واتە لێکۆڵینەوە لە پەرەسەندنی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان و ئەو گۆڕانکارییانەی بە درێژایی مێژوو بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەدا هاتوون).

4-میتۆدی سۆسیۆلۆجیا (واتە لێکۆڵینەوە لە ئیسلام بە سیفەتی ئەوەی سیستمێکە بۆ کارکردنی مێژوویی یان بۆ پرۆسیسی مێژووگەرایی) وەك سۆسیۆلۆجیستی فەرەنسی ئالان تورین دەڵێ. ئەمەش واتە لێکۆڵینەوە لە کاریگەرییەکانی ئیسلام لەسەر ئەو کۆمەڵگایانەی تیایاندا بڵاوبۆتەوە و هەروەها کاریگەریی ئەو کۆمەڵگایانەش لەسەر ئیسلام. بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئیماندارە تەقلیدییەکان تێیگەیشتوون، ئیسلامیش دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو کۆمەڵگایانەی دەچێتە ناویانەوەو لێرەدا ئیسلامیش شێوەو ڕەنگی ئەو کۆمەڵگایانە وەردەگرێ (بەم مانایە دەشێت قسە لەسەر ئیسلامی ئەندەنوسی و ئیسلامی پاکستانیو ئیسلامی عەرەبی و بگرە ئیسلامی مەغریبی و ئیسلامی مەشریقیش بکرێت... هتد).

بەمجۆرە دەبینین ئیسلام لە میانی گۆشە جیاجیاکانی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکانیشەوە لێی دەکۆڵرێتەوە نەك تەنها لە میانی میتۆدی فیلۆلۆژیی (فیقهی) کە خۆرهەڵاتناسی کلاسیکی تەنها لە ڕێگەی ئەم میتۆدەی دوایی لە ئیسلامی دەکۆڵییەوەو تا ئەمڕۆش لێی دەکۆڵێتەوە. ئەم ڕەوتە تازەیەی لێکۆڵینەوە - کە محەمەد ئارکۆن بە هەموو توانای خۆیەوە بانگەشەی بۆ دەکات - دەیەوێ ئیسلام لە "تایبەتمەندییە ئەزەلیەکەی" دەربهێنێ کە خۆرهەڵاتناسە تەقلیدییەکان تیایدا دیلیان کردبوو تا هیچ بەراوردکارییەك لە نێوان ئیسلام و مەسیحیەتدا ئەنجام نەدرێت و بە بۆچوونی ئەوان ئیسلام لە ڕەگەزێکی ترەو جیاوازە لە "ئاینە ژیارییەکان"ی تر و هەر بەراوردکارییەك لە نێوان ئەم دوو ئاینەدا دەبێتە مایەی کەمکردنەوەی بەهای ئایینی مەسیحی، ئەمە ئەو دیدگا جێگیرە ناوەکیەیە (چونکە دیدگایەکە بە دەگمەن خۆی بە ئاشکرا دەردەخات) کە تەحەکوم بە کارەکانی ژمارەیەکی زۆری خۆرهەڵاتناسە کۆنزەرڤاتیڤەکان دەکات. بەڵام لێرەدا هەندێ خۆرهەڵاتناسی کراوەو ناکۆنزەرڤاتیڤ هەن لە چەشنی ماکسیم ڕۆدنسۆن بە تەواوی لە بەرامبەر بەراوردکاریدا کراوەن.

لە هەموو ئەوانەی باسمان کرد، بۆمان دەردەکەوێ ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی لە ڕووی کرانەوەی مەعریفی یان ئیپستیمۆلۆژی و میتۆدییەوە خواست و ئامانجێکی گەورەتری هەیە وەك لە ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی، هەروەها لەوەش تێدەگەین کە ڕەخنەگرتنی محەمەد ئارکۆن لە خۆرهەڵاتناسی بە تەواوی جیاوازە لەو ڕەخنەیەی ژمارەیەکی گەورەی ڕۆشنبیرانی عەرەب و موسڵمان لە خۆرهەڵاتناسیی دەگرن، ڕاستە ئارکۆن لە خاڵێکدا کۆك و تەبایە لەگەڵیاندا ئەویش "بێزرخکردنی سێنتەریزمی ئیتنی ئەوروپییە" یان ئەوەی بە "عەقڵی هەژمونگەرا" ناوی دەبات، بەڵام ئارکۆن گرفتەکە لە ئاستی ئایدیۆلۆژیدا ناهێڵێتەوە واتە ناچێتە ناو ئاستی ئایدیۆلۆژییەوە - وەك ئەو

رۆشنبیرانە دەیکەن – بەڵکو گرفتەکە دەباتە ناو ئاستی ئیپستیمۆلۆژییەوە، مەسەلەی سێنتەریزمی ئیتنی ئەوروپی بەند بە قۆناغێکی تەواوی مێژووی فیکری ئەوروپییەوە کە بریتییە لە مۆدێرنیتەی کلاسیکی، ئەم قۆناغەش لە سەدەی نۆزدەهەمدا – سەدەی پۆزەتیڤیزم و مێژووگەرایی و میتۆدی فیلۆلۆژی – گەیشتە ئەوپەڕی. ئەم میتۆدە بۆ کات و سەردەمی خۆی پاساوی خۆی هەبووە، لەبەرئەوە بێمانایە ئەمڕۆ و لە پاش بەسەرچوونی، لە دژی ئەم میتۆدە بابەت بوروژێنین و تێکڕای بیریارە ئەوروپییەکان بە مەیلداری سێنتەریزمی ئیتنی ئەوروپی تۆمەتبار بکەین، یان بەرەگەزپەرست تۆمەتباریان بکەین (لەوانە خودی مارکسیش).

لە واقیعدا هەر کولتورێك کە سەردەکەوێ پتر مەیلی ئەوەی دەبێ لە دەوری خودی خۆیدا خول بخوات و خۆی بە چەقی گەردوون بژمێرێ، لەبەرئەوە پێویستە ئەو کلتورە بخەینە شوێنگەی خۆی واتە شوێنگەی ئەو بارودۆخ و هەلومەرجەی تیایدا ژیاوە، دەبێ دەستکەوتەکان و سەلبیاتەکانی بزانین بەرلەوەی بێنرخی بکەین یان رەخنەی لێبگرین، ئیتر پاش ئەوە دەتوانین لەوە بکۆڵینەوە چۆن ئەو کولتورە لەسەر دەستی میتۆدە تازەکانی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان تەجاوز کراوە، سا لە هەر مرۆڤ و لە هەر کۆمەڵگایەکدا بێت، ئەم میتۆدە نوێیانە زۆر فراوانترن لە میتۆدە کلاسیکیە کۆنەکان، چونکە ئەوانەی یەکەم بەرامبەر بە هەموو کولتورەکان و تێکڕای کۆمەڵگا بەشەرییەکان کراوەن بەبێ جیاوازی. دەبێ ئەوەش بزانین محەمەد ئارکۆن لە سەرەتای ژیانی کارکردنی زانستیدا لە ژێر کاریگەریی میتۆدی کلاسیکی خۆرهەڵاتناسیدا بووە (واتە میتۆدی فیلۆلۆژی) بەڵام پاش ئەوەی بە تەواوی لێی تێگەیشت و هەرسی کرد و لایەنە پۆزەتیڤەکانی زانی و ئاگاداری تۆکمەیی لایەنە زانستیەکەی بوو، ئینجا رەخنەی کرد و میتۆدێکی تری داهێنا، لە راستیدا سەرجەمی میتۆدی فیلۆلۆژی نێگەتیڤ نییە – وەك هەندێ کەس لەو باوەڕەدان – بەڵکو ئەمە لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا قۆناغی یەکەم و بنچینەیی پێکدەهێنێ. بۆیە لە سەرەتادا کەمێك لەسەر میتۆدی فیلۆلۆژیی مێژوویی دەوەستین – ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا باوبووە – بەر لەوەی بچینە سەر لێکۆڵینەوەی ئەو میتۆدە تازەیەی محەمەد ئارکۆن تەبەنی دەکات. لێرەوە دەتوانین بارستایی ئەو جیاوازی و ئەو بۆشاییە گەورەیە ببینین کە لە ئاستی ئیپستیمۆلۆژیدا هەردوو میتۆدەکە لە یەکتر جیادەکاتەوە.

## سەرچاوە

لە ئینتەرنێت – سایتی (***google***).

ژمارە (3)ی گۆڤاری (نزوی) ساڵی 1995.

# فەلسەفەو ئایین لە سەردەمە نوێیەکاندا

**سەربەست نەبی**

**لە عەرەبییەوە: ئاوات ئەحمەد**

کەلتوری نوێی کۆمەڵگای ئەوروپایی لە ماوەی نێوانی هەردوو سەدەی پازدەیەم و هەژدەیەمدا رسکاوە و لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتووەتە ترۆپکی کۆتاییەکانی. چونکە بە پێی وەسفەکەی ماکس ڤێبەر، پەرەسەندنی هەمەلایەنە بووەتە هۆی رەواندنەوەی ئەفسون لە دوایین بواری ژیانـدا لە ئەوروپا. چاکەی خوڵقاندنی کەلتورێکی نا ـ ئاینیی، عەقڵانیی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە، ئەمیش لە ئەنجامی لێکهەڵوەشانی پلە پلەو بەردەوامی بۆچوونە ئاینییەکان دەربارەی جیهان.

ئەو قۆناغەی لەگەڵ لۆسەردا دەستپێدەکات و بە گالیلۆ و کیپلەر و نیوتن و بیکۆن و دیکارت و هۆبزو سپینۆزا و رۆسۆ و کانت و .. هتددا تێدەپەڕێت و دەگاتە سەردەمی هیگڵ، گەرچی جۆرە یەکێتی و بەردەوامییەکی پێوەیە، وەلێ لە بەرامبەردا، مێژووی گۆڕانکارییە رەسەنەکان و گۆشەنیگا رادیکاڵەکان و ئەو بیرانەش وێنا دەکات کە پێشتر لەسەر ئاستی پەیوەندی نێوانی ئایین و فەلسەفە دەستیان بۆ نەبرابوو. بە گوزارشتێکی دیاریکراوتر بریتییە لە گۆڕەپانەکانی کێشمەکێشە مەزنەکانی نێوان ئایین و فەلسەفە. مرۆ دەتوانێت لەم رەوتەدا ئەندێشەی چەند بوارێکی مەعریفیی وەها بکات، کە رەوشێکی تایبەت و جیاکراوەیان هەبێت، بەو سیفەتەی دیاریکردنی خودییانەی ئەو پەیوەندییە بێت، کە خۆی لە خۆیدا جەنجاڵە بە لق و پۆپ و پەیوەندیی و پێوەستیی، کە تەریب و بڕەری رەوتی زانستیی و مەعریفیی دیکەی وەکو فیزیا و بیرکاری و سیاسەت و مافە. مێژووی فەلسەفە پێوەستە بە مێژووی زانستەکانی ترەوە، وەك چۆن بەشێوەیەکی تایبەتیش پێوەستە بە مێژووی ئایینەوە. بۆیە ناتوانین خۆمان لە شوێنکەوتنی جوڵەی جێگۆڕکێ و وەرچەرخانە گریمانەکراوەکانی نێوانی ئەو کایانە لابدەین، کە بریتییە لە ساتە بنەڕەتییەکانی بیرکردنەوەی ئەو سەردەمەی مەبەستمانە.

بەمجۆرە، لە تویێی سەردەمە نوێیەکانەوە، پەیوەندیی نێوانی فەلسەفەو ئایین و سەرباقی

زانســـــتەکانی تـــــر, لـــــەو رووەوە گریمانـــــەی لێکۆڵینەوەیەکی جێبەجێکارو, مەعریفیی مێژوویی وەهــا دەکـات کــە دەری بخـات ئـەم مێــژووە چــەند بازنەیــەکی کــەلتوریی دەنوێنێــت کــە هەریەکــەیان تایبەتمــەنێتیی مــەعریفیی تــا رادەیــەك جــێگیری خۆیانیـــان هەیـــە, کـــە پێکهێنـــەری نـــاوەرۆکی رۆشـنبیریی ئـەوروپایین. بـەو مەرجـەی ئـەوە لـە پێشچاو بگرین کە ئەم تەسەورە لەگەڵ ئەو وتەیەدا نـــاکۆك نیـــە کـــە دەڵێـــت جۆرێـــك لـــە یـــەکێتی و بـــەردەوامیی لـــە واقیعـــی مێـــژوویی, کـــەلتوریی هەمەکییـدا, هەیـە. ئـەو بازنـە ئەندێشـە کراوانـەش سـەدای ئـەو پەیوەندییـە ناوەکیانـەن کـە فەلسـەفە لەگـــەڵ ئاییـنـــدا یەکدەخـــەن و لـــەناو گوتـــارێکی پێکهێنـراوی ناسـراودا دایدەڕێـژن. بـە گوزارشـتێکی تـر, پێویسـتە دوو لایـەن لـە پێشچاو بگرین: یەکـەم لایەنی مێژوویی پـەتی ئـەم زنجیرەیـە, بەدوای یەکدا هاتنە, پاشان پەیوەندیی خودی شتەکە, مەبەستمان ئـەو پێوەسـتەیە کـە فەلسـەفە بـە ئـایین و زانسـتە نزیکەکانی تریشیەوە دەبەستێتەوە .

ئـــــەو پەیوەندییـــــە یـــــەکجار ئـــــاڵۆزو بەناویەکداچووە. ئەم رەوشـەش زۆرجار لـە مێژوودا لـە شـێوەی ناکۆکیـدا داڕێـژراوە, چ لـە سـەردەمی یۆناندا بێت یان سەردەمی رۆشنگەریی. لـە هەندێك حاڵـەتی تریشـدا, بـیری فەلسـەفی پاشـکۆو نائـازاد دەرکەوتووە, پێوەست بووە بە شکڵی ئایینەوە. بەڵام بەشــێوەیەکی گشــتی, لــە ســادەترین پێناســەدا, دەتوانین بڵێین فەلسەفە بریتیـە لـە "لێکۆڵینەوەیـەکی ئــازاد لــە ســنوری زانینــی مرۆیــی و ئــەو وتــەزا گشـتییانەدا کـە دەشـێت بەسـەر ئـەزمون و واقیعـدا پیـادە بکـرێن, لـە هـەموو ئـان و سـاتێکدا لـە سـەر بنـەمای دوو چالاکیی پێکـەوە پێوەسـت راوەسـتاوە, وەڵێ دوو چالاکی وەها کە قابیلی جیاکردنـەوەن لـە چالاکییەکانی تری عـەقڵی مرۆیـی, ئـەوانیش بـریتین لـە بـاوەڕی ئـاینیی و ئاکـاریی لـە لایـەك و گـەڕان بەدوای زانینی پۆستیڤییدا لە لایەکی ترەوە. کاتێك باوەڕێکی ئاینیی خۆی دەگرێت و رەگ دادەکوتێت, ئـیتر بـە شـێوەیەکی گشـتی قـابیلی کێبـەرکێکردن نابێـت, ئەوکاتـە چـەند سـنورێکی تەسـك بـۆ لێکۆڵینـەوەی ئـازاد دادەنرێـت کـە بریتیـە لـە فەلسـەفە. هـەرکاتێکیش ناسـەقامگیریی یـاخود ململانـێ لـە بـاوەڕدا هـەبێت, ئـەوا مەسـەلە فەلسـەفییەکان بـە مکومییـەکی تایبەتییـەوە خۆیـان دەخەنـە روو, زیـاتریش قـابیلی لێکۆڵینـەوەی ئازاد دەبن".

راســتە, جیاکـاریی لـە نێـوانی ئـەوەدا کـە نێوەڕاستییەو ئـەوەی نوێیـە کارێکە بـە زەحمـەت لە زەمـان یـان بۆنەیـەکی دیـاریکراودا دابـین دەکرێـت. بـەڵام بەقـەدەر ئـەوەی دەشـێت زەمەنـە نوێیـەکان بـە تازەیی سیماکانی ژیانی کەلتوریی و کۆمەڵایـەتی و سیاسیی و رەخنەگەراییەکەی وەسف بکرێت, ئەوا لـە سـەرەتاکانیدا پێوەسـتی تۆکمـەی هەیـە بـە دەسەڵاتی دابودەستورەکانی کەنیسەی کاسۆلیکیی باڵادەستەوە, لەگەڵ سەرپەرشتیکردنی ژیانی خەڵك, هــەروەها پێوەستیشــە بــە دژایــەتیکردنی بــیری سکۆلاســـتیی بـــاوو رەخنـــەگرتن لـــە مەرجەعییەتەکەیەوە. کارەکە هەموو بە یەك جارو بە تونـدوتۆڵیی یـەکلایی نەکراوەتـەوە, وەك ئـەوەی لـە بۆنەیـەکی دیـاریکراودا, بـە یـەك خـۆ راتەکانـدن, لـە هــەموو میراتــی قــورس و گرانەکــەی ســەدەکانی ناوەڕاســت رزگــاری بووبێــت. هەڵوێســتەکە تــا رادەیــەکی زۆر لەمــە ئــاڵۆزترو ئاڵوسـکاوتر بـووە, بـــارگران و ســـنورکراو بـــووە بـــە توانســـتە مێژووییەکانییەوە, هەتا رادەیەکی زۆریش درامیی و ناڕەحەت بووە.

ئـەو پرسـیارەی دەپرسـێت:"کەی ئاڕاسـتەی تەنگپێهەڵچـنینی تێڕوانینـی سـەدەکانی ناوەڕاست

بەرەو جیهان و توخمەکانی ناوی ، دەستی پێکرد بۆ ئەوەی تێڕوانینی نوێ جێگەی بگرێتەوە..؟" لێرەدا لە داڕشتەی چۆن، بە چ شێوەیەك؟ دەبێت، چونکە ئـەم شـێوازە بەشـی ئـەوە هێـزی هەیـە کـە ئـەم وەرچـەرخانە بخاتـە روو، تێڕوانینـی سـەدەکانی رابردووی خەڵك بەرەو ژیان و ئایین و کەنیسە، چۆن گۆڕاو جیهانبینیان چۆن وەرچەرخا، نەك وەك ئەوەی دۆڵی فرمێسك و ئازارەکان بێت و هیچی تر، بەڵکو پێویسـتە لەسـەر مـرۆڤ لـەم دونیایـەدا، تێکۆشـینی خۆی بە یەك ئاراستەدا ببات کە ئەویش بریتیە لە تامـەزرۆیی بـۆ نـەمریی ــ بەشـێوەیەك کـە لەسـەر "بایەخدانێکی زیاتر بە ژیانی مرۆیی دادەمەزرێت، بەو جۆرەی مرۆڤ دەتوانێت بژی، ئەویش لە سنوری کات و شـوێندا، بـەبێ هـیچ پێوەسـتێکی گـرنگ بـەو دونیـا، یـان ئاخیرەتـەوە" هـەروەها تایبەتمەنـدێتی ئایین بە نیسبەتی سیستمی بۆچوون و چەمکەکان و تـەرزەکانی دیکـەی هوشـیارییەوە، بـە تایبـەتی فەلسەفە، چۆن دیاری کرا؟

زۆرێك لەوەی ئەمڕۆ ئێمە بە میراتێکی دونیایی هاوبەش و حەقیقەتی هەمەکی ـ کلي ـ دایدەنێین، لە سـەرهەڵدانیدا قـەرزاری ئـەو قۆناغەیـە. واقیعـی حاڵەکـەش ئەوەیـە کـە لـە سـەرەتاکانیدا بـە تـەواوی سـەربەخۆ نـەبووە، وەك ئـەوەی ئـەمڕۆ لـە قەڵـەمی دەدەیـن، کـە لەبەردەسـتماندایەو خـاوەنی کۆمـەڵێك حەقیقـەتی چەسـپاوە کـە لانیکـەم بـە شـێوەیەکی تیوریی ـ بە گوزارشتی هیگڵ ـ مرۆڤ خاوەنیانە، کە لـە سـەردەمانی پێشـوودا بـە نهێنیـی ئاسمـانیی لـە قەڵەم دەدران، وەلێ ئێستا بە پێوەری توانایی عەقڵی مرۆیـی و لێهـاتوویی ئامانجـە عەقڵانییـەکانی ئامانجـەکانی لەسـەر زەمینـەی حـازر دەپێـورێن، خەسـڵەتی گواسـتنەوەی ئـەم سـاتە بارگرانـە بـە ئاماژەکـان، کـە تێیـدا هێشـتا مەسـەلەکان ئـاوێزانی یـەکترین، بە یەکدا ئاڵۆسکاون، ئاڵۆزن، ئەوەیە کە

مێـژووی لـەدایکبوونی زەمـانێکی نـوێ ــ مـۆدێرن دەنوسێتەوە، کە بە ترسێکەوە تەماحی ئەوەمان پێی هەیە لەم رەوتەدا گریمانەی بکەین. ئێستا پێویستە شێوازەکانی ئەو بیرکردنەوەو شێوەکانی هۆش و راو بۆچوونە باوەکان و دابونەریتانە بپشکنین، کە کاتی خـۆی بـەهۆی چـەند بەڵگـە نەویسـتێکەوە بـەردەوام بوون، بەڵام گیانی نوێ نیشانەی لێگرتنەوەو کردنی بە بابەتی رەخنەگرتنەکەی خۆی.

دوای سـەدەی سـیانزەیەم کـە سـەدەی زێڕینـی کەنیسـەی مەسـیحیی کاسـۆلیکییە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا، چـونکە ئـەو کاتـە بـەدیهاتنی ژیـاری یـەزدانیی وێنـا دەکـرد کـە دواجـار لـەم جیهانـەدا سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـابوو، وەك ئـەوەی سـانت ئۆگەستین دەربارەی دواوەو وێنەی کێشاوە. لە دوو سـەدەی دواتـردا پرۆسـەی هەڵوەشـانی بـەردەوام و سیس بوونەوەی دەستی پێکرد. بەڵام هەتا کۆتایی سـەدەی پانزەیـەم بـە بـەهێزترین هێـزی کۆمەڵایـەتی لەقەڵـەم دەدرا لـە رێکخسـتنی کۆمەڵایـەتی و ئایدیۆلۆجیـدا، چـونکە لـە ئـەوروپای خـۆراوادا یەکێتییـەکی بـاوەڕیی لـە ئـارادا بـوو " بـە کـردەوە مەسـیحییەتی کاسـۆلیکی ئـاینی هـەموو ئەوروپییـە خۆراواییەکان بوو". بەکورتی ئەو لە خۆیدا ئیدیاڵی کۆمەڵایـەتی و سیاسـیی بـاڵای کـزر دەکـردەوە بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی مەسـیحی سەرانسـەریی، کـە هـەژمونی بەسـەر هـەموو بوارەکـانی ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا هـەبێت و چـالاکییەکانی ئاڕاستە بکات.

لـە "کۆمـەڵگای یـەزدانیی" یـەکی ئاوەهـادا، جیاکاری کۆمەڵایـەتی بـە خۆتـەرخانکردنی زەینیـی دەپێـورا، شـارەزایانی کەنیسـەیی ئـایین لوتکـەی ریزبەنـدیی کۆمەڵایـەتیان داگـیر کردبـوو، بەرپرسـی"زانینی پـیرۆز" بـوون، سەرپەرشـتیاری نهێنییـە یەزدانییـەکان بـوون، لەسـەرووی

هەمووشیانەوە سەرۆکی کەنیسەی کاسۆلیکی پاپا بوو, کە لە رۆما دەژیاو دەوری بەوانە گێرابوو " ئیمپراتۆر بەنیسبەتی میرەکانەوە چۆن بوو, پاپاش بە نیسبەتی پیاوانی ئایینەوە وەها بوو" واتە کاردینالەکان (پلە ئاینییە بالاکان"), ئەوانەی میرو ماقولانی کەنیسە بوون لە بەرامبەری رەشە خەلکی جەماوەری بەشمەینەتی شارەکان و کرێگرتەو خلتەو خۆلی کۆمەلگاو کرێکارە کشتوکالییەکانی گوندەکاندا, ئەوانەی جێگەی گالتەجارِیی و تیزپێکردن و فریودان و قامچی پیاوانی ئایین بوون, بەو حسێبەی مەرِەکانی خوداوەند بن, رەعییەتی بێدەسەلات و نەزان بن, بەردەوام لە لایەنی پیاوانی کەنیسەوە, هەرِەشەی بێبەریکردن و قبوول نەبوونی تۆبەیان لێدەکرا.

ئەندامانی پیرۆکراسیزمی ئاینیی ــ بە پێی وەسفەکەی ماکس ڤێبەر بۆ پیاوانی ئایین ــ بەو سیفەتەی هەلگری ئایدیۆلۆجیای فیۆدالیی بوون, ژمارەیەك سەنتەری ئایدیۆلۆجی و وەزیفەی سکولاستیی کاریگەریان گرتبووە دەست, نەك تەنیا هەر وەزیفە ئاینییەکانیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو, بەلکو وەزیفە سکۆلاستییەکانیش و ژمارەیەکی گالتەپێنەکراوی وەزیفە میدیایی و فەرهەنگییەکانیشیان گرتبووە دەست". هەموو شێوازەکانی میدیایان بەکاردەهێنا بۆ تەوزیفکردنی ئایدیۆلۆجییانەی دابودەستورەکانی کەنیسەو باوەرِەکەی, بۆ ئەوەی لە رووی باوەرِو بیرە کێبەرکێکەرەکانیاندا زیاتر بیچەسپێنن. هەروەها نەریت و سروتە پیرۆزە جیاجیاکانیانی وەکو وەعزو نوشتەو چەکەکانی لێخۆشبوون, ئەنجامدانی قەدداس و نوێژی جەژنەکانیان بەکاردەهێنا بۆ سەپاندنی نمونەیەکی دیاریکراوی رەفتاری ئاکاریی بەسەر باوەرِدارەکاندا, لەگەل پێرِەوێکی دیاریکراوی بیرکردنەوەدا, بە شێوەیەکی گشتیتر بیرکردنەوەیان.

کە ئەوەش لەسەر بنەمای ئاوێتەکردنی تەواوی پێداویستی و داواکارییە دونیاییەکانی کەنیسەی فیودال لەگەل فەرمانە یەزدانییەکاندا, دامەزرابوو. ئەم چینەی پیاوانی ئایین نەك تەنیا قۆرخکردنی ئەزمونە رۆحییەکان و نهێنییەکانی ئاسمانیان بەدیهێنا, بەلکو بە هەمان برِیش خودی ژیانیشیان داگیر کرد, ژیانی زانستی و فیکری و بەشە بنچینەییەکانی چالاکییە زانستییەکان, لەتوێی پسپۆرِیی لە"رۆشنبیرکردنی عەقلەکان و خوێندندا, بۆ ئەوەی خوێندن لە بنەرِەتەکەیدا ببێت بە یەزدانگەریی, سیاسەت و یاساش وەکو سەرباقی زانستەکانی تر, بوون بە لقێك لە لقەکانی یەزدانگەرایی, ئیتر بەپێی پرەنسیپە باوەکانی کتێبی پیرۆز مامەلەیان لەگەلدا کرا. باوەرِەکانی کەنیسە بوون بە بەلگەنەویستی سیاسیی" هەروەها دەقەکانی کتێبی پیرۆز بوون بە بەلگەنەویستی یاسایی.

هەژمونی سەرانسەریی گوتاری یەزدانگەرایی بەسەر هەموو کایە مەعریفییەکان و شکلە فیکرییەکاندا, بریتی بوو لە ئەنجامی واقیعێك کە بریتییە لەوەی کەنیسە بەو سیفەتەی دەزگای دەولەتێکە کە ــ بە وتەی ئالتۆسێر ــ شێوەیەکی لادێییانەو پێکهاتەیەکی تۆتالیتاریانەی هەیە, زانین و خوێندنی تەرخانکردبوو بۆ دەزگاکانی خۆی و هەرِەمێتییە ئاینییەکەی خۆی, یاخود بەو سیفەتەی "بریتیە لە چوارچێوەیەکی کۆمەلایەتی بۆ مەعریفە, وەکو جێگەی سیستمە مەعریفییەکان لە قەلەم دەدرا". لێرەوە مومارەسە تیۆریی و پراکتیکییە باوەکان خەسلەتی شکلە جۆرییەکانی مومارەسە ئایدیۆلۆجییەکانیان وەرگرت. یەکەمیان ملکەچ کرا بۆ وەزیفە کۆمەلایەتی و پراکتیکییەکانی دووەم و لەناو سنورەکانی ئەودا بەدی هات.

هەرچـۆنێك بێــت ئــەم ڕەوشـــە لـــە گوتــاری فەلسەفیی یەزدانگەرای باودا ڕەنگی دایەوە، کە لە سیستمێکی بۆچوون و بیرو باوەڕو ئایدیادا ڕەنگی گرت و لە چەند دەسپێك و ڕاستی بەڵگەنەویستەوە بەنیسبەتی سەردەمەکەوە هەڵی کرد، تا ئەو کاتەی کــە فەرهـــەنگی ســـەردەمی ڕێنیســـانس ڕەخنـــە ســـەرەکییەکەی خـــۆی ئاڕاســـتەی کـــردو شـــێوەو شێوازی نوێی خستە جێگای لەبیرکردنەوەدا.

دەسـپێکی یەکـەم: خـاڵی دەسـپێکردن لێـرەدا بریتـی بـوو لـە "ڕێککـەوتن لەسـەر بـاوەڕێکی بـاو Common Dogma دەشــێت ئــەم بــاوەڕە بـــەپێی پێشـینان و نـەریت و کتێبـی پـیرۆزو نوسـینەکانی باوانی کەنیسە قبووڵ بکرێت. ئۆگەستین ڕێسایەکی ئوسـوڵی دانـا کـە دەڵێـت دەسـەڵاتی کتێبـی پـیرۆز گـەورەترە لـە هـەموو هێزەکـانی عـەقڵی مرۆیـی. لەمەشـەوە ئـەوە دەکەوێتـەوە کـە لـە هـەر شـوێنێکدا ناکۆکییـەك هـەبێت لـە نێـوانی تێبـینی زانسـتیی و تەوراتـدا، ئـەوا پێویسـتە تێبینییەکـە پشـتگوێ بخرێت. دوای کتێبی پیرۆزیش دەسەڵاتی ئەرەستۆ دێت و ئەمەش لە هەموو حاڵەتەکاندا قبووڵ دەکرا، جگە لەو حاڵەتانەی کە بە ڕاشکاوی لەگەڵ باوەڕی مەسیحییەتدا ناکۆك دەبێت، بۆ نمونە، نکوڵیکردن لە خوڵقانی جیهان، پاشان نۆرەی عەقڵی سروشتی دێـت کـە بریتیـە لـە هەسـتی گشـتی و گـەلێك شـتی خراوەتـــە ســـەرو وەکـــو خـــۆی بـــە دروســـتیی حوکمەکانییـــەوە وەردەگیرێـــت، بەتایبـــەتی کاتێـــك ڕاوبۆچوونی پێشینان لایەنگیریی دەکەن".

لێرەوە زیهنییەتی یەزدانگەرا پەنای بردۆتە بەر ملکەچکردنی واقیع بۆ پێداویستییەکانی باوەڕ کە لەسەر دوو تەوەر دامەزراوە: تـەوەری یەکـەم بریتیـە لــە دەقــی ســێنتەریی، بــەو حســێبەی گوتــارێکی گـەردونیی بێـت و بـە سرووش هاتبێت، هەمـەکی و شمولییـەو بـە شـێوەیەکی ڕەهـا ئاڕاسـتەی خـەڵکی هـەموو سـەردەمەکانە. ئـەم دەق ــ سروشـە کـە وەکـو شەریعەتێکی یەزدانیی لە کتێبی پیرۆزدا بەرجەستە بـووە، خـۆی واقیـع دروسـت دەکـات و هۆیـەکانی مانەوەی بۆ دابین دەکات نەك بە پێچەوانەوە. ئەمەش لە تویێی دابڕین و بەهەدەردانی ڕەهەندی مێژوویی و مرۆیـی لـە دەقەکانـەوە بـەدیی هـات، دەقـەکانیش گۆڕان بۆ ئەفسانەی غـەیبانیی نامێژوویی، تـەرزێکی ساردوسـڕ لـە چـەمکەکان کـە بـەپێی گوزارشـتەکەی ئـەبو زەیـد" مانـاو دەلالـەتی جێگیریـان هەیـە". ئـەم زیهنییەتە ئەو ڕەوتە کۆمەڵایـەتی و فەرهەنگییـەی لـە بۆچوونەکانی خـۆی وەلا نـا کـە خـۆی سـەر بەوانـەو بەشداریشـە لـە پێکهێنانیـدا، خـۆی نـەبان کـرد لـەو پەیوەندییـە واقیعییـەی لـە نێـوانی دەق و مێـژوودا هەیـــەو بـــە بـــاوەڕ دەســـتی گـــرت بەســـەریدا، ئـــەم هەڵوێستەشی بە کۆمەڵێك دەسبەسەراگرتن و بەهای ئاکـاریی و حەقیقـەتی بـاوەڕی جێگیر پتـەو کـرد بـۆ پەکخســـتنی هەڵوێســـتە جیاکـــان و ســـنورکردنیان، سـەرەنجامیش بووە هـۆی دەسبەسـەرکردنی عـەقڵ و لێکۆڵینەوەی زانستیی و لەکاری خستن.

تــەوەری دووەم کــە ئــەم عەقیدەیــە لەنگــەری لەسەر گرت بریتیە لە سێنتەریەتی زانینی پیرۆز، کە ئەمیان لە ئاوێتەکردنی تەواوی نێوانی دەقی پیرۆزو دەقــەکانی ئاینزاکانــدا یـــان ئـــەو خوێندنەوانـــەی کەنیسە پێشکەشی دەکردن دوای ئەوەی بە کتێبی پیرۆز دەشۆڕانەوە، وێنا بوو. چونکە یەزدانگەرایی تیـوریی لـە ئاکامیـدا بریتیـە لـە لێکدانـەوەی کتێبـی پـیرۆز بـە کتێبـی پـیرۆز، هـەروەکو سـپینۆزا دەڵێـت. بەمجۆرە وتـەو ئیجتیهـادی بـاوانی کەنیسـە بـوون بـە دەقگەلێك کە قابیلی گفتوگۆکردن یان پێداچوونەوە یـان گومـان لێکـردن نـین. بەمـەش مـافی تێگەیشـتن و ڕاڤەکردن و لێکدانـەوە قـۆرخ کـرا بـۆ ئاینزاکـان بـەو حســـێبەی کـــە نوێنـــەری دەســـەڵاتی کۆتـــایی بـــن، هەروەها سەرچاوەی کاروباری عەقیدە بن، بۆ ئەوەی

لــــە دواجـــاردا ببێتـــە زمانحـــاڵی خوداوەنــــدو سەرپەرشتیاری زانینە پیرۆزەکان.

تەرجەمـەکردنی ئـەم زانینـە پـیرۆزە بەشـێوەی ناتـەبایی بـوو لـەنێوانی خـودی زانینـە دونیاییـە ناپیرۆزەکانـــدا, ئەوانـــەی قـــەرزاری "پســـوڵەی لـــەدایکبوون"ن, بـــەپێی گوزارشـــتی فیۆربـــاخ, لێرەشەوە گوتاری ئاینیی لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆ چەمکی زانین و وەزیفەکەی پێشکەش کرد, کە لەسەر بنەمای گێڕانەوەی زانینی راستەقینە بۆ ئایین ــ سـرووش و یەکخسـتنیان دامـەزرابوو, هـەروەها لەسـەر بنـەمای نکوڵیکردن لـە یاساکانی هۆگـەرێتی پـەرتیی لـە جیهانـدا, ئـەوەش بـە گێڕانـەوەی هـەموو دیاردەو رووداوەکان بۆ یەك دانە هـۆی موفاریق, کە مەبەست و ئامانجی گەردونی هەیە, کە بەپێی ئـەم گوتارە, زەحمەتـە بتوانرێت لـە پاڵی ئـەودا زانسـتی سروشـتیی خـۆی لـە خۆیـدا وەربگیرێـت. . چـونکە زانســتی سروشــتی شــتەکان ناباتــەوە بــۆ ســەر عینایــەتی یــەزدانیی, بەقــەدەر ئــەوەی بــە هۆیــە پەرتییەکانیان ـ الاسباب الجزئية ـ راڤەیان دەکات و لـەتوێی یاسـاکانی خۆیانـەوە ئامـاژە بـە بوونیـان دەکـات, هـەر بۆیـە زانینـی سروشـتیی لـە پێنـاوی خۆیـدا بـە کـوفر لەقەڵـەم دەدرا, چـونکە ماناکـانی بـــوون و مەبەســـتی شـــتەکان لـــە بیرەکـــان دوور دەخاتەوە, لە راستیشدا جیهان لە بۆچوونەکانی ئـەم گوتـارە پـیرۆزەدا "رەمزێکی گـەورە بـوو کە نهێنییـە بنەڕەتییەکەی ماناکەی بوو, نەك هۆو رووداوەکانی". بـەمجۆرە ئـەم تەوەرەیـە دەمانباتـە سـەر پرەنسـیپی دووەم لـــەم گوتـــارەدا, مەبەســـتمان لـــە عەقیـــدەی عینایەتی یەزدانییە, کە دواتر خۆمانی لێدەدەین.

چەمکی شوێنکاتی سێنتەریی بەتەوەری دووەم دادەنرێــت کــە عەقیــدە لەســەری دامــەزراوە. ئــەو شـوێنکاتەی لێرەدا مەبەسـتە بریتیـە لـە شـوێنکاتی پـیرۆز لـە دژایەتیـدا لەگـەڵ شـوێنکاتی فەلسـەفیی ــ زانستی دونیایی. "شوێن, یاخود سەراپای جیهانی دونیایی , بریتیە لە گەردونی بەتەواوی بێبەری لە پـیرۆزی کـە دۆزراوەیـەکی نوێیـەو عـەقڵی مرۆیـی دۆزیویەتـــەوە", ئـــەویش دوای ئـــەوەی بەتـــەواوی سیحری پیرۆزیی لێ دارنی. مرۆڤی ئاینداڕ بەردەوام لەخاڵێکی جێگیری سێنتەرییەوە بەدوای فراوانی و پشێوی زۆری شوێندا گەڕاوە, کە بۆی هەیە لەوێوە بەرەو پشتەوە بڕوات و لەتوێی ئەوەوە بەشێوەیەکی رەمزیی پەیوەندی بکات بە یەزدانەوە. ئەوە وەکو دەرچەیەك, پەنجەرەیەك وابووە, کە لێوەی جیهانی دونیایی جێدەهێڵێت بۆ ئەوەی بگاتە ئاسمان.

لـە سـیفری چـوونە دەرەوەدا خـودا بـە موسـا دەڵێـت: لێـرە نزیـك مەبـەرەوە, پێڵاوەکانـت دابکەنـە چونکە ئەو شوێنەی تۆی تێدایت خاکێکی پیرۆزە (چـوونە دەرەوەو $2:5$) پەیوەنـدی نێـوانی موسـاو خوداکەی ئاواهی گریمانە دەکرێت و بەدەسپێك لە خاڵێك یان چوغزێکەوە دەستپێدەکات کە پێویستە وریـــای پیرۆزییەکـــەی بێـــت, کـــە بریتیـــە لـــە چەقی پیرۆزیی.

وەلێ هەڵوێستەکە مانای قووڵتری تێدایە. رەنگە یەکەمین مانای پێوەست بێت بە منێتی مرۆڤی نغرۆ لەناو سێنتەرە "بەچەقکراو"ە تایبەتییەکەی خۆیدا. لێـرەدا کـە ئاسـتەکان و رەهەنـدەکان و هەرێمـەکان یەکتری دەبڕن و چیتر ناتوانێت بەسەر جیهانەکانی تـــردا بکرێتـــەوە. فیکـــری مەســـیحیی ســـەدەی ناوەڕاستیی ئەمەمان بۆ کەشف دەکات. ئەو مرۆڤەی یـــەزدان لەســـەر شـــێوەو وێنـــەی خـــۆی دروســـتی کـردووە, بـە سـێنتەری هـەموو گـەردون دادەنرێـت, گـــەردونی کۆتـــایی هـــاتوو و جـــوان رێکخـــراو کـــە ئەســـــتێرەو هەســــــارەکان لــــــە خولگەکانیانـــــدا دەسوڕێنەوە, لەبەر خاتری سەرفرازیی ئەو دروست کـراوە, هـەموو شـتێك وەزیفـەی بڕیـاردراوی خـۆی هەیـە, پاشـانیش بۆ ئـەوەی دڵـی بـە مـۆری مـەزنی و

دانایی ئەفرێنەر مۆر بكرێت و پاڵی پێوە بنێت بۆ ئەوەی شكۆداری و مەزنی خوداوەند بنرخێنێت, بەمجۆرە مرۆڤ كاتێك دەبێت بە بابەتی راستەوخۆی ئەفراندنی جیهان و مانا ناڕاستەوخۆكەشی – ویزلی راستی بۆچووبوو كە جەختی دەكرد " بایەخی مرۆڤ بەشێكی جەوهەرییە لە داب و دەستورەكانی پەیمانی دێرین و پەیمانی نوێدا, بەڕاستیش مەبەستی خودا لە ئەفراندنی گەردوندا بەشێوەیەكی سەرەكی پێوەستە بە بونەوەرە مرۆییەكانەوە. ئەگەر مرۆڤ لەناو بونەوەرەكانی تردا, گرنگترینیان نەبوایە, ئەوا عەقیدەكانی بەرجەستەكردن و تەكفیركردن شیاو نەدەبوون".

لە بەرامبەری ئەوەدا, زەمانی سێنتەریی پیرۆز لە هۆشی ئەواندا بەجۆرێك سیما دەگرێت بەوەی داخراوەو دژی زەمانی واقیعی كراوەیە, هەروەها ئینتیمای بۆ خۆشی هەیە. هاوسنور یان هاوسێی زەمەنی دەرەوەی مێژووەو هێشتا زەمەنی دەینونە دەستی پێنەكردووە. دەتوانین بە پێوانە لەگەڵ شوێنی رووتەختدا ئەندێشەی بكەین, بەوەی رەهەندی سێیەمی شوێنە دوو رەهەندییەكەیە. واتە لە سەرەوە بەرەو خوارەوە یان لە خوارەوە بەرەو سەرەوە. ئەم رەهەندەش بە تەوەرەیەتی زەمانی سێنتەر وێنا دەبێت بە نیسبەتی بازنەی زەمانی تەختەوە. بەمەش گواستنەوە لە چوارچێوەی بازنەی شوێنەوە بۆ سێنتەری بازنەكە روو دەدات, چونكە ئێمە ناتوانین خۆمان لە سێنتەری بازنەكە لابدەین بێ ئەوەی بە دەرگای ئاسماندا تێبپەڕین, واتە كەنیسە, یەكسەر بگەینە ئاسمان.

ئەم مانایەی زەمان بونیادێكی سەرفرازبوونی قیامەتی گرتۆتە خۆی. ئەمەش بە نیسبەتی هۆشی مەسیحییەوە شتێكی بنەڕەتییەو باوەڕداری ئامادە ـ ئێستا تێیدا ناژی, بەقەدەر ئەوەی لەلایەكەوە تامەزرۆی زەمەنی یەكەمە, هەروەها لەلایەكی تریشەوە بە پەرۆشەوە چاو دەبڕێتە سەرفرازی. چونكە بەنیسبەتی رۆشنبیریی ئەم سەردەمەوە حەقیقەتی سەرەكی بریتیە لەوەی ئەم زەمەنە بۆ ئامانجی كەوتنەخوارەوەو سەرفرازی ئامادە كراوە, كە باشترین زەمەنی شیاوە. چونكە ئەو چوارچێوەی تراجیدیای خۆبەخشین و قوربانیدانی مەسیح دەنوێنێت, بە نیسبەتی گەڕانەوەی دووەمی چاوەڕوانكراویشیەوە لە كۆتایی خولەكەیدا, دیسانەوە هەروا دەبێت. لەبەر ئەوە ژیانی باوەڕدار لەم جیهانەدا كورت دەبێتەوە بۆ تێكۆشانێكی بەردەوام بۆ رزگاربوون لە میراتی ئەو هەڵەیەی لەگەڵ كەوتنە خوارەوەكەدا پێوەی لكاوە, بۆ ئامانجی بردنەوەی سەرفرازیی چاوەڕوانكراو.

لێرەدا زەمان بەردەوام لەتوێی ئەو دابڕانە پیرۆزانەوە خۆی دەستپێدەكاتەوە ـ خۆی كاوێژ دەكاتەوە ـ كە تێیدا روودەدەن. ئەویش سەردەمی جەژنەكان و سالاّنە خولییەكانی كەنیسەیە, ئەمەش جوڵەی روكەشی گەردوون راڤە دەكات. باوەڕداریش دەتوانێت بەهۆی سروت و قەداسەكانەوە هانای بۆ ببات بۆ هێنانەوە یان دەركەوتنی زەمانی پیرۆزەوە, وەك لە سەرەتادا رووی داوە, چونكە لێرەدا زەمان قابیلی هێنانەوەیەو لە هۆشی ئەودا دووبارەبوونەوە سنوری نیە. ئامادەكارییەكانی كەنیسە بەئەنقەست ئەو بۆنە خولییانەی بەپیت كردووە, ئەویش لە توێی هێنانە ناوەوەی چەندان باوەڕو نەریتی ئاینیی ئەتنیانە, هەروەها لەخۆگرتنی روداوە گرنگەكانی پێوەست بە شەهیدەكان و تەرمی قەدیسەكان, تەنانەت بۆنە وەسەنییەكانی گەلە دێرینەكانیش لەمێژووی پیرۆزی مەسیحییەتدا. ئەمەش مەسەلەیەكە كە توانی خولی زەمەن قورس بكات و ویژدانی باوەڕدار بە ڕەوڕەوەكەیەوە پێوەست بكات و هۆشی ئامادەی ـ ئێستای زیاتر و زیاتر بە خۆیەوە پێوەند بكات. لێرەشەوە یادەوەرییەكەی

بەستراپەوە بە زەمەنەکانی پیرۆزەوە و لەژێر قورسایی بیرۆکەی باوەڕدا دەناڵێنێت و چاوەڕێی مەلەکوتی یەزدانە.

دەسپێکی دووەم لە گوتاری ئاینیی ئەم سەردەمەدا، ئەو پرەنسیپەی کە بەپێی ئەو داواکارییە دووسەرەکەی هەردوو شکڵەکەی پەیوەندییە یەزدانیی بە جیهانەوە لە لایەك و بە مرۆڤەوە لە لایەکی ترەوە، دابین دەبێت، بەردەوامی و راڤەکردنیشی عەقیدەی یەزدانیی بووە. واقیعی حاڵیش ئەوەیە باوانی یەکەمی کەنیسە جوستیان و ئۆریجین و لاکتاس ئەم پرەنسیپەیان لە فیکری وەسەنی و بە تایبەتی فەلسەفەی رەواقییەوە دوای ئەوەی خستیانە ناو سیستمە عەقیدەییەکانیانەوە و بەو ئیعتیبارە سەریان خست.

تێڕامان لە دیمەنی رێکوپێکی مەزنی گەردوون و سازانی بەردەوامی جیهان، ئەوانەی والێکرد گریمانەی بوونی یەزدانێتییەك بکەن کە سەرچاوەی یەکەمی رێکوپێکی شمولییانەی هەموو رووداوەکان و شتەکان و بەردەوامیان لە بووندا. ئەوە هۆی ئەبەدی هەموو شتێکە، هۆی رابردوو و ئێستاو ئایندەیە. بە وتەیەکی کورت بریتیە لە هۆی کۆتایی گەردوون. لەم دەرەنجامەشەوە ئەوە کەوتەوە کە پێویستە جیهان بەرهەمی ئیرادەیەکی باڵا و بەتوانا بێت، باڵاتر لە مرۆڤ، سەلمێنەری چەند مەبەست و مانایەك بێت لە پشتی ئەو شت و رووداوانەوە کە ئەوە ئیرادەیە یان ئەو توانا موفاریقە یەکیان دەخات. بەمەش ملکەچکردن بۆیان دەبێتە مەسەلەیەکی پیرۆز لەگەڵیدا مانای بوونی مرۆڤ لە ژیاندا رێك دەبێتەوە. ئەم جەختکردنەش بریتیە لە وەلامدانەوەی داواکاری عینایەتی پەرتیی، تایبەت بە هەموو تاکێك. ئەمەش لە دوا شیکاردا مکومبوونە لەسەر گوێڕایەڵی سیستمی کۆمەڵایەتی باو، بەو سیفەتەی گوزارشت بێت لە حیکمەتێکی باڵای پیرۆز. ئەم پرەنسیپە بەردەوام بنەمایەك بووە بۆ ئاکاری مەسیحییانە. بەوەی وا لە باوەڕدار بکرێت بتوانێت ئەرکی خۆی لە ژیاندا ئەنجام بدات بەو شێوەیەی خودا هێناویەتە بوون، بەمەش ناچار دەبێت پێوەست بێت بەو پایەیەوە، بەوەی لەگەڵ ئیرادەی باڵایدا دەسازێت.

بەمجۆرە روون دەبێتەوە کە باوەڕی عینایەتی یەزدانیی لەناو ئەم گوتارەو توێیەکانیدا دوو شێوەی وەرگرتووە. شێوەیەکی کۆزمۆلۆجی هەمەکی واتە "عینایەتی یەزدانیی گشتی" یان رێکخرانی شمولیانەی جیهان. هەروەها شێوەیەکی کۆزمۆلۆجی هەندەکییەوە کە پێوەندە بە مەغزای بوونی مرۆڤ لەم جیهانەداو پەیوەندیشی بە باوکی ئەفرێنەرەوە. واتە "عینایەتی یەزدانیی تایبەت، کە بەپێی ئەو خوداوەندەکان شەونخونی دەکێشن بە دیار مەسەلە مرۆییەکان و تەنانەت هەموو تاکەکانیشەوە".

نهێنی عەقیدەی عینایەتی یەزدانیی لە ئاستی یەکەمدا، لەکۆتاییدا جگە لە نەفیکردنی هۆگەرێتی سروشتیی و ئەو یاسا سروشتییەی بەناوی ئەو پەرجووەوە ناسراوە کە لەبنەڕەتدا بیناکەی پێکدەهێنێت، شتێکی تر نیە. پاشانیش جەختکردنی هەموو ئەو شتانەی ژوور سروشتن، بە ناوی ئامانجێتی یەزدانیی باڵاوە، کە بەشێوەیەکی باو لەگەڵ بیرەکانی سازکردنی مەبەستدار و پێشبینی و چارەنوس و کەماڵدا دەبێت. ئەم ئامانجێتییە یەزدانییەش بە دەوری خۆی بە مەسەلەی گوناه لە سەر ئاستەکەی دووەم دەستپێدەکات، ئاستی مەغزای بوونی مرۆڤ، کۆتاییشی بە پێداگرتن لەسەر تاکە ئامانج و دوایین ئامانجی بوونی مرۆیی دێت، واتە سەرفرازی و بەدەستهێنانی نیعمەتی یەزدانیی. ئالان تۆرینیش

بەم مانایە بڕیار دەدات كە" خود لە فەرهەنگی مەسیحیی دورو درێژدا لە توێی لەتوپەتبوونی من لە نێوانی گوناه و هەڵەی یەزدانییەوە دروست بووە".

دوو بیرۆكەكەی دوایی ئەو دوو سنورەیان نواندووە كە هۆشی مەسیحی بەرەو لای خۆیان كێش دەكەن, لە ئەنجامی ئەوانیشدا بەدەستی كرژییەكی ئەنتۆلۆجی بەردەوام, نیگەرانی و لێكترازان, پەككەوتەیی و شڵەژان ناڵاندوویانە, كە لەهەمان كاتدا پێوەستیشە بە مەیلییەوە بۆ تێگەیشتنی مەغزای بوون لەم جیهانەدا, هەروەها تێكۆشانی بۆ تێخوێندنەوەی سازكردنی موفاریق كە دەكەوێتە پشتەوەی ڕەوتەكانی ئەم بوونەوە.

لانیكەم, دوو بەرەنجام لە بیرۆكەی كەوتنەخوارەوەو گوناهەوە كەوتوونەتەوە.

یەكەم: كزركردنەوەی گوتاری ئاینیی دەربارەی بوونی مرۆیی, لە پرۆسەی یەكەمینی ئەفراندندا, بەو وەسفەی سەرچاوەیەكی سەرەكی هەموو نەهامەتییە مرۆییەكان بێت, لە پەككەوتەیی و بەزین و ڕەتاندن, لە توێی خۆگێلكردن لە ڕەهەندەكان پەیوەندییە كۆمەڵایەتییە لێكدراوەكانەوە, لەپاڵ مەرجە واقیعییە ئاڵۆزەكانی ئەم بوونە. لە بریتی ئەمە تەركیزكردنە سەر مەدلولی میتافیزیكی, هۆشی دوورخستۆتەوە لەوەی بایەخ بدات بەسەرچاوە واقیعییەكانی خراپە, هەروەها بە وەرچەرخاندنی مەسەلەكە لە پانتایی كاركردن لەپێناوی بەرژەوەندییە واقیعییەكانی ئێستاوە بۆ بواری خۆ ڕزگاركردن لە خراپەو وەهمەكانی گوناه, لە ناواخنی ڕاستەقینەی خۆی بەتاڵ كردۆتەوە.

دووەم: دەشیا هەموو ئەمانە ببوونایە هۆی پاساودانەوەی ڕەوشەكەی ئێستا, لایەنگیریكردن و بەهانە بۆهێنانەوەی, ئەمەش بە زیادكردنی ئەو ڕەهەندە میتافیزیاییە بۆی, هەروەها بەوەی بیداتە پاڵی تەدبیرێكی یەزدانیی موفاریق, خاوەن توانای هەمەكی. لێرەشەوە جەماوەری باوەڕداران چەشنە سەبوری و قەرەبۆیەكیان لەمەڕ لەتوپەتبوونی گوزەران پێشكەش كرد, لەگەڵ هێوركردنەوەیەكی تایبەتی بەهۆی ئەو پێوەستەوە بە بیرۆكەی سەرفرازییەوە, بە ڕزگاربوونەوە, كە هەڵناتەكێنرێت "چونكە هەموو جیهان نوقمی هەڵەیە و هەموو مرۆڤەكانیش بە سروشتی خۆیان گوناهبارن. ئەم گوناهەش لە هەڵەكەی ئادەمەوە هاتووە, بەڵام هێشتا هیوایەك ماوە بەوەی یەكێك دێت و مرۆڤایەتی ڕزگار دەكات. لێرەوە ئەو بناغەیەمان بۆ دەردەكەوێت كە ئەندێشەكردنی یەزدانی ڕزگاركەر لەسەری دامەزراوە".

بەمشێوەیە, گوتاری ئاینیی سوور بوو لەسەر ئەوەی لەم ژینەدا, مەغزای بوونی باوەڕدار كورت بكاتەوە بۆ یەك تاكە ڕەهەندی پێویست, كە چالاكییەكەی هەر ئەوەندەیە لە میراتیی هەڵە خۆی ڕزگار بكات, هەروەها تامەزرۆی سەرفرازی بێت. وردە وردە, هەموو پێوەستییە مرۆییەكان و ڕەهەندەكانی دیكەی بوونیشی خرانە بەردەمی ئەم پەیوەندییە, كە كراوە بە گرنگترین بەڵگەنەویستی سێنتەریی لەو گوتارەدا. باوەڕداریش هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی خۆی بداتە دەستی نەریتە كەنیسەییەكانی سەرفرازبوون و سرووتە پیرۆزەكان بە دارشتە جیاجیاكانیانەوە, واتە قبوولكردنی نهێنی ئاوەشۆركردنی پیرۆز, یاسای باوەڕ, سازكردنی قەداسی یەزدانیی.. هتد, شتێكی سروشتیش بوو كە دەزگای كەنیسە "بەو سیفەتەی خۆی دەستی گرتووە بەسەر ئاڵوویركردنی سامانەكانی سەرفرازیی" و هۆكارەكانیشێتی, باوەڕدار بەخۆیەوە ببەستێتەوەو زیاتر بیكات بە پاشكۆی خۆی.

كاتێك بە شێوەیەكی تایبەتی, ئەم ئیمتیازەی دواییان لەبەرچاو دەگرین, یەكێك لە پێشبڕكێكانی

ململانێ گەورەکەی جوڵانەوەی ریفۆرمی ئاینیی لە بەرامبەری دەزگای کەنیسە بۆ سەرفرازیی، ئەوەی مارتن لۆسەر پێشەوایەتی کردو، توانی گەورەترین گۆڕانکاری ئاینیی مەزن لە مەسیحییەتی کاسۆلیکی ئەوروپای سەدەی شازدەیەمدا بەرپا بکات.

لە واقیعی حاڵدا، ئەم جوڵانەوەیەی کە کۆتایی بەوە هات یەکێتی دێرینی ئاینیی ئەوروپا تێک بشکێت، تەنیا کاردانەوەیەکی یەزدانگەرییانەی توند نەبوو، بە تایبەتی دژی پایەی کەنیسە. ئەوەی دیارو سەرنجڕاکێشە ئەوەیە " لە واقیعدا سەردەمی ریفۆرم سەردەمێکی زۆر ئایندار نەبووە". زۆرجار ناتوانرێت سیماکانی یان مەیلەکانی ببرێتەوە بۆ سەر باوەڕی ئاینیی یان هەڵسەنگاندنی ئاکاریی. لە بنەڕەتدا پێش هەموو شتێک مەسەلەکە گوزارشت نەبووە لە گەشەکردنی واقیعییانەی هێزە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، لێرەدا بزوتنەوەی ریفۆرم بریتی بوو لە چارەسەری نێوەندیی لە نێوانی جیهانی دێرین و هەڵمەتە کۆمەڵایەتییە نوێیەکاندا.

سەرباری هەموو ئەمەش، ئەو گۆڕانکارییە ئاینیانەی لە بزوتنەوەی ریفۆرمەوە کەوتنەوە، بەهەمان بڕ واقیعییش و جەوهەرییش بوون. ئەگەر لۆسەر رێگایەکی تری بۆ سەرفرازبوون پیشانی خەڵکی نەدایەو لە دەرەوەی دەزگای سەرفرازبوونی کەنیسەش داینەڕشتایە، ئەوا نەیاندەتوانی بەشێوەیەکی مەعریفی و ئاکاریی و تەنانەت سیاسیش خۆیان لە کۆنترۆڵە شمولییەکەی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیاندا دەرباز بکەن، بەوەش ئێستا نەماندەتوانی بە دڵنیایی دەربارەی زۆرێک لەو روداو و واقیعانە بدوێین، کە گرنگ دیارن، بگرە لەدیدی ئێستامانەوە بۆ مێژووی نوێی ئەوروپا، گرنگیشن و ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری و ئەنجامەکانی ریفۆرمی ئاینیی.

ئەوپەڕی پێویستی بۆ سەرفرازی، هەروەها ئومێدی سەرلەنوێ راهێنانەوەی باوەڕدار ـ تاک بۆ ئەوە، بەوە سیفەتەی ئامانجێتی نەک هۆکاری، لە تویێ جەختکردن لە سەر لێوەشاوەیی خودی و رەتکردنەوەی نێوەندی یەزدانییانەی سەرفرازی، لەپشتی کاری ریفۆرمیانەی لۆسەرو تێکۆشانیەوە بوو بۆ سەربەخۆبوونی یەزدانگەراییەکەی خۆی لە مەرجەعیەتی کەنیسەی رۆما. ئەو گەیشتە ئەم قەناعەتە: کەس ناتوانێت لە گوناهەکان خۆش بێت یەزدان خۆی نەبێت، بەخشینی هەڵەکانیش بە پارە یان پسوڵەی لێخۆشبوون بەدەست ناهێنرێت، بگرە تەنانەت بە ئەنجامدانی کاری تریش دەست ناخرێت، بەتەنیا بە باوەڕبوون بە مەسیح دەبێت. لە وانەکانیدا دەربارەی "نامەیەک بۆ عیبرییەکان" دا، دەڵێت:" مەسیح دروستکەری سەرفرازیمانە، چونکە ئەو بیرۆکە و ئایدیایە، هەموو سەرفرازبووەکان لەبەرامبەری ئەودا لێکدەچن. ئەمە ئەو بیرۆکەیەیە کەپێویستە بەهۆی ئیمانەوە خۆمان بخەینە سایەیەوە بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ وێنەی راستەقینە. بەدەسپێک لە شێواندنمانەوە بۆ شکڵێکی هاوشێوەی بیرۆکەی ئەفرێنەری یەزدانی... بەمجۆرە دەگەڕێنرێینەوە بۆ جووتبوونمان لەگەڵ وێنە یەزدانییەکەدا، واتە گەڕانەوە بۆ ئەو دیزاینەی مەسیح وێنەی کێشاوە، لەپێناوی رزگاری هەموو باوەڕدارێکدا".

لۆسەر لەسەر بانگەشەکەی دەڕوات و دەڵێت:" مادام قەشەی کاسۆلیک قۆرتێکە لە نێوانی مرۆڤ و خوداکەیدا، ئەوا ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە خۆمانی لێ رزگار بکەین، با هەر مرۆڤێک قەشەی خۆی بێت. ئەوە چاونەترسییەکە دەگاتە ئاستی بێئەدەبی کە لافی ئەوە لێبدەین خودای باڵاو بەتوانا، زاناو پسپۆڕ قایلە بەوەی دەزگایەکی هیچ و پووچی وەکو کەنیسە دەست بخاتە ناو پەیوەندیی ئەو بە

پەرستەرەکانیەوە، زیاد لەمەش خودا مەبەست و نیازەکانی خۆی بە روونی لە کتێبی پیرۆزا خستۆتە روو.

بەمجۆرە لۆسەر لە رۆژی 31 ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1517 دا بەیانەکەی خۆی لەسەر دەرگای کەنیسەی ویتینبێرگ هەڵواسی، کە نەوەدو پێنج بەندی گرتبووە خۆی دژی پسوڵەکانی بەخشین. هەروەها لۆسەر لە ساڵی 1519 دا لە لیپزیگ نکوڵی کرد لە مەرجەعییەتی پیرۆزی پاپاو کتێبی پیرۆزی بە تاکە مەرجەع دانا لە مومارەسە ئاینییەکاندا، بۆیە پێویستە پاپاش ملکەچ بێت بۆ دەسەڵاتی کتێبی پیرۆز. لە حوزەیرانی 1520 دا لۆسەر بەرائەتی پاپایی پێگەیشت کە پێی دەوترا *Exurge Domini* کە ئینزاری دەکات لە ژێر قورسایی بێبەریکردندا پاشەکشە بکات. لە کانونی یەکەمی هەمان ساڵدا بە ئاشکرا تەحەدای پاپای کردو دژایەتی خۆی دەربڕی لەوەی بە ئاشکرا بیسوتێنن، ئەو بەیانەشی بەسەر کۆمەڵگاکان و هەژمونی ئیکلیرك و قۆرخکردنی کتێب و مومارەسە ئاینییە پیرۆزەکان بڵاوکردەوە، کە لۆسەر کورتی کردبوونەوە بۆ دووخاڵ، شوشتنەوەو نهێنی قوربانی. بەمەش دابڕانی تەواوەتی لەگەڵ رۆمادا روویداو ئەو وەرچەرخانە گەورە ناسراوە دەستی پێکرد کە بەناوی ریفۆرمی ئاینییەوە ناسراوە.

مشتومڕ لەسەر ئەوە لە ئارادا نیە کە هەموو ئەو پرەنسیپانەی لۆسەر مزگێنی پێدان، لە بنەڕەتداو بەشێوەیەکی راستەوخۆ دژی هەمەکیی دەسەڵاتی پیرۆزی کەنیسە و سەرچاوەکانی ئاراستە کرابوو، کە سەروەت و سامانی رەمزی و مادیی ئەوەندە زیادی کردبوو کە لەگەڵیدا پێشکەوتن مەحاڵ بوو. سەرەنجامیش شۆڕشکردن بەسەر ستەمکاریی رەهای سیاسیی و ئاینیی کەنیسەدا بووە هۆی هەڵگێڕانەوەی قووڵی رۆڵ و پایەشی، لە دەزگایەکی هەمەکی رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆحیی باوەڕدارو دیسپلینکردنی، بۆ دەزگایەك ئامانجەکەی بە پلەی یەکەم کورتکرابێتەوە بۆ مزگێنیدان. وای لێهات ملکەچ بێت بۆ دیسپلینەکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتی و ئابوری، بە کورتی ئەنگلز گوتەنی بۆ کەنیسەیەکی هەژار.

گەرچی لۆسەر کە نمونەی یەکەمی ریفۆرمی پرۆتستانتیزمی بەرجەستە دەکرد، بەتەواوی هەڵمەتی دەبرد بۆ رماندنی یەزدانگەرایی کاسۆلیك و بچووککردنەوەی پایەی کۆزمۆپۆڵیتانی کەنیسە، بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی تەواوەتی و گونجاوتر لەگەڵ ریفۆرمی کالڤینییدا ئەنجامدرا. ئەمیان درێژبوونەوەی ئەو کارەیە کە لۆسەر دەستی پێکردبوو، جیاوازیان هەر ئەوەندەیە کە هەریەکەیان لە ئەزمونی ئاینیی ژیانی خۆیەوە دەستی پێکردووەو تیوریزەی کردووە.

لەبەرامبەریشدا پێشەنگانی ریفۆرم ئاماژەیەکی ئەرێیان بە ئەزمونی سەرفرازیی شەخسییەوە گرێدا، بەوەی حەقیقەتی یەزدان و سەرفرازی بکەن بە ئەزمونێکی ویژدانیی گوزەرانیی راستەوخۆی مرۆیی. ئەمەش لە تویێی رزگاربوون لە بیرۆکەی پەرجوو و کەمکردنەوەی بەهای شوێنەوارە پیرۆزەکان "قوربانی لە هەویر زیاتر نیەو شوێنەواری پیرۆزیش لە ئێسك زیاتر نیە". بە هەمان شێوە بە نەفیکردنەوەی رەوشی لە رادەبەدەری کەنیسە بە رەتکردنەوەی دەسەڵاتی نەریت و جەختکردن لەسەر لێهاتوویی خود وەکو مەرجەع، ئەویش لە تویێی ئامادەیی یەزدانییەوە لەناو تاکداو بەرجەستەبوونی باوەڕ و سەرفرازیی لە کردەوەدا. کالڤین پێی وایە "مرۆڤ لەسەر شێوەی یەزدان و نمونەی ئەو دروستکراوە کە ئەمەش مانای ئەوەیە مرۆڤ ئەو خەسڵەتانەی وەرگرتووە کە وای لێدەکەن بتوانێت پەیوەندی لەگەڵ کەسی یەزداندا هەبێت.

ئەو ئافەریدەکراوە بۆ ئەوەی رووبەڕو لەگەڵ یەزداندا بێت... چونکە مرۆڤ لە پێناوی بەشداریکردن لەگەڵ یەزدان و پتەوکردنی یەکێتی راستەقینە و زیندوو لەگەڵیدا ئافەریدە کراوە. لەو یەکێتیەشدا ژیانی بەدەست هێناوە... کەوتنە خوارەوەش دوور لە ژین فرێی دەدات و شێواندنێکی تۆقێنەری بەسەردا دەهێنێت، لەکاتێکدا ئاسودەیی لە یەککگرتنیدایە لەگەڵ یەزداندا..

ئەم جەختکردنە لەسەر سەرفرازی تاکەکەسی و حسێبکردنی بە پەیوەندییەکی ویژدانیی راستەوخۆو ستونیی لەگەڵ خوداوەنددا، ژوانێکی شەخسیی لەنێوانی باوەڕدارو یەزداندا بە هۆی وشە ـ ئینجیلەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لێی کەوتۆتەوە لە خلیسکانی پەیوەندییە ئاسۆییەکە، لە توێی سەنتەرە پیرۆزەکەوە ـ کەنیسە، مانای ئەوەبوو کە تاک لەهەر کوێیەك بێت بۆی هەیە سەرفرازیی بەدەست بهێنێت و ئیرادەی خوداو نازونیعمەتەکەی بەدی بهێنێت، ئەم گۆڕینی سەنتەری قورساییەی ژیانی فیکری و ئاینیی لە کەنیسەوە بۆ ئەزمونی تاك، بۆ ئەستۆی خود، باوەڕێکی قووڵی لێکەوتەوە کە لەوەدا وێنا دەبێت کە ئازادی تاك و توانای بۆ جیاکردنەوە دەسەڵاتی کەنیسەو وەعزەکانیشی دەبەزێنێت، بەمجۆرە تاك خۆی دەکرد بە مەرجەعێك بۆ خودی خۆی، لەبری ئەوەی تریان. ئەوەی پاساوی ئەم باوەڕەی دایەوەو پتەوی کرد، ئەوەیە لۆسەر عەقڵی تاکی مرۆیی سەرپشك کرد بۆ ئەوەی کتێبی پیرۆز لێکبداتەوە، دوای ئەوەی وەرگێڕانی کتێبی پیرۆزی بۆ زمانە نەتەوەییەکان بە کارێکی شەرعیی لەقەڵەمدا، ئیتر بواری ئاوەڵاکرد بۆ لێکدانەوەی شەخسی و ئیجتیهاد کردن. بەمجۆرە هۆشی خود بەرامبەری ئایین کەوتە پێشی هۆشی ئاینیی بەهۆی کەنیسە یان دەزگای کەنیسەییەوە، جیهانی ئاینیی پیرۆز بوو بە واقیعێك ئەو خودە دروستی دەکات کە دەرك بە بابەتەکەی دەکات و مومارەسەی ئەزمونی ئیمان و سەرفرازیی خۆی بە ئازادی دەکات و بەدییان دەهێنێت. سنورەکانی سەرفرازییش جگە لە سنورەکانی باوەڕی ئەو تاکە بە خودو کارەکەی شتێکی تر نیە.

ئەم نارەزاییە بەرامبەری ئیمانی پەتی بە ئیمانی کەسێنراو پیرۆزییەکی ئاینیی بەخشی بە هەموو کارێکی مرۆیی. کالڤینیش یاسادانەرو تیوریستی راستەقینەی ئەم تەرزە رەفتارە ئاینییە بوو، کە سەرکەوتوویی تاکانەی بە ئاماژەیەك دانا بۆ پشتیوانی یەزدان و ملکەچبوونی تاك بۆ ئیرادەی ئەو، بەرجەستەکەری مەبەستەکانیشی بوو بە مانای ئەوەی ئەگەر مرۆڤ ئەرکەکانی ژیانی خۆی ئەنجامدا، بەوپێیەی کە لەگەڵ پایەی کۆمەڵایەتی و پلەیدا دەسازێت، لێرەدا مەدلولێکی ئاینی و ئاکاریی وەردەگرن، ماکس ڤێبەر ئەمە راڤە دەکات و دەڵێت:" ئەنجامدانی ئەرکە زەمانییەکان لە هەموو بۆنەیەکدا، بریتیە لە تاکە شێوازی ژیان، کە خوداوەند رازی دەکات. ئەنجامدانی ئەم ئەرکانە ئیرادەی یەزدانەو بۆیە هەموو پیشە مەشروعەکان لەبەردەمی خوداوەنددا هەمان بەهایان هەیە" پاشان لەسەری دەڕوات"یەکەمین ئەنجامی ریفۆرمی ئاینیی بە پێچەوانەی پەرەسەندنە کاسۆلیکییەکانەوە، لە چەندهێندەکردنەوەی ئەو پاداشتانەدا خۆی حەشاردراوە کە مۆرکێکی ئاینیان هەیە، کە کاری رۆژانەی تەواوکراوی باوەڕدار لە چوارچێوەیەکی وەزیفیدا بۆی دابین دەکات، هەروەها بەوەی بکرێتە مادەیەکی ئاکاریی".

رێکخستنی سەرفرازیی بەمشێوەیە، وەکو کالڤین ئەندێشەی دەکات، نمونەیەکی تایبەتی لە"تەکنیکەکانی مومارەسەکردنی خود" ی بۆ باوەڕدا ئامادە کردووە، ئەمەش تاقە رێگای شیاوی سەرفرازی بووە لەم جیهانەدا. ئەوکاتەش ریفۆرمی

ئاینیی پرۆتستانتی دەست دەکات بە جیاوازبوون لە ئاینی کەنیسەی کاسۆلیکی و بەسەریدا باڵا دەکات.

ئەم مەیلە تاکایەتییە لە پرۆتستانتیزمدا کە لە بنەڕەتدا ئاڕاستەی دژی ڕێکخستنی ژیانی ئاینی و ئاکاریی لەلایەنی کەنیسەوە، پێدراوە، دەبوو ببێتە هۆی ئەوەی ئاکاری سکۆلاستیی بەمیرات ماوە لە یەزدانگەرایی کەنیسەدا دابخرێت و بەسەر خۆیدا بشکێتەوە، کە پێکهاتووە لە یەکخستنی ئاکارو ئایین و ئاوێتەکردنی وردی هەردوکیان. بەمەش ئاکار لەئایین جیادەبێتەوە، مادام سەرفرازیی بووە بە شتێکی ئاینیی، تایبەت و شەخسیی. ئەمەش ڕێی خۆشکرد بۆ دەرکەوتنی نمونەیەکی کۆمەڵایەتی و دونیایی نوێ، ئازاد لە سیستمی ئاکاری یەزدانگەرییانەو سەربەخۆ لێی، زیاتر گونجاو بۆ ژیانی مرۆیی تاك "تەسەورە ئاکارییەکانی سەردەمە نوێیەکان لەسەر پێوەری دانان بە ئازادی خودی تاکەکان داڕێژراون" هەروەها سازانێکی دڵنیاش هەیە لە نێوانی ئەمەو بەرژەوەندییەکانی هێزە کۆمەڵایەتییە گەشەکردووەکان لە ژیانی ئەوروپییدا. ڕەگوریشەی ناکۆکی و لێکپچڕان کە تا ئێستا مرۆڤی کۆمەڵگا نوێیەکان تێیدا دەژی، لە نێوانی چاوبڕینە ئەوەی تاك بە ئامانج دابنرێت نەك بە هۆکار، واتە لە نێوانی نمونەی باڵای ئاکاری و پێداویستییەکانی واقیعی کرداریی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتە مێژووییە.

وەڵێ ئەم هۆشیارییە بە خود و ئاماژە کردن بۆی، تەنیا لە توێی پەیوەندی بەوانیترەوە دێتە دی، بەو سیفەتەی تێپەڕاندنی "من" بێت و هۆشیاربوون بێت بە ئامادەیی ئەویتر. چونکە من لە نا ـ من زیاتر ئامادەیی لە خوددا نیە. مانای ئەم قسەیە لەوەدا کورت دەبێتەوە کە جیهانی ئاینی مەسیحی، لە کاتێکدا جەختی لەسەر ئازادی و ناسنامەی تاك دەکرد لە یەزداندا، ئەوا جیهانی نوێ خۆی کوتاوە بەرەو سەلماندنی ئەو ئازادییە لە کۆمەڵگادا. ئەمەش لەگەڵ ئاڕاستەی پرۆتستانتیدا جووت بوو، کە ملی ناوە بەرەو پشتیوانیکردنی دەمارو کەلتورە هاوبەشەکان و هاتووشە بۆ ئەوەی پشتی ڕەفتارەکەی بگرێت بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگا نەتەوەییەکانی لەسەر پاشماوەی یەکێتی ئاینیی و سیستمی سەدەناوەڕاستیی شمولی کە دەستی کردووە بەداخوران و هەڵوەشان، هەروەها لە بەرەنگاربوونەوەی ڕاشکاوانەی کەنیسەی ڕۆمانیی کۆزمۆپۆڵیتیدا. " یەکێك لە ئەنجامەکانی جوڵانەوەی ڕیفۆرمی ئاینیی ئەوەبوو کە لە ئەوروپادا ئایین بەشێوەیەکی ڕوونتر پێوەست بوو بە سیاسەتەوە، زۆرجاریش لەسەربناغەیەکی نەتەوەیی دادەمەزرێنرا وەك لە ئینگلتەرە. ئاشکرایە کە ڕووی نەدەدا ئەگەر پێڕەوێکی ئاینیی سەرانسەریی بمایەتەوە".

بەشێوەیەکی گشتی بەدەسپێك لەو پێشەکیانەوە، بیرۆکەی دەسەڵات یان توانای شمولی گوێزرایەوە بۆ کۆمەڵگا نەتەوەییەکان و هێزە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان کە پاپای ڕۆما بانگەشەی قۆرخکردنی دەکرد بۆ خۆی. لەتوێی ئەمەشەوە گوێزرایەوە بۆ شانشینە نەتەوەییە ڕوو لەگەشەکان، کە لافی ئەوەیان لێدا کە دەسەڵاتی ئەمانیش بەهەمان بڕ پشتی بە مافی یەزدانی بەستووە. بەمجۆرە "لە سەرەتادا، دەسەڵاتی مافی یەزدانیی پادشاکان سەری هەڵدا، وەکو هەوڵێك بۆ ڕزگارکردنی حکومەتی مەدەنی یان عەلمانی لە سانسۆری پاپاو کاهینەکان، هەروەها وەڵامێکیش بوو بۆ بانگەشەکەی پاپا کە دەیووت مافێکی یەزدانیی هەیە لە کۆنترۆڵکردنی کاروبارە زەمەنییەکاندا... ویکلیفیش ئەم تیورییەی گواستەوە بۆ ئینگلتەرەو داکۆکی لە مافی یەزدانییانەی پادشا کرد تا ئەو مافە لە چنگی کەنیسە دەربهێنێت.

لـــەژێر کاریگـــەریی دۆزینـــەوە مـــەزن و وەرچـەرخانە مێژووییـە تایبەتـەکانی دوو سـەدەی رابردوو، لە سەدەی حەڤدەیەمدا، ژیانی ئەوروپایی دەسـتی کـرد بـە هـەنگاونان بـەرەو ئێسـتای راسـتەوخۆ، بـەرەو بەرژەوەندییـە دونیاییـە واقیعییـەکان، کـە بەهۆیانـەوە جیهـانی سـەر زەوی بەشێوەیەکی تۆکمەتر لە جاران، خۆی کوتا بەرەو سـەلماندنی لێوەشـاوەیی خـودی خـۆی و ئەولەوییـەتی بەسـەر حەقیقەتـەکانی ئاسمانـدا. ئیتر ژیـانی نـوێ لـە تیـوری و راوبۆچـوونی وادا خـۆی خستە روو، کـە تۆمـەتیان دەدایـە پـاڵی ئاسمـان و پەردەی یەزدانگەراییـە پیرۆزەکـەیان دەسمی، لەگەڵ میتافیزیـا خەمۆکــە هاوشـێوەکانیدا. ئـیتر لـەم جێگایـەوە ملـی نـا بـەرەو پێشـبینیکردنی هـاتنی کۆمەڵگایـەکی مرۆیـی جیـا لـە ئـایین، لەسـەر بنـەمای ئـاپۆرای رۆشـنگەراو هەرتەقـەبازو ئاکارناسـەکان دامـەزرابێت، بـێ ئـەوەی ئەمـە هـیچ شـەرمەزارییەکی ئاکـاریی یـان سۆفییانەی تێدابێت بەرامبەری ئاسمان.

هـەتا ئەوکاتـە مـۆدێرنیزمی ئـەوروپایی دوو جوڵانەوەی هاوچەرخی یەك لەدوای یەکی بەخۆیەوە بینیبـوو، رێنیسـانس و ریفـۆرم، کـە لـەتوێی مـەیلی بـەتین و تـاو بـۆ رزگـاری و سـەلماندنی خـودەوە یـەك رەوتیان گرتبووە بەر. گەرچی ئەوە لە سەرەتاکەیدا لەشێوەی رزگارییـەکی رۆحییدا بووبێت بەرامبـەری جیهـانی بابەتـە جیاجیاکـان. وەڵێ ئـەوەی مـاوەی دووەمیـان جیادەکاتـەوەو دیـاری دەکـات بریتیـە لـە هەردوو رەگەزی رەخنەو عەقڵ بۆ پرەنسیپی رەوتی خودو سەربەخۆییەکەی، بەوەی بە سانایی رەخنـەی لـە هـەموو چـەمك و تـەرزەکانی هـۆش و ئـەو دامودەزگایانـەش گـرت کـە خـود کـورت دەکەنـەوەو پەراوێزی دەکەن لەناو چەند مەرج و رەوشێکدا کە دەشێت بە ناعەقڵانی دابنرێن و رێك نەکەوت لەگەڵ بـەهاکانی پێشـکەوتنی عەقڵیـدا، کـە بریتیـە لـە بەهاکانی سەربەستی و ئاسودەیی مرۆڤ.

بەقـەدەر ئـەوەی دەشـێت ئـەم ماوەیـە بـە رەخنەگـەرایی دابنرێـت، هـەروەها بـە گومانخسـتنە بەری حەقیقەتـە باوەکان و ناڕازیبوونی لێیان، ئەوا پێوەستی پتەویشی هـەبوو بەمـەیلی هۆشیاریی بە جیهانی سروشت و زانینی یاساکانی بێ هانابردن بۆ سروش یان دابو دەستورەکانی کتێبی پیرۆز و پەرجوو بۆ تێگەیشتنی و لێکدانەوەی. دەستی کرد بە دامەزراندنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ لە ئیمان بۆ زانینی جیهان، بەمەبەستی رێکخستنی بۆ سوودی مرۆڤ و وەرچەرخاندنی بۆ جیهانێك کە خود بەپێی ویستی خۆی دروستی دەکات، نەك ویستێکی باڵا. جـۆرج لۆکـاش بـەم مانایـە ئاڕاسـتەی بنـەڕەتیی فەلسـەفەمان لـە سـەدەی شـازدەیەمەوە هـەتا نیـوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە، بۆ راڤە دەکات بەوەی: "لە کرۆکـدا جوڵانەوەیـەکی بـەهێزە بـەرەو پێشـەوە بـە ئاڕاسـتەی موڵکایـەتیکردنی چـەمکیانەی هـەموو واقیع و سروشت و هەروەها کۆمەڵگاش".

توانـای تـاك بـۆ دەستڕاگەیشـتن بـە جیهـانی خۆی و خاوەنداریێتیکردنی سیستمی شاراوە تێیدا بەشێوەیەکی چەمکیی ، لەکاتی دامەزرانی زانستی ئـەزمونیی لای فرانسـیس بیکـۆن دەرکـەوت کـە ئـەزمونی کـرد بـە پێوانەیـەك بـۆ دروسـتیی چەمکەکان و پرەنسیپێك بۆ هـەموو یـەقینێك. بیکۆن لە هەموو تاکەکانی ئەو سەردەمە زیاتر نزیك بوو لە دانـانی رەوتێکـی تیـوریی گشـتی بـۆ ئەنجامـەکانی فەلسـەفە سروشتییەکەی گالیلۆ. لـەتوێی ئەوەشـەوە وەرچـەرخانێکی راسـتەقینەی دروسـتکرد لـە چەمکەکانی زانست و زانینی کاتی خۆی، ئەمەش بـەدی نـەدەهات ئەگـەر لـە چـەند سـنورێکی دیـاریکراودا بـەر لـۆجیکی "ماهییەتـە رەهاکـان" نەکەوێت واتە ئەو شکڵانییەتە دێرینەی پرەنسیپە

بنەڕەتییەکەی بریتی بوو لە بەیاساکردنی عەقڵییەتی پەتی و ماقووڵەکان بەبێ گوێدانە دراوەکانی ئەزمونی هەستیی.

لە بەرامبەری ئەم مەیلە ئەرەستۆییە باوەدا, بیکۆن چەند چەمکێکی رەخنەیی دیاریکراوی پێشکەش کرد دەربارەی وەهمەکانی زانین و حەقیقەت, توانی بۆ یەکەمین جار بە وردی بابەت و ئامرازەکانی زانست دیاریی بکات, بە بانگەشەکردن بۆ گەڕانەوە بۆ سروشت و پشتبەستن بە واقیعە هەستییەکانی, تێخوێندنەوەی کرد بە پێڕەو, کتێبەکەشی "ئەرگانۆن"پڕێتی لەو پێڕەوە. وەلێ مەغزای راستەقینەی ئەو رەخنەیە لە لۆجیکی ئەرەستۆیی, لەتوێی ئەو داواکارییەوە روون دەبێتەوە کە دەبێتە هۆی کۆنترۆڵێکی کرداریی بەسەر سروشتدا یان دۆزینەوەی زانستی نوێ" لە لایەنی خودی زانیارەوە. ئەم باوەڕە بە پێویستی هانابردنە بەر جیهانی سروشتیی بابەتیی, زامنێکی تایبەتی لەخۆیدا شاردۆتەوە بە بەهای زانینەکانی خود, کاریگەری و توانستی, کە مافی ئەوەی هەیە جێگەی خۆی بە هۆشی یاساکانی جیهان و تێڕوانینەکەی بگرێت بەو سیفەتەی جیهانێکە بۆ خود.

لەکاتی دامەزرانی فەلسەفەکەی دیکارتدا, پێویست بوو لە توێی بەخشینی مۆرکێکی عەقڵیی بە ئەزمونگەراییەکەی بیکۆنەوە ئەم هەڵوێستە زانستییە رەخنەییە کریستاڵە بکرێت و تەواو بکرێت بەجۆرێك بگاتە چەمکاندنی بیرۆکەی ئەو سیستم و یاسا ساوییەی لەپشتی دیاردەکانی جیهانی مادییەوە هەیە.

دیکارت فەلسەفەکەی خۆی لەمەڕ خود و بوون بە روونی داڕشت, سەرباری ئەو ناکۆکییەی لەو هەڵوێستەو ئەو نەسکەدا هەیە کە بۆی تەرخان کردبوو, ئەوا لە بەرامبەریشدا ساتێکی سەرەکی لە گۆڕانی خودی ئاینیی بۆ خودێکی مرۆیی ژێر دەنوێنێت, کە مژدەی دامەزراندنی دوالیزمێکی نوێ دەدات لەبری دوالیزمە کۆنینە مەسیحییەکە: رۆح ـ جەستە, بۆ دوالیزمێکی فەلسەفیی تا ڕادەیەك توندو تۆڵ: هۆش ـ مادە. بەمجۆرە خود ئەو مافانەی وەرگرتەوە کە موڵکی ئاسمان بوون "ئیتر ژیانی عەقڵیی جووت بوو لەگەڵ ئەو ئەزمونەدا کە مرۆۋ خۆی ئەنجامی دەدات", ئیتر خۆی خستە بەرامبەری جیهانی بابەتیدا نەك بەرامبەری ئاسمان.

بەمجۆرە پێشەکییەکانی رۆشنگەریی عەقڵیمان لە بێشکەدا بینی, وەکو ئەڵتەرناتیڤێك بۆ ئاڕاستە کۆنینەکانی رابردوو, لە پرەنسیپەکانی عەقڵ و سەربەخۆیی هۆشی خودیی لە دەسەڵاتی تەقلیدو سروش دەستی پێکردو باوەڕی بە دەسەڵاتی زانست هەبوو, کە بە ئامرازە تایبەتییەکانی خۆی خودی زانیار رزگار دەکات و لەسەردەستی ئەم دوو مزگێنیدەرەی فەلسەفەی رۆشنگەریی دەستی پێکردووە کە کۆتایی سەدە ناوەڕاستییەکانیان راگەیاندو بە سازاوی و لێهاتوویی رۆڵەکانی خۆیانیان ئاڵوگۆڕ کرد. یەکەمیان لۆجیکی جیهانی دێرینی چەماندەوە. ئەوەی تریشیان گومانی لە بەڵگەنەویستە یەزدانگەرای و عەقیدەییەکانی کردو مەرگی ئایدیۆلۆجیای سەدەناوەڕاستی راگەیاند.

لایەنە میتافیزیاییەکانی دیکارت تووشی داژەیەتی هۆبزی ئینگلیز دەبێت, کە ئەمیان سروشی لە مادییەتە ئەزمونییەکەی بیکۆن وەرگرت بۆ بەڵگەکارییەکانی ـ بە تایبەتی ـ لەسەر تیۆریی بیرەخۆڕسکەکان و ئەو زانینەی لای دیکارت هەبوو کە پەیوەندی بیرو مادەی خستە لاوە لە بەرژەوەندی جیاکردنەوەیاندا لە یەکتری.

هۆبز گەیشتە ئەوەی بە روونی هەردوو کایەی فەلسەفەو ئایین لە یەکتری جیا بکاتەوە, لەسەر بنەمایەکی مەنهەجییش لێکیان جیا بکاتەوە

"چونکە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ئاییەنوە هەیە لەکایەی کتێبی پیرۆزەوە دێن، ئەوەی پەیوەندیی بە فەلسەفەوە هەیە لە کایەی عەقڵی سروشتییەوە دێت"، پێی داگرت لەسەر شمولییەتی یاساکانی عەقڵی سروشتیی و سەبەخۆییان لە سرووش. لەکاتێکدا بابەتەکانی ئایین راستەقینە نین و پێویستییان بە متمانەو یەقین هەیە، بەقەدەر ئەوەی چەند واقیعێکن لە بزریی هۆشی خودەوە بە هۆیەکانی سروشت و نەزانینی یاساکانییەوە هاتوون. سەرەنجامیش هۆبز ئەم ناکۆکییەی نەهێشت بەوەی یەکێك لە لایەنەکانی خستە دواوە، مەبەستمان لە دەسەڵاتی سرووش و کتێب پیرۆزە، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی عەقڵ لە پێشەنگدا بمێنێتەوە.

لە هەنگاوی دووەمدا هۆبز بەشێوەیەکی راستەوخۆ سەلماندی کە: ناتوانرێت زانین لە بابەتی زانراو جیابکرێتەوە. "مادام تەنیا هەر مادە بەشێوەیەکی هەستی دەرکی پێدەکرێت و دەزانرێت"، ئەوا زانینی هەر هەمەکییەکێك یان بونەوەرێکی نامادیی و ناواقیعیی دەبێتە شتێکی مەحاڵ. لەکاتی خۆیدا ئەم قسەیە مانای داپڕانێکی قووڵ بوو لەگەڵ دڵنیایی سەدەناوەڕاستدا، لەوەش گەورەتر بوو کە ئەندێشەی بکرێت. زۆر لەوە نەترسانەتر بوو کە بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو پسوڵەی خۆبەدەستەوەدانەی دیکارت لە ساڵی 1644 دا پێشکەشی کەنیسەی کردو کردی بە پاشکۆی کتێبی پرەنسیپەکانی فەلسەفە.

سەرکێشییەکەی سپینۆزا ــ موسای بیریارە ئازادەکان، بە گوزارشتی فیورباخ ــ یەکەمین ناڕەزاییە لە دوالیزمە هەڵبەستراوەکەی دیکارت تێبپەڕێت کە لە فەلسەفەدا کردبووی، دەگاتە هەڵوێستێکی رۆشنگەرای رادیکاڵی بەپێز، کە لە ناسنامە عەقڵانییەکەیدا گونجاوترو سازترە. ئا لەم هەڵوێستەدا ریشەی نهێنیی هەموو تەسەورێك دەربارەی یەکێتی سروشتیی مرۆڤ خۆی مات کردووە.ئەمەش لەو پێوەستە توندوتۆڵ و سەرسوڕهێنەرەی نێوان فیکرو بووندا لە یەکێتیەکەیاندا کورت دەبێتەوە، بەو سیفەتەی دوو رووی یەك حەقیقەتی بەرچاو بن. چونکە بیرو مادە دوو جەوهەری جیا و سەربەخۆ لە یەکتری نین، هەردوکیان گوزارشت لە یەك حەقیقەت دەکەن، لە دوو سیمای یەك جەوهەر. لە دوا شیکاردا بریتیە لە مرۆڤی هۆشیاری سروشتی "کە رەگی لەم جیهانەدا داکوتاوە، کە جگە لە یاساکانی ئەو ملکەچ نیە بۆ هیچ یاسایەکی تر، کە لە کۆتاییدا یاسای سروشتین" و رزگاری مرۆڤیش بەستراوە بە هۆشیاری بە زەرورەتی ئەو یاسایانە، نەك بە ملکەچبوون بۆ ویستێکی باڵا یان عینایەتێکی ژوورسروشتی.

سەلماندنی دووەمیش کە لەوەی پێشەوە کەوتەوە، هاونیشتمانێکی هۆبز هێناویەتی و داڕشتووە، ئەویش جۆن لۆکی فەیلەسوفە، لە کتێبەکەیدا لێکۆڵینەوەیەك لە تێگەیشتنی مرۆیی، وادیارە لە کاتی پێویستدا و لەسەر پێوانەی فەرەنسییەکان و سەردەمەکەیان هاتووە، بۆ ئەوەی بەتەواوی میتافیزیاکەی دیکارت فڕێ بداتە دەرەوەی هێڵی رۆشنگەرییەوە.

بەنیسبەتی لۆکەوە مەسەلەی سێنتەریی، لەلایەکەوە رزگاربوونە لە هەموو دوالیزمێك و روانینە مرۆڤ لەسەر بناغەی یەکێتییەکی سروشتی. سپینۆزا بەم ئاڕاستەیەدا مەودایەکی زۆری بڕیبوو. لە لایەکی تریشەوە هەڵوەشاندنی ئەفسونی ئەو کۆنترۆڵەی میتافیزیا لەسەر عەقڵ هەیبوو. هەروەها رەتدانەوەی پێناسەکردنی حەقیقەت بە وەسێتە خۆڕسکەکان، ئینجا وەرچەرخاندنی پرەنسیپەکانی عەقڵ بۆ دیاریکردنی گشتی کە لەو پەیوەندییە پێویستانەوە پوختە دەکرێن کە لە سروشتی

شتەکان خۆیانەوە هەڵقولاون. زانینی ئەم پرەنسیپانەو هوشیاریی پێیان بوونە هۆی ئەوەی مرۆڤ کاربکاتە سەر سروشت بێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر سرووش یان دابودەستورەکانی کەنیسە, هەروەها بە شێوەیەکی جودا لە هەر توانایەکی موفاریق.

لۆك هەموو ئەو زانین و بیرانەی خستە لاوە کە پێش تاقیکردنەوەو واقیع دەکەون" عەقڵ هیچ پرەنسیپێکی خۆڕسکی تیا نیە" بەڵکو بەپێچەوانەوە هەموو زانینەکانی مرۆڤ بەدەستهێنراون, ئەمەش مانای ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێت بە پشتبەستن بە توانا سروشتییەکانی خۆی زانین و حەقیقەتەکان بەدەست بهێنێت, بەبێ هیچ زامنێکی بالا بۆ راستیی و دروستییەکەی جگە لە یاسا سروشتییەکان, کە یاساکانی مرۆڤیشن.

بەکارهێنانی چەمکی سروشت بۆی هەبوو ئامارژە بکات بۆ یەکێتی مرۆڤ و جیهان و دوورخستنەوەی دوالیزمی یەزدان ـــ جیهان. مەبەستی کردەیی و راستەوخۆی فەیلەسوفەکانی رۆشنگەریی لە تەوزیفکردنی لەم سیاقەدا, تەنیا لەسەر ئاستی سیاسی و کۆمەلایەتی بەتەواوی روون دەبێتەوە. لۆك ئەم ئاڕاستە سروشتییەی گرتە بەر بۆ لێکدانەوەی سروشتی مرۆیی و گەیشتە ئەوپەڕی سنوری شیاو. روونی کردەوە کە خەڵك لە سەرەتادا, واتە لە حاڵەتی سروشتیی یەکەمدا, بە حوکمی یاسای سروشتی یەکسان و ئازاد بوون, بە واتای ئەوەی ئەوانە بە ئازادی لەدایك دەبوون و ملکەچ نەبوون بۆ ویستی بونەوەرێکی بالا.

رەنگە بە نیسبەتی سەردەمێکەوە کە خەریکی گیانەلا بوو, خراپترین شت لە مەسەلەکەدا, بریتی بووبێت لەو دڵڕەقی و بێبەزەییەی لۆك بەکاری هێنا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بەڵگەنەویستەکانی سەردەمدا, ئەویش کاتێك بەپێی ئەو پرەنسیپ و چەمکانە, تووڕەیی خۆی راگەیاند لە تیۆری مافی یەزدانیی پیرۆز, هەروەها دژی سەرچاوەی یەزدانیی دەسەلات و دەزگای دەوڵەت, بانگەشەی کرد بۆ ئەسڵی پەیمانبەستن لەگەڵیاندا. لێرەدا جارێکی تر سروشی یەزدانیی دەبوژێنینەوە وەکو سەرچاوەیەك بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەت و پرەنسیپی رێکخستنی دەسەلاتەکەی, خودی مرۆیی گشتی خستە جێگەیان. دەوڵەت پێویستە بەلام نەك بە حوکمی زەرورەتێك لە ئاسمانەوە, بەڵکو ئەو زەرورەتە لە پێویستیی مرۆڤ و سروشتەکەی و مەیلی بۆ ململانێ و کۆنترۆڵ و دواجار پەیمانبەستنەوە هاتووە.

فەیلەسوفانی رۆشنگەریی فەرەنسی بە دەسپێك لەو پرەنسیپ و پێشەکییانەی لۆکەوە, زۆربەی بابەت و بیرە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان و چەمکە ئاکاری و فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆیانیان پوختە کرد. دوای ئەوەی دایان رشتن و بەشێوازی فەرەنسییە جوامێرو تا رادەیەك شاعیرییەکەی خۆیان پێشیان خستن.

سەرەتا لێزانانە هەموو وەسێت و نەهییە ئاکاری و سیاسییە بالاکانیان دوورخستەوەو سەرچاوە یەزدانییەکانیان وەلاناو پشتگوێیان خستن. لەبەرامبەری ئەمەشدا پێویست بوو لەسەریان بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە واقیعی و زەمینییەکانیان, بە تایبەتی لە دامودەزگاو بونیادە کۆمەلایەتیەکاندا, کە دەستکردو بەرهەمی مرۆڤن. سەرقاڵی گەڕان بوون بەدوای ریشەی چاکەو خراپە, دادپەروەری و ئازادی, نەك لە قەوارە نامێژوویی ـ تۆقێنەر ـ موفاریقەکاندا, ئەمەش مەسەلەیەکە لەو رەوتەدا ئامارژەی خۆی هەیە ـ بەڵکو تێکۆشان لە رەوشە کۆمەلایەتییەکان و دەزگا مێژووییەکاندا, لە جیای و بەرزونزمی کۆمەلایەتی و رەگوڕیشەیدا لێی بکۆڵنەوە. هەر ئەمەشە کە رۆسۆ لە لێکۆڵینەوەکەیدا

"دەربارەی ریشەی بەرزونزمیی" كردویەتی، كاتێك خۆیداداوە لە لێكۆڵینەوەی ئەسڵ و فەسڵی خراپەو سەرهەڵدانی.

دوای ئەوەی بیرۆكەی یەزدانیان خستە لاوە، پێویست بوو لە سەریان بكەونە گەڕان بەدوای سەرچاوەیەكی راستەقینەدا بۆ خراپە كە زیاتر واقیعی و دونیایی بێت. چونكە بەهیچ جۆرێك ناشێت ئەو خراپەكارییانەی لە ژینگەكەیاندا هەبوون و ئەو نەهامەتییە باوە شتێكی ئەزەلی بن. مرۆڤیش هەر لە سەرەتاوەو بەردەوام هەر ئاوا خراپەكار نەبووە، ناتوانین تەنیا لەبەرئەوەی كەوتووەو هەڵەی كردووە ئیتر بە خراپ لەقەڵەمی بدەین، چونكە ئەم بیرۆكەیەی دوایی خۆی بریتیە لە تاوانباركردنی یەزدان بە بەربەرییەت و ناكۆكیی، وەك وڵتێر گریمانەی كردووە. پاشان ئەم خراپەیە چۆن لەگەڵ سروشت و عەقڵدا دەسازێت. بۆیە چاریان نەبوو جگە لەوەی دان بەوەدا بنێن كە مرۆڤ بەهۆی گەشەكردنیەوە لەناو دابونەریت و یاساو دامودەزگاكانی دەوروپشتیدا خراپ بووە، كە ئەوانیش هەروا دەسكردی مرۆڤن. ئەمە لە كاتێكدا كە خراپە لە جیهانی ئاینی مەسیحیدا بە سروشتی هەڵەكەری مرۆڤ جەختی لەسەر دەكرێت و راڤەش دەكرێت، بەجۆرێك كە خودا دروستی كردووەو هێناویەتە بوون، ئیتر گرفتی خراپە بوو بە گرفتێكی جیاواز، سەرچاوەكەی كۆمەڵگای مرۆڤ و جیهانەكەیەتی. ئێستا ئالان تۆرین حوكم بەسەر ئەو هەڵوێستەدا دەدات و دیاری دەكات و دەڵێت: "ئەگەر ئەم پەنا بردنە بەر سروشت بەشێوەیەكی تایبەتی وەزیفەیەكی رەخنەیی و دژە ئاینی هەبووبێت ، ئەوە چونكە هەوڵ دەدات بناغەیەكی نائایینی و ناسایكۆلۆجی بدات بە چاكەو خراپە، بەڵكو بنەمایەكی كۆمەڵایەتی و هیچی تر. ئەو بیرۆكەیەش كە دەڵێت كۆمەڵگا سەرچاوەی بەهاكانە، چاكە ئەوەیە سوودی كۆمەڵگای تێدایەو خراپەش ئەوەیە زیان بە كاملبوون و كاراییەكەی دەگەیەنێت. ئەم بیرۆكەیە رەگەزێكی جەوهەرییە لە ئایدیۆلۆجیای كلاسیكیی مۆدێرنیزمدا.

لەبەر رۆشنایی ئەوەدا، فەیلەسوفانی رۆشنگەریی گریمانەیان كرد كە قەلاچۆكردنی خراپەو گەندەڵی ئاكاریی و رەوشی ناهاوتای نێوان مرۆڤەكان، مەرجدارە بە روودانی وەرچەرخانێك لە رەوشی مرۆڤدا، لە تویێی پەروەردەی دروست و چەسپاندنی رۆشنگەرییەوە. ئەمەش گرنگترین و دیارترین دەسكەوتی فەلسەفییە كە فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەیەم دایانڕشتووە. پەیوەندیی نێوان تاك و ئاسمان و نوێنەرانی و رەمزەكانی لە لایەكەوە بە زەوی و رەوتەكانی و رەوشەكانییەوە لە لایەكی ترەوە، بەپێی ئەمە دیاری كرا. بەمەش توانرا سیستمی ئاكاری و سیاسیی كۆمەڵایەتی خرایە بەر پرسیار.

بە راستی پێویستە دان بەوەدا بنێین كە ساڵی 1789 دەكەوێتە سەر دووڕیانی كاتە نوێیەكان، رەنگە لێرەدا بەڵگەیەكمان دەستبكەوێت كە پێوەستی تۆكمەو پتەوی نێوان پێشكەوتنی فیكریی تیوریی و مومارەسەی مێژوویی روون بكاتەوە. ئەگەر "سەدەی حەڤدەیەم سەدەی كۆنترۆڵی فەرەنسی بێت لە بیركردنەوە"ی تیوریدا، ئەوا سەدەی هەژدە سەدەی كۆنترۆڵی فەرەنسییە لەسەر ئاستی مومارەسەی مێژوویی، بەقەدەر ئەوەی سەدەی دژایەتیكردنی ئیكلیریك و دەزگای كەنیسەشە، سەدەی پاكسازیی تەواوی ئەو سیحرەیە كە ئاینی مەسیحی لەسەر جیهان مومارەسەی دەكرد چ كاسۆلیك یان پرۆتستانت. چونكە تا ئەو كاتە جیهان و مێژووی مرۆڤایەتی هێشتا هەر لەژێر قورسایی ئەو ستەمكارییەدا دەینالاند كە لەو مارەكردنە پیرۆزەوە كەوتبووەوە كە

لەنێوانی دەوڵەت و ئاینـدا هەبوو. ئیتر لەوێوە مرۆڤەکان دەستیان کرد بە داڕنینی نیری یەزدانیی لەم مێژووە "ئیتر لەپاڵ کوشتنی باوکی ستەمکاردا... کوشتنی خوداشیان زیاد کرد بەپشتبەستن بە بەڵگەو سەلماندنەکان"، دوای ئەو مێژووە چیتر پادشاکان ئەوەیان بۆ نەمایەوە مافی یەزدانیی بکەن بە بەهانە، تەنانەت شا لویسیش ئیتر ژمارەکەی هەرچەند بێت، مافی ئەوەی نەما بڵێت: من پادشام، من دەوڵەتم.

رەعییەت کە چیتر نەزان و ناتوانا نەبوو ــ بە گوزارشتی بابۆڤ ــ دەستی گرت بەسەر باستێلداو بەپێی ئەوە توانی پادشا ـ یەزدان تاوانبار بکات، کە تا ئەو کاتە لە سەرووی مێژوو و شتەکانییەوە بوو. ئیتر ئێستا بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی دەمرد. لە راستیدا فەیلەسوفەکان یەکەمین کەسن دەسپێشکەری کوشتنیان کرد. بەم مانایەش کالانال ستاییشی رۆسۆ دەکات و دەڵێت:"ئەو شۆڕشەی بە مانایەك لە ماناكان پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ راڤە کردین".

ئەو شۆڕشەی بە شەقاوی گەورە بەرەو تیغی مەقسەڵە تاوی دەدا، پێشتر لەسەر ئاستی فەلسەفە ئەرکەکانی خۆی بەجێگەیاندبوو، بەوەی خوداو بەخشینە پیرۆزەکانی لەناوبرد، بەوەی یەزدانگەرایی و میتافیزیای چەماندەوەو خەرمانەی تەرخانکردنی یەزدانیی لەناو برد کە کەنیسە دەورەی دامەزراوە دەرەبەگایەتییەکانی پێدابوو"، پادشای چەکدار بەمافی یەزدانیی هیچ بیانوویەکی بۆ نەمایەوە، ئەوە نەبێت کە بووە بە نامۆیەك و دەکەوێتە دەرەوەی پەیمانەکەوە، بە گوزارشتێکی تر، لە رووی بەرژەوەندییەکانی مێژوو و ئایینی مەقسەڵەوە سوودی نەما. لێرەوە وتەکەی بریسۆی جیرۆندیی راست بوو کە وتی: فەلسەفە چەسپاوترین کۆتەڵە لە شۆڕشەکەماندا.

رۆسۆ 1712 ــ 1778 بە پێشەوای سەردەمی رۆشنگەریی دادەنرێت، ئەو یەکەمین کەسە کە مژدەی پرەنسیپەکانی عەقیدەی عەلمانی (دونیاگەرایی) نوێی دا، گرفتی دەسەڵات و ماف و وەسێتە یەزدانییەکانی کرد بە بابەتێکی کێشەدار، یەکەمین کەسە کە داکۆکی لە هەردوو پرەنسیپی ماق و پەیمان کردبێت، کە پێویستە هەموان لەجیاتی ئەو وەسێتانە دانی پێدا بنێن، چونکە ئەوان گوزارشت لە ویستی گشتی و عەقڵ دەکەن. "هەتا دەرچوونی پەیمانەکە ـ بە گوزارشتی کامۆ ـ خودا ئەو پادشایانەی دروست دەکرد کە ئەوانیش گەلانیان دروست دەکرد، لە پەیمانی کۆمەڵایەتی بەدواوە، ئیتر گەلەکان خۆیان خۆیان دروست دەکەن پێش ئەوەی پادشاکان دروست بکەن. بەڵام یەزدان کە لە کەسی پادشای نوێنەریدا کوژرا، چیتر بابەتی لێکۆڵینەوە نیە ..کامۆ لەسەری دەڕوات: چیتر دەسەڵات ـ ئەوە نەما کە هەیە ـ بەو سیفەتەی سێبەری خودا بێت لەسەر زەوی، بەڵکو پێویستە ببێت، خۆشبەختانەش لە بڕوای رۆسۆدا، ئەوەی هەیە ناتوانێت جیا ببێتەوە لەوەی کە پێویستە ببێت".

وەك دەزانین، رۆسۆ تاکە بیریار نەبووە لەو سەردەمەدا کە بەشداری کردبێت لە هەڵمەتی پاکسازی سەرانسەریی دژی چەمك و عەقیدەکانی ئاینی سەدەناوەڕاستی مەسیحیی و یەزدانگەراییەکەی و بەرەو رووی دامودەزگا سیاسییە باوەکان بووەوە. ئەو لە هەڵوێستەکەی خۆیدا پەیوەندی بە چەند بیریارێکەوە هەیە لە وێنەی ڤۆڵتێرو دیدرۆو هیلفیسیۆس. کە لەناو ئەو شتانەدا کە دەیانویست، قڵپکردنەوەی مافی یەزدانیی بوو، بانگەشەیان دەکرد بۆ دوورخستنەوەی ئایین و جیاکردنەوەی لە سیاسەت. هەروەها گوێزانەوەی بیرۆکەی ماف بۆ مەیدانی

فەلسەفەو سیاسەت, لەبری كایەی یەزدانگەرایی. هەموان " بەچاوێكی مرۆییانە دەیانڕوانیە دەوڵەت, یاسا سروشتیەكانیشیان لە عەقڵ و ئەزمونەوە هەڵدەهێنجا نەك لە یەزدانگەراییەوە". بە گوزارشتی ماركس.

بەشێوەیەكی گشتی, لە مرۆڤەوە دەستیان پێكرد لە حاڵەتە سروشتییەكەی یەكەمیدا, كە دەسەڵاتی دەوڵەت و یاساكان و نەریتە ئاكارییەكانیان نەدەزانی. ئەو جیاوازی و بەرز و نزمییەش كە روویانداوە, بەهۆی دووركەوتنەوەی مرۆڤەوەیە لەو حاڵەتە سروشتییە, كە هەموو مرۆڤی یەكدەخست. " ئەوانە رۆڵێكی بنەڕەتییان دایە پاڵی باوەڕە ئاینییە دژ بە عەقڵ و سروشتی مرۆییەكان, لە چەسپاندنی ستەمكاریدا.. لە تێڕوانینی ئەواندا تیۆری رەسەنی یەزدانیی لە تێڕوانینی ئەودا نمونەیەكە لە نمونەكانی چەسپاندنی كەنیسەی دامەزرێنەری دەوڵەت" خورافەیەكی سیاسییە ئامانجەكەی بریتیە لە پتەوكردنی دەسەڵاتی ستەمكاریی رەها, لە تویێی جەختكردنەوە كە ئەمەی دواییان دەسەڵاتی یەزدان دەنوێنێت لەسەر زەوی.

بەڕاستیش ئەوانە توانیان ـ هەتا كاتی خۆیان ـ یەزدانێتی گەل ـ ئیرادەی گشتی بە خوێنی پادشا ـ مەسیح بشۆنەوە كە لەگەڵ سروشت و عەقڵدا جووت دەبێت. بەڵام راگەیاندنی یەزدانێتی مرۆڤی تاك, ئەوا كاری فەیلەسوفە رەخنەییەكانی ئەڵمان دەبێت, لە فیورباخەوە تا دەگاتە نیچە, كە پێویست دەبێت لە سەری بە ئازارو ژانێكی زۆرەوە مەرگی یەزدان "ئیرادەی گشتی" لەگەڵ هاتنی لافاودا رابگەیەنێت و دانی پێدا بنێت.

# ڕێنیسانس

د. موسا ئیبراهیم
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## مەبەست لە سەردەمی ڕێنیسانس چییە؟

ڕێنیسانس (*La Renaissance*) بە بزوتنەوەی ژیانەوەو سەرلەنوێ زیندوبوونەوە دەوترێت واتە مەبەست لە ڕێنیسانس ئەو ڕۆحە ڕەخنەییەیە کە لە بواری فەلسەفە و ئەدەب و تەواوی زانین و هونەری کلاسیکیدا سەریهەڵدا و مەبەستیش لێی گەڕان و پشکنین و پشتبەخۆبەستن و گرنگیدان بوو بە کاروباری دنیایی، ئەویش بە مەبەستی نوێکردنەوەو گۆڕانکاری و ئەفراندنی زیاتر و زۆرتر.

بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین کە ئەم بەریانە هەموو شتێکی نەگۆڕی، بەڵکو زۆر ڕێڕەوی کۆن وەکی خۆیان مانەوەو هەندێکی دیکەشیان گۆڕانکاری و نوێبونەوەیەکی کەمیان بەخۆوە بینی.. لە رووی مێژووییەوە دەکرێت نیوەی یەکەمی سەدەی چواردەهەم بە سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانس دابنرێت و تا کۆتایی سەدەی شازدەهەمیش دەخایەنێت. لەم سەردەمەدا و بەشێوەیەکی تایبەت وڵاتی ئیتاڵیا سەرمەشقی بزوتنەوەی ڕێنیسانس بوو لە ئەوروپادا.

ئەڵبەتە هۆکارگەلێك لە ئارادا بوون کە ڕێگایان لەبەردەم هاتنە ئارای ئەم بزوتنەوەیەدا خۆشکرد، لەوانە: شەڕە خێڵەکیەکان و زیادبوونی پەیوەندی نێوان ئەوروپا و خۆرهەڵات و گەشەکردنی ئەدەب بە زمانی نەتەوە، بۆ نمونە لە ئیتالیا ئەدیب و بیریارێکی وەکی "دانتێ" پەیدا بوو کە بە زمانی ئیتاڵی دەینوسی و ئەو زمانەی کردبووە ئامرازی بڵاوکردنەوەی ئەدەب و بیرو بۆچونەکانی. لەو هۆکارانەی دیکەش کە بواریان لەبەردەم ڕێنیسانسدا ڕەخسان: هاندانی بزاوتی کۆکردنەوەی دەستنوسەکان و لەبەرگرتنەوەیان و پێداچونەوەیان و تەفسیرکردن و تاوتوێکردنیان. هەروەها دۆزینەوەی ئامێری چاپ لە کۆتایی سەدەی پازدەهەمدا ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ تەشەنەکردنی

بزاوتی هیومانیزم. هاوكات لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمدا ژمارەیەكی زۆری بیریاران لە خۆرهەڵاتەوە هەڵاتن بۆ خۆرئاوا و ئەمەش بووە مایەی دەوڵەمەندبوونی فیكری خۆرئاوا بەشێوەیەكی گشتی. ئەمە و سەرەڕای بوونی هۆكارگەلێكی تر كە پەیوەندیان بە خودی ئیتاڵیا خۆیەوە هەبوو, لەوانە: گەشەكردنی هوشیاری نەتەوەیی تیایدا, هەروەها دروستبونی چەند دەسەڵاتێكی كۆماری لە هەندێك لە شارەكانیدا. ئەمە و سەرەڕای ئەوەی ئیتاڵیا مەڵبەندی ئیمپراتۆریای رۆمانی بوو, ئەو ئیمپراتۆریایەی خاوەن شكۆمەندیەكی مەزن بوو. لێرەدا دەتوانین گرنگترین دەرەنجامەكانی بزوتنەوەی ڕێنیسانس لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشان بكەین:

1-هێرشكردنە سەر ئایین و ئاكار و جیاكردنەوەیان لە بوارەكانی سیاسەت و فیكری كۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیری و زانستی, ئەم پرۆسەیەش بەشێوەیەكی تایبەت لەسەر دەستی "ماكیاڤیللی و جان بودان" دێتە ئارا.

2-بزوتنەوەی ڕێنیسانس ڕۆڵێكی دیاری لە گەشەكردنی ئەدەبی نەتەوایەتیدا هەبوو لە ئیتاڵیا و ئەوروپا و نمونەیەكی بەرزی لە چێژی ئەدەبی پێشكەشكرد, بەرادەیەك كە ئەدەبی سەدەكانی ناوەڕاستی بەجێهێشت.

3-هاوكات بزوتنەوەی ڕێنیسانس توانی رۆحێكی نوێ دروست بكات كە لە سەرجەم بوارەكانی وەك: (سیاسەت و ئەدەب و هونەر و زانست و ئابوری و.. هتد), سەرگەرمی داهێنان و نوێكردنەوە بێت.

4-یەكێكی تر لە تایبەتمەندیەكانی ئەم سەردەمە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بوو لە سەر دەستی "مارتن لۆتەر و جۆن كالڤن", سەرەنجامیش ئاینزای پرۆتستانتی پەیدا بوو كە لە ئاینزای كاتۆلیكی جیابووەوە.

5-بزاوتی ڕێنیسانس كلتوری مرۆڤایەتی دەوڵەمەندتر كرد, كاتێك چەمكی نوێی سەبارەت بە ژیان و جیهان پێبەخشی و داوای لە خەڵك كرد بایەخ بە ژیانی ئەم دنیایان بدەن و خۆشی و حەزی ژیان بە سوك سەیرنەكەن, یاخود بیكەنە قوربانی لە پێناو كامەرانی و بەختەوەریەكی دیكەدا كە لەوە دنیا هەیە و ئێمە هیچی لە بارە نازانین[1].

## مەبەست لە سەردەمی نوێ چییە؟

مەبەست لە سەردەمی نوێ بە گشتی ئەو ماوەیەیە كە توركەكان بە ڕابەرایەتی "محەمەدی فاتح" لە ساڵی 1453دا چونە ناو قوستەنتینیەوەو خەونی دروستكردنی ئیمپراتۆریەتێكی مەسیحی جیهانیان لەباربرد. ئەگەرچی زۆرێك لەسەر ئەم بەرواره كۆكن, بەڵام هەندێكی تر پێیان وایە كۆتایی سەدەكانی ناوەڕاست و دەستپێكردنی سەردەمی نوێ بە دۆزینەوەی ئەمریكا لە ساڵی 1492دا دەست پێدەكات. سەرەڕای ئەم ناكۆكی و جیاوازیانەش دەتوانین بڵێین سەدەی پازدەهەم خاڵی جیاكەرەوەی نێوان سەدەكانی ناوەڕاست و سەردەمی تازەیە.

هەروەها هەندێكی كەش هەن (كە ژمارەیان ئێجگار كەمە) پێیان وایە سەدەكانی ناوەڕاست تا كۆتایی سەدەی حەڤدەهەم دەخایەنێت, چونكە تەنها لەو قۆناغەدا بە یەكجاری سەردەمی دەرەبەگایەتی كۆتایی هات و قۆناغی دەسەڵاتی شاهنشایی رەها دەستی پێكرد.

لە سەدەكانی ناوەڕاستدا دیارترین خەسڵەتی ژیانی سیاسی و فیكری سیاسی لە خۆرئاوادا بریتی

بــوو لــە ململانێــی نێــوان دەســەڵاتی دنیــایی و دەسەڵاتی ئاییني، واتە بریتی بوو لە كێشەی نێوان دەسەڵاتی ئیمپراتۆر و دەسەڵاتی پاپا. سەرەوەختی دەســتپێكردنی ئــەو كێشــەیە، خۆرهــەڵات ئــارامی سیاسی تێدا بەرقەرار بوو، هەروەها شارستانیەتی ئیسلامیشی تێدا دروست بوو كە بووە ناوەندێكی گرنگــی پێكــەوە گرێــدانی نێــوان شارســتانیەتە دێرینەكانی خۆرهەڵات و یۆنان لەگەڵ شارستانیەتی سەردەمی تازەدا.

شارســتانیەتی ئیســلامی لای خۆیــەوە ئــەو لێكجیاكردنەوەیــەی بەخۆیــەوە نــەبیني، چــونكە خــودی خەلیفــە هــەردوو دەســەڵاتەكەی لــە دەســتی خۆیدا كۆكردبووەوە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئیسلام ئایینیشە وە دنیاییشە، بەمجۆرە ئایین و دەوڵــەتی لێــك جیانەكردۆتــەوە بــەڵكو پێكــەوە كۆی كردوونەتەوە.

ســەدەكانی ناوەڕاســت ســەردەمی كێشــە و ململانێی نێوان كلێسا و دەسەڵاتی مەدەنی بوو. ئەم سەردەمە درێــژەی كێشـا و بازرگـانیش لـە دۆخـی دواكـەوتوویی خۆیـدا مایـەوە، تەنانـەت بازرگـانی لەسەر ئاستی دەرەكی و لە نێوان ئەو هەرێمانەشدا كـە هاوسـێ و نزیـك بەیـەكبوون گەشـەی نـەكردو پەرەی نەسەند. واتە بازرگانی زیاتر لۆكاڵی بوو نەك نیشتمانی و ئەوەشی ئەم دۆخەی هێنابووە ئاراوە دواكـــەوتوویی ئامرازەكـــانی بەرهـــەمهێنان و گواستنەوە و زۆری تێچوونی بوو.

بــەڵام لەگــەڵ پەرەســەندنی بەرهــەمهێنان و هەناردەكردني، توێــژێك لە بازرگانان دروست بوون كــە بوونــە خــاڵی پێكگەیانــدن لــە نێــوان بەرهەمهێنـەران و بەكاربەرانـدا، هـەروەها لـە نێـوان ژمارەیـەكی گـەورەی شـارەكانی تـر و زەوی و زاری میرنشــینە فیوداڵیەكانـدا. دۆزینـەوەی ئـەمریكا و هێنانی خێر و بێرێكی زۆر و زەوەند لەوێوە لە دوای دۆزینــــەوەی (رأس الرجــاء الصــالح)، خــاڵێكی وەرچەرخانی گەورە بوو لە بوژاندنەوەی بازرگانی و پێشخســتنیدا. بــەمجۆرە و جــارێكی تــر جموجــۆڵ كەوتــەوە شــارەكان، دوای ئــەوەی لــە ســەردەمی دەرەبەگایەتیدا ئیفلیج بوو بوو. هاوكات پیشەوەران بەرهەمەكانی خۆیان زیاد كردوو، بازرگانەكانیش بە رۆڵی خۆیـان هەسـتان و لە پـای ئەمەشدا ئاڵوێردی پارە بەشێوەیەكی بەرفراوان زیادی كرد.

زیادبوونی بەرهەم بەو شێوە زۆرە و فراوانبونی بـواری بازرگـانیش لەگەڵیـدا، بوونـە مایـەی ئـەوەی خـەڵكی داوای چاكتركردنی ڕێگـای هاتوچۆ بكـەن و كۆسـپ و كەنـدەكانی بـەردەم پرۆسـەی گواسـتنەوە كــەم بكرێنــەوە، هــەروەها كــەم كردنــەوەی بــاج و ســەرانەیان لــە نێــوان میرنشــینەكاندا بــە كــارێكی پێویست دەزانی.

بێگومـان دەرەبەگـەكان ملیـان بـەم داواكاریانـە نـەدەدا و ئامـادە نـەبوون دەسـتبەرداری دەسـەڵات و دەسـكەوتەكانیان بـبن، كـارێكی لـەمجۆرەش بـووە مایەی هەڵایسانی جەنگێكی قورس لە نێوان چینی بــۆرژوای تــازە پێگەیشــتوو لەگــەڵ دەســەڵاتی سستمی فیوداڵیدا.

بورژوازیــەتی تــازە پێگەیشــتوو بەوپــەڕی خوێنگەرمیـەوە كـاری دەكـرد بـۆ ئـەوەی پرانسـیپی كۆكردنــەوەی دەســەڵات لــە كەســایەتی پادشــادا بچەسپێنێ، تا بتوانێت لە فرە بازاڕی رزگاری بێت و بازرگـانی فـراوانیش هانبـدات و پارێزگاریشـی لـێ بكـات. بـەمجۆرە بەرژەوەنـدی هەریـەك لـە پادشـاو چینی بۆرژوازیدا یەكیان گرتەوە لەوەی كە سستم و دامودەزگای فیودالیزم لەناوبەرن.

لـەو قۆناغـەدا بۆرژوازیـەت پەرۆشـی ئـەوە بـوو دەوڵـەتێكی نیشـتمانی یـەكگرتوو بێنێتـە ئـارا كـە

دەرفــەتی ئــەوەی بــداتێ بازرگانیــەکی فراوانــی مسۆگەر و پڕ قازانج بکات. بێگومان چینی بۆرژوا لە سـەرەتای ململانێیدا لەگەڵ فیـودالیزم بێ ئاگا بـوو لەوەی کە لە داهاتوودا ستەمکاری دەسەڵاتی رەهـای پادشا بە کوێ دەگات.

کاتێــك شــاری قوســتەنتینیە کەوتــە دەســت تورکەکان، زۆر لە بیریارانی بەرەو ئەوروپا هەڵاتن (بە تایبــەتی ئیتاڵیــا) و ژمارەیــەکی زۆر دەســتنووس و کتێبیــان لەگــەڵ خۆیانــدا هێنــا، ئەمــەش ڕۆڵێکــی گــەورەی بینــی لــە دروســتکردنی شــۆك بــۆ فیکــری ســـەدەکانی رابـــردوو.. ئـــەم گۆڕانـــە خـــاڵێکی وەرچـــەرخانی چارەنوســـــاز بـــوو بـــەرەو ڕێنیسانسـێکی نـوێ. سـەرەتای سـەدەی شـازدەهەم ئــەوروپای خۆرئــاوا سســتمی پاشــایەتی رەهــای بەخۆیەوە بینی و لە ماوەیەکی زۆر کەمیشدا هـەموو جێگایەکی گرتەوە.

## پەراوێز

1–د. علــی عبــد المعطــي محمــد: فیکــری سیاســی خۆرئاوا – دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، 1975 – لا 176.

## سەرچاوە

د. موسی ابراهیم: معالم الفکر السیاسی الغربي: مؤسسة عزالدين للطباعة و النشر، بيروت – الطبعة الاولى، 1994.

# چارەنوسی فەلسەفە
# لە نێوان مەسیحیەت و ئیسلامدا

خوێندنەوەی: دلێر محەمەد

بیرمەنـدو وەرگێـڕی ناسـراوی عـەرەب "جـۆرج تەرابیشی"سـەرەتای كتێبەكـەی بە "دان پیانـان" – ێك دەست پێ دەكات, كە تیایدا بە راشكاوی ئاماژە بـەوە دەدات كـە دەكـرا ئـەم كتێبـەی بەردەسـتمان بەشێك بوایە لە كۆی پرۆژە گشتگیرەكەی كە ناوی ناوە "ڕەخنـەگرتن لە ڕەخنـەگرتنی عـەقڵی عـەرەبی" "نقـد نقـد العقـل العربـی" كـە زیـاتر وەڵامێكـە بـۆ پرۆژەكەی بیرمەندی ناسراوی مەغریبی "محمد عابد الجـابری", بـەڵام مەترسـی فراوانـی قـەبارەی ئـەو بابەتەی كە لەم كتێبـەی بەردەسـتماندا خراوەتـە ڕوو دەربـارەی ئـەو پشـكنینە هاوسـەنگەی دیـاردەی "ئایـدۆلۆژیای تـەنها خـۆ بـە حەقیقـەت زان" لـە جیهـانی مەسـیحی و ئیسـلامدا, لەگـەڵ نـەمانی ئـەو ئایدۆلۆژیا ڕۆژهەڵاتناسە باوەی كە لەمەڕ جیاوازی چارەنوسی فەلسەفە لە هـەردوو جیهـانی مەسـیحی و ئیسـلامیدا كاریگـەری بەرچـاوی هـەبووە, بـە تێڕوانینی نوسەر هەموو ئەمانە وایانكرد ئـەم بابەتـە جۆرێـك لـە سـەربەخۆیی وەربگرێـت, بـەڵام نوسـەر هەرگیز مەبەستی نییە لەم كتێبەشدا لە پرۆژەكـەی كە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا بچێتە دەرێ, بـەم پێیـە سـەرەتا "تەرابیشـی" دەربـارەی "هۆكارەكـانی دواكەوتنی موسڵمانەكان و پێشكەوتنی ئـەوانی تـر" ئامـاژە بـە پـەرەگرافێكی "جـابری" دەكـات كـە لـە كتێبـی "پێكهاتـەی عـەقڵی عـەرەبی" دا هـاتووە كـە جابری دەڵێت "لـە كـەلتوری عـەرەبی ئیسـلامیدا بـەو شێوازە دان بە فەلسـەفەی ئەرسـتۆییدا نـەنراوە, وەك لە كەلتوری ئـەوروپی – مەسـیحیدا دانـی پێدانراوە, هۆكارەكەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە دەسەڵاتی ئـایین لە كەلتوری عەرەبی ئیسلامیدا ناچار نـەبووە كـە دان بـە فەلسـەفەی یۆنـانی و ئەرسـتۆییدا بنێـت, بـەڵام سەرچـاوەی دەسـەڵاتی ئـایین لـە ڕۆژئـاوادا كـە مەسیحیەتە پێویستی بـەو دانپێدانانەیە" بە بڕوای

"جابری" ئەمە فاکتەری دواکەوتنی موسڵمانەکانە، بەڵام بە تێڕوانینی "تەرابیشی" ئەم بۆچوونەی "جابری" بۆ مەسیحیەتی عەقڵانی و کراوە بە رووی فەلسەفەداو هەروەها بۆ جیهانی ئیسلامی داخراو و نائامادە، هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بڵێین خاوەنی ئەم تێڕوانینە بە شێوازێکی تایبەت و سەرلەنوێ گەڕاوەتەوە بۆ بنیادنانەوەی ئەو ئایدۆلۆژیا رۆژهەڵاتناسییەی کە بەردەوام هەوڵی بەسەنتەرکردنی عەقڵی "ئەسینی – ئەوروپی" داوە، لێرەوە ئەم تێڕوانینە هیچ ناکات جگە لە جێگیرکردنی هۆشیاریەکی مێژووییانەی ساختە نەبێت کە پێی وایە مەسیحیەت کاتێك بەرەو خۆرئاوا کشا بە رووی فەلسەفەدا کرایەوە، لە هەمان کاتیشدا جیهانی ئیسلامی تووشی داخران بوو، ئەم کرانەوە و پێشکەوتنەی جیهانی مەسیحیەتیش، بەپێی ئایدۆلۆژیا رۆژهەڵاتناسیەکە کە ئامادەییەکی بەردەوامی هەبووە بۆ وەرگرتنی عەقڵێکی کۆسمۆلۆژی کە "تەرابیشی" لەو باوەڕەدایە رەگی ئەم ئایدۆلۆژیایە لای "ئەرنست – رینان" ەو لەگەڵ هیچ واقعێکی مێژووییدا ناگونجێ، لەبەرئەوەی نوسەر پێی وایە هەتا "فوقاهاکانی" ئیسلامیش وەك "غەزالی" لە رۆژهەڵات و "ابن حزم" لە رۆژئاوا بە تەواوەتی لەگەڵ سەرجەمی پرۆژەی عەقڵانیەتی یۆنانیدا دانەبڕابوون. واتە هەریەك لە "غەزالی" و "ابن حزم" سەرگەرمی داڕشتنی پرۆژەیەکی وەها بوون بۆ لۆژیکی ئەرستۆیی کە بگونجێ لەگەڵ ئیسلامدا.

لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا نوسەر مەبەستی سەرەکی کتێبەکەی رونتر دەکاتەوەو راشکاوانەتر بنەمای "ئایدۆلۆژیای رۆژهەڵاتناسی" کە زۆربەی نوسەر و بیرمەندەکانی رۆژهەڵاتیش کەوتونەتە ژێر کاریگەرییەوە دەخاتە بەر رەخنەیەکی کاریگەر و پێی وایە یەکەم کەس کە لە مێژووی فیکری خۆرئاوادا ئینکاری هەبوونی هەرچەشنە فەلسەفەیەکی کردبێ لە جیهانی ئیسلامیدا بریتیە لە "ئەرنست رینان"ی فەیلەسوفی فەرەنسی، کە یەکێکە لەو بیریارە رەگەزپەرستانەی کە ئەفسانەی رەگەزی ئاری لە نوسینەکانیدا بەرز رادەگرێ لە بەرامبەر رەگەزی "سامی"دا. "رینان" لە رێگای بانگەشەیەکەوە دەستبەکار دەبێ کە پێی وایە لێکۆڵینەوەی جەسورانەی فەلسەفی رەگەزی "ئاری" پێی هەستاوە، لە بەرامبەریشدا رەگەزی سامی خاوەنی تێڕوانینی عەقڵانی و فەلسەفی نەبوون، هەروەها ئینکاری فەلسەفەی ئیسلامیشی کردووە. چونکە "رینان" پێی وایە فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی، فەلسەفەی عەرەبی نەبووە، بەڵکو بە عەرەبی نوسراوەتەوە، "تەرابیشی" پێی وایە ئەم تێڕوانینەی "رینان" هەڵگری پارادۆکسێکی ناوەکی قووڵە، چونکە ئەو لە هەمان کاتدا ئەوەی فەرامۆشکردووە کە سەرجەم فەلسەفەی یونانیش، یۆنانی نەبووە بە مانا ئەسینییەکەی ووشەکە، بە قەد ئەوەی کە بە یۆنانی نوسراوەتەوە، هەروەها نوسەر درێژە بە تێڕوانینەکەی دەدات و دەڵێت "رینان" لە کتێبی "زانست و ئیسلام"دا ئاماژە بەوە دەدات کە لە نێوان ئەو فەیلەسوفانەدا کە بە عەرەب وەسفکراون جگە لە یەکێکیان کە ناوی "کەندی"یە ئەوانی تر یان فارس یاخود ئیسپانی یان خەڵکی بوخاراو سەمەرقەند و ئەشبیلیە بوون، بۆیە لە بەرامبەردا نوسەر دەڵێت ئێمەش لێرەدا دەکرێ ئاماژە بەو تێڕوانینەی "نیچە"بدەین کە پێی وایە "ئەسینا جگە لە سوکرات و ئەفلاتون، هیچ فەیلەسوفێکی تری بەرهەم نەهێناوەو فەیلەسوفەکانی تری یۆنان کەسانی نامۆ و غەریب بوون بە یۆنان" بەم پێیە "تەرابیشی" دوور لە

تێڕوانینـی ڕەگەزپەرستـانە دەڵێت: گـەر ڕەگـەز وەك "رینـان" فـەرزی کـردووە, وتەزایـەکی زمانـەوانی بوایـە, ئـەوا چـۆن دەکـرا کـە دەیـان فەیلەسـوفی بـە ڕەگەز سوری یـان میسری کـە بـە یۆنانی نوسیویانە لـە چوارچێوەی ڕەگـەزی ئاریـدا ریزکـەین, یـاخود بـە پێچـەوانەوە دەیـان فەیلەسـوفی فارسـی و ئاریـایی دیکـەش کـە بـە عـەرەبی نوسیویانە لـە چوارچێوەی ڕەگـەزی سـامیدا ریزکـرێن, لێـرەوە گـەر بمانـەوێ ڕەگـەزی فەیلەسـوفانی جیهـانی ئیسـلام لـە یـاد و فەرامۆشـکەین, ئـەوا لـە بەرامبەریشـدا دەبـێ ڕەگـەزی فەیلەسـوفانی یۆنـان و جیهـانی مەسیحیش پشتگوێخەین.

ئاشکرایە گەر بە تێگەیشتنێکی کورتتر لە کۆی بەشەکانی ئەم کتێبە بدوێین جگە لە دواهـەمین بـەش کە بە بڕوای من گرنگی و بایەخی کتێبەکە لە بەشـی کۆتاییـدا دەگاتـە ئـەوجی چـونکە لـەم بەشـەدا دیالـەکتیکی پێشـکەوتن و دواکـەوتن لـە ڕووی فەلسـەفییەوە بـە پشـت بەسـتن بـە تێڕوانینـی زانستی و مێژوویی لە نێوان ترادیسیۆنی ئیسلامی و مەسیحیدا و لەلایەن نوسەرەوە دەخرێتە ڕوو, ئەوا لە کۆی بەشەکانی تری کتێبەکەدا جگە لـە دواهـەمین بـەش وەك لەسـەرەوە ئاماژەمـان پێـدا, نوسـەر لـە ڕێگای کۆمەڵێك بۆچوون و بەڵگەی مێژووییـەوە ئـەو تێڕوانینـە سـاختە و هەڵەیـە کـە پێی وایـە "جیهـانی مەسیحیەت لانکەی فەلسەفە بووە و لە بەرامبەریشدا جیهـانی ئیسـلام گـوڕی فەلسـەفەیە" ڕەتدەکاتـەوە, بەڵام دواجار هەرگیز خۆ لـەو پرسیارەش نـابوێرێ و بوێرانـە دەپرسێت لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشدا بۆچـی ترادیسـیۆنی مەسـیحی لـە ڕووی فەلسـەفییەوە پێشـکەوت و ترادیسـیۆنی ئیسـلامیش تووشـی داخـران و دواکـەوتن بـوو؟. پرسـیاری سـەرەکی کتێبەکە ئەوەیە کە "تەرابیشی" لـە دواهـەمین بەشـی کتێبەکەیدا کـە نـاوی نـاوە "فەلسـەفە و دیالـەکتیکی پێشـکەوتن و دواکـەوتن" پـاش شـۆڕبوونەوەیەکی قـووڵ و گەشـتێکی وورد و خێـرا بـەنێو مێـژووی جیهـانی مەسـیحی و ئیسـلامدا خـۆ لەقـەرەی وەڵامدانەوەی دەدات, نوسەر لـە سـەرەتای دواهـەمین بەشـی کتێبەکەیـدا دەپرسێت لـە مێـژووی جیهـانی مەسـیحی و ئیسـلامیدا چـی ڕوویـدا؟ ئاشـکرایە جیهـانی مەسیحی دوای شکستێك کـە هـەزار سـاڵی خایانـد هێـدی هێـدی پێشـکەوت, لـە بەرامبـەردا جیهانی ئیسلامیش پاش پێشکەوتنی پێنج سـەدە کشـایەوە دواوە, دروسـت لـەو شـوێنەوە جیهـانی مەسـیحی کۆتـایی هـات جیهـانی ئیسـلامی دەسـتی پێکـرد, لـەو جێگایـەوە کـە جیهـانی ئیسـلامیش کۆتـایی هـات جیهـانی مەسیحی دەستی پێکردەوە. بێگومـان لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا جیهانی مەسیحی نوقمی ناو تاریکی بوو, یـەکێك لـە فاکتـەرە گرنگەکانیشـی بریتـی بـوو لـە دەرکردنـی فەلسـەفە, تەنانـەت زانسـتی لاهـوتیش بـۆ دەرەوەی شـاری مەسـیحی, دیـارە لـە هـەمان سـەردەمدا یـەکێك لەو هۆکارە گرنگانەی کە بووە مایەی ئەوەی جیهانی ئیسلامی لە پێنج سـەدەی یەکەمدا بـارودۆخی بـاوی سـەدەکانی ناوەڕاسـت تێکشـکێنێ و سـەردەمێکی زێـڕین بـە خۆیـەوە ببینـێ, کردنـەوە و فراوانکردنـی بـوار بـوو بـۆ زانسـتی کـەلام و فەلسـەفە لـە شـاری ئیسـلامیدا. ئاشـکرایە جیهـانی مەسـیحی لەگـەڵ داگیرکردنـی ڕووەو خۆرئـاوا بەرتەسـك بـووەوە, بـەڵام پاش ئەوەی دەرگاکـانی لەبـەردەم فەلسـەفەو لاهوتـدا والآکـرد بەئاراسـتەی پێشـکەوتن گـوزەری کـرد, جیهانی ئیسلامیش دوای ئەوەی لەگەڵ داگیرکردنـی ئەندەلوسـدا ڕووەو خۆرهـەڵات بەرتەسـك بـووەوە, بـە پێچـەوانەی جیهـانی مەسیحیەوە فەلسـەفەو پاشـان زانسـتی کـەلامی تـەڵاق داو کەوتـە زۆنگـاوی

دواکەوتنــەوە. بــە تێگەیشــتنێکی وووردتــر نوســەر دەیەوێ بڵێت جیهانی ئیسلامی کە وازی لە فەلسەفە هێنـا بــە جیهــانی مەســیحی بەخشــی، جیهــانی مەســیحیش کــە زۆر دڵڕەقانــە فەلســەفەی یۆنــانی وەدەرنـا، ســەرلەنوێ لــەڕێی فەلســەفەی عــەرەبی ئیسلامیەوە کەشـفی کـردەوە بـەم پێیـە بیرمەنـدو ڕۆژهەڵاتناس "بیرنارد لویس" دەڵێت "ئەوروپییەکان لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا دەچـوون بـۆ ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـۆ ئـەوەی فێـری زمـانی عـەرەبی بـن و بتـوانن دەقـە فەلسـەفیە یۆنانیـەکان بخوێننـەوە"[1] هــەروەها کاتێــك لــۆژیکی دەســتەی فریــادرەس و لـۆژیکی نەرێکردنـەوەی فرەدەنگـی بەسـەر جیهـانی ئیسـلامیدا زاڵ بـوو، بـە پێچـەوانەوە لـە جیهـانی مەسیحیەتدا فیکـری تـاکرەوی بـەرەو فـرە دەنگـی و جیاوازی هەنگاوی دەنا، ئەمەش لەڕێگای سەرلەنوێ بەگەڕخستنەوەی عەقڵەوە فەراهەم بوو، سەرەتا بە شێوەیەکی لاهوتیانە و دواتریش ڕێچکەی فەلسـەفی لەخۆگرت، هەر بۆیە لە کاتێکدا "ئیسلامی" جیهانی ئیسـلامی لــە ئیســلامی تیۆلۆجیســت و ســۆفی و شــاعیر و زاناکــانی نــەحوەوە کورتکرایــەوە بــۆ ئیسـلامی زاناکـانی شـەرع و حـەدیس ناسـەکان، مەسیحیەتی جیهانی مەسیحی ئا لـەو کاتـەدا لـەوە قوتاری بوو کە بەتەنها مەسیحیەتی قەشەکان بێت. جیهانی مەسیحی سەرەڕای دژایەتی کردنی "دیوانی پشکنین" کە پارێزەری ئایدۆلۆژیای "تـەنها خۆ بە حەقیقــەت" زان بــوو کەچــی مەســیحیەت لەلایــەن مەســیحیەکانەوە کرایــە مەســیحیەتی لاهــوتی و فەیلەسوف و سۆفیەکان، ئەمەش بەرەنجامی هەوڵ و ماندوبوونی کەسانێك بوو کە پێیان وابوو وەك چۆن دابڕان هەیە لەگەڵ عەقڵدا، بە هەمان شێوە دابڕانیش هەیـە لەگـەڵ عـەقڵی ئایینیـدا، هـەروەها وەك چـۆن پەیوەندی و وابەستەییش بە عەقڵەوە هەیە، ئاوەها

پەیوەندیـەکیش هەیە بە عەقڵی ئایینییەوە، لێرەوە نوسەر "لۆتەریزم" بە یەکەمین فشاری سەرهەڵدانی مۆدێرنـەتی دەزانـێ چونکە "تەرابیشـی" پێـی وایـە لەگــەڵ پەیــدابوون و بڵاوبوونــەوەی نوســینەکانی "مارتن لۆتەر" دا "ئایدۆلۆژیا خۆ بەتـەنها حەقیقـەت زان" ەکەی جیهانی مەسیحی دەبات و ئەو شۆڕشـە لاهوتیە سەرهەڵدەدات کە دەق لە دەق ڕزگار دەکات، ئیــدی لێــرەوە چارەنوســی فەلســەفە لــە جیهــانی مەســیحی و لــە خۆرئــاوای ناوەڕاســت و بــاکوردا جیادەبێتـەوە لـە چارەنوسـی فەلسـەفە لـە جیهـانی ئیسلامیدا. لە خۆرهەڵاتی ناوەراست و باشوردا هیچ ســیمایەکی هاوشــێوە و لێکچــوو نــەما بــۆ بەراوردکردنی فەلسەفە لەم دوو جیهانـەدا. بەم پێیـە "تەرابیشـی" لـە کتێبەکەیـدا بـەری ئـەو چارەنوسـە جیـاوازەی فەلسـەفەمان بـۆ بـەیان دەکـات لەهـەردوو جیهــانی مەســیحی و ئیســلامیدا، تــا دەگاتــە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهـەم و دەڵـێ لـە هـەموو شوێنێکی ئـەوروپای خۆرئـاوادا، لـە هەنـدێ حاڵەتـدا بـۆ مـاوەی سـەدەیەك ئایـدۆلۆژیا جێگـای ئـایین دەگرێتــەوە، هــەروەها ئامــاژە بــەوەش دەدات کــە لەدواچــارەکی ســەدەی بیستەمیشــدا ئــەوروپا پێدەنێتــە ســەردەمێکی تــازەوە کــە ســەردەمی ئایــدۆلۆژیا لەخۆداماڵینــە. بــەڵام لــە باســکردنی جیهـانی ئیسـلامیدا ئامـاژە بـەوە دەدات کـە لـە کـارە سەرەکییە ئازادیخوازانەکەیدا شکستی هێنا. کە بە بـڕوای "تەرابیشـی" ڕێنیسـانس یەکێکـە لـە کـارە سـەرەکییەکانی ئـەم جیهانـە کـە دەبـوو بیکـات بـەڵام سـەرکەوتنی بەدەسـت نـەهێنا، هۆکـاری شکسـت خواردنی پرۆژەی ڕێنیسانس لە جیهانی ئیسلامیدا بە بڕوای نوسەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەبوو ئەم جیهانـە لەگـەڵ خـودی خۆیـدا ڕەخنـەیی بوایـە، لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی خۆرئاواشـدا بـەرگری لـەخۆی

بكردایە, هەروەها جگە لەم فاكتەرە نوسەر ئاماژە بە هۆكارێكی گرنگتر دەدات كە بووە مایەی ئەوەی جیهانی ئیسلام سەردەمی ڕێنیسانس بە خۆیەوە نەبینێ, ئەویش ئەو فاكتەرە كاریگەرە بوو كە ئەم جیهانە دەیویست بەبێ تێپەڕبوون بە "شۆڕشێكی لاهوتی و فەلسەفیدا" بە ئایدۆلۆژیا بگات, بۆیە نوسەر پێی وایە عەقڵی ئەم ترادیسیۆنە كە دەیویست بەم شێوازە كاربكات زیاتر خۆی كوشت و هیچی تری نەكرد. لە كۆتایی كتێبەكەیدا نوسەر ئاماژە بەوە دەدات دەڵێ "گەر وەك قۆناغ و سەردەمیش تەماشای مەسەلەكە بكەین, گرنگی و كاریگەری شۆڕشێكی لاهوتیانە بەشێكە لە پرۆژەی كارەكانی عەقڵی جیهانی ئیسلامی, گرنگی ئەم جۆرە شۆڕشەش كاتێك لەم جیهانەدا دەردەكەوێ كە بە هەموو توانایەكمان دژایەتی شەپۆلی مەندەمێنتالیزمی ئیسلامی بكەین لە جیهانی ئیسلامیدا كە ئەمڕۆ زیاد لە هەر سەردەمێك لە گەشەكردن و زیادبووندایە چونكە ئەم شەپۆلە توندڕەوە هاوواتا و هاومانای بەسیاسیكردنی "ئایدۆلۆژیا تەنها خۆبە حەقیقەت زان" ە. ئاشكرایە كاتێك "تەرابیشی" باس لە شۆڕشی لاهوتی دەكات مەبەستی شۆڕشێكە لەسەر ڕێبازی "لۆتەریزم" كە دەق لە دەق ڕزگار دەكات و بونیادی عەقڵانیەتی دەق لەبەر ڕۆشنایی پێویستییەكانی هەنووكە و پاشەڕۆژی گەشەكردنی مێژوویدا سەرلەنوێ دەگێڕێتەوە, بەڵام شۆڕشێكی فەلسەفی وەك ئەوەی كە "ڤۆڵتێر" پێی هەستا كە بریتی بوو لە ڕزگاركردنی عەقڵ لە دەق, ئەوا تەرابیشی پێی وایە ئەم جۆرە شۆڕشە هێشتا لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا كاتی نەهاتووە, بۆیە دواجار نوسەر پێی وایە بەبێ "لۆتەر"ێكی موسڵمان ناكرێ و ناتوانین چاوەڕوانی "ڤۆڵتێر" ێك بین لە جیهانی ئیسلامدا, هەر بۆیە لە سایەی غیابی لاهوتێكی ئیسلامیدا, فەلسەفەیەك نابینین لە جیهانی ئیسلامیدا لەدایك بێت...

## سەرچاوە

مصائر الفلسفة بين الاسلام و المسيحية / جورج طرابيشي بيروت ط1 2000.

## پەراوێز

1–وتەكەی (برنارد لویس)م لە لاپەڕە (131)ی كتێبی (دەربارەی فەلسەفە ئیسلام ڕۆشنگەری) مەریوان وریا دا دەرهێناوە.

# ئومبێرتۆ ئیکۆ.. و حەفتا ساڵ تەمەن*..

ستێفەنۆ بارتێتزاگی
لە ئیتالییەوە: یاسینی فەقێ سەعی

"سێمیۆلۆگ، نووسەر، ووتارنووس، وەرگێڕ، بەڵام لەسەرروو هەموو ئەمانەوە مامۆستای زانکۆ. ئێکۆ نموونەی ڕووناکبیری هەرە بەناوبانگی ئیتالییە. پێی دەڵێن "کورتکراوەی" شاکارێك کە هەرگیز تەواو نابێ."

"ئیکۆ، ئەو ئیتالیەیە کە حەفتا ساڵ تەمەنیەتی و لە دوای خۆی توانیویەتی جێگا و نیشانەیەك بەجێبێڵێ کە زۆر سەختە پڕکردنەوەی."

ئێکۆ، ئەو ڕووناکبیرە بزێو و پشوو درێژەیە، ماندوونەناسانە کارەکانی ئەنجام دەدا. لەلایەك لەوانەیە لە قوژبنی کتێبخانەیەکی تێکستە کۆنەکاندا بە دوای سۆراخی کتێبێکی کۆن و دەگمەندا بگەڕێ، کە بە ئەوپەڕی عەشقەوە دەکەوێتە سۆراخی هەموو ئەو تێکستە دێرینانەی لە نێو ڕەففەکانی کتێبخانە گەورە و فراوانەکەی خۆیدا نایاندۆزێتەوە، بە کورتیەکەی ئێکۆ، بە حەوسەڵەترین میچی کتێبە کۆنەکانە. یان لە لایەکی تردا لەوانەیە لەو مێزگەردانەدا بەرچاو بکەوێ کە وەك خۆپیشاندانێکی جەماوەریی قسە لەسەر وازییە ئەدەبی و فیکریەکان دەکات، ئەو مێزگەردانە هەموو ساڵێك لە مانگی کانوونی دووەمدا، لە شانۆی پیکۆلۆی شاری میلانۆ سازدەکرێ. لەو مێزگەردانەدا ئێکۆ بەراورد دەکرێت بە نووسەرە فەرەنسییەکان، بە دۆگلاس هۆفستادتەر (*D. Hofstadter*)، فەیلەسوفی بلیمەتی ئەمەریکی، بە ئێشەر (*Escher*)، بە باخ (*Bach*). ئومبێرتۆ ئێکۆ هیچ جۆرە ڕەفتار و خوویەکی تایبەتی نییە وەك ڕووناکبیرێکی بەناوبانگ، ئێکۆ ئەو کاتە هەست بە شادیی و شانازی دەکات کە لە هەڵوێستە کەلتووریە جۆراوجۆرەکاندا چالاکانە بەشداری دەکات، ئەمەش بۆتە یەکێك لە ڕەفتارە چەسپاوەکانی.

ئێکۆ هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە لە ساڵانی پەنجاکاندا، وەك ڕووناکبیرێکی بەئارام و پشوودرێژ هاتە پێشەوە: هەر خۆی بە تەنیا و بەبێ هیچ ناسنامەیەکی پێشینە ئامادەکراو و بێ هیچ پشتگیرییەك هاتە مەیدان و هەرخۆشی توانی ئەم پێناسەیە بسەلمێنێ. ڕاو بۆچوونەکانی کاریگەرییەکی بەهێزیان کردە سەر ژیانی ڕۆژانە، هوشیاریی و شارەزایی و لێزانینی ئەم ڕووناکبیرە لە هەندێ حاڵەتدا بوونە شێوەیەك لە پەند و وێردی سەر زمانی خەڵك: ئەمەش بە هۆی ئەو باس و بابەتانەوە کە ئێکۆ قسەی لەبارەوە کردوون هەر لە بابەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەتا بابەتی نوێی وەك (ڕیتە پاڤۆنێ)، هەر لە باسی مایك بۆنجۆرنۆ (پێشکەشکاری بەرنامەی تەلەفزیۆنی – و) هەتا قسەکردن لە بارەی (جێمس جۆیس)ەوە، هەر لە باسی زانستی کۆمپیوتەرەوە هەتا باسکردنی بیبلیۆفیلیا (زانستی پۆلێنکردن و ساغکردنەوەی کتێب و تێکستە دێرینەکان). بەهۆی ئەم هەموو بەشداریکردنە جۆراوجۆرەوە یادی حەفتا ساڵەی لەدایکبوونی ئەم مامۆستایە بۆتە مایەی سەرنجی هەموومان: چونکە هەموومان وەك هوشیاریی و زیرەکییەکی بزێو و چالاك و ڕەخنەگرێکی نائارام دەڕوانینە ئێکۆ، کە بێ ماندووبوون لە بەرامبەری دەزگا و دامەزراوەکان و یاسا و فۆرمەکان و ئەرك و بەرپرسیارە جەماوەرییەکاندا هاتۆتە قسە، ئەم هەڵوێستەش زۆر بە کەمی لە هاوتەمەنەکانی خۆی بینراوە یان دەبینرێ.

لە نێوان ئەم هەموو شارەزایی و لێزانینەدا، کە هەر بوارێك ناسنامەیەکی بۆ ئێکۆ دروست کردووە، بێگومان هەندێ لەو ناسنامانە لەوانی دیکە بایەخدارترن. بەر لە هەموویان ناسنامەی ئێکۆی پشوودرێژە وەك (سیمیۆلۆگ). سیمیۆتیکا – *Semiotica* ئەو زانستەیە کە دیراسەی شێوەکانی کارکردنی (ئاماژە)کان دەکات لەگەڵ ئەو شێوەی گەیاندنانەی کە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا ئاراستەی دەکەن. بە هۆی زنجیرەیەك هۆکاری تایبەت بەنەوەی ئەو سەردەمەوە، ئێکۆ لە کۆتایی پەنجاکاندا خۆی لە گونجاوترین شوێنگەدا دەبینێتەوە بۆ حاڵیبوون و تێگەیشتن لەو کەموکوڕییەی لە گوتاری ئیتالیدا هەبوو، وەك هەژاریی لە ئامرازە شیکاریی و ڕاڤەکارییەکاندا بۆ پێشوازیکردن لەو کاریگەرییە کەلتووری و کۆمەڵایەتییەی بەهۆی ئەو گەشە و بوژانەوە ئابوورییە حەتمییەوە ڕوویاندەدا. ئێکۆی ڕووناکبیری پشوودرێژ، لە لایەك وەك تیۆرێزەکار و داهێنەری بواری تەلەفزیۆن، لە لایەکی دیکە وەك ڕۆژنامەنووس و ڕاوێژکاری دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە، بەکارکردنی بەردەوام لە چەندین بوارو کایەی جیاجیادا، توانی ئەو شتگەلانە بگەیەنێتە ئیتالیا کە هێشتا لە ئیتالیادا نەبوون: وەك هەنگاوە سەرەتاییەکانی ستروتورالیزم – بونیادگەرایی – و پاشان بنەما و بنچینەکانی زانستە نوێیەکەی سیمیۆلۆژیا – *Semiologia*، هەتا دەگاتە پێشنیازکردنی "واتاسازیی" و"کۆمونیکەیشن – *Comunicazione*" وەك بابەتی ناوەندیی –سێنتراڵ– کۆتایی سەدەی بیستەم.

ئێکۆ فلوتژەنێکی باش و یاریزانێکی بە توانای ووشەسازییە، برینداركار و تیمارکاریشە، کاتۆلیکێکی کارا و ڕووناکبیرێکی (لایکی – عەلمانی)یشە، داهێنەر و وەرگێڕیشە، نووسەر و بڵاوکەرەوەشە، ڕۆژنامەنووس (هەرچەند بەشدارییەکی کەمی هەیە، بەڵام توانا و لێزانینی خۆی تیا سەلماندووە)ی تەلەفزیۆنییە ( بە پلەی فێنۆمێنۆلۆگی – مایك بۆنجۆرنۆ) نەك تەلەفزیۆنی (بە مانای دەرکەوتن، لە تەلەفزیۆندا تەنها لە

چاوپێکەوتنەکاندا – زۆر بە دەگمەن دەرکەوتووە)، ئێکۆ شەیدای سەفەر و گەڕانە و تا سەر ئێسقان گوندنشین و لادێیشە، لە لایەك وەك شارەزای – مۆڕاڵ– دێتە قسە و لەلایەکی ترەوە زۆر قۆشمەبازە، بە کورتیەکەی ئێکۆ سووتێنەر و ئاگرکوژێنەوەشە، هەرزەکار و پیرەمێردێکی حەفتا ساڵەشە، پیاوێکی ئاسایی عەوامە و ئەستێرەیەکی دیار و درەوشاوەشە.. ئێکۆی پشوودرێژ لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە هەردوو دیوەکەی ئەم ناسنامانەیدا کاردەکات. بۆ نموونە، لە بابەتی ڕۆماندا، چیدی نازانرێ وەك پسپۆڕێکی (چیرۆك و گێڕانەوە) یان ڕاستتر بڵێین وەك (ڕۆمانناس)ێك پێناسە بکرێت، یان وەك خودی (چیرۆك و ڕۆمان) نووس. سەرەتای دەرکەوتنی لەم بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ کاتی بڵاوبوونەوەی رۆمانی (بە ناوی گوڵی سوورەوە) یان (بە ناوی گوڵە باخەوە – و) کە ناوی ئێکۆی گەیاندە بەرفراوانترین خوێنەر لەسەر ئاستی دنیا، ئەم ناوبانگە چاوەڕوان نەکراوە هەر ئەوە بوو کە خوێنەری ووتار و گۆشە تایبەتیەکانی دەمێك بوو خەونیان پێوە دەدی: چونکە یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی ئێکۆ ئەو توانا لە بن نەهاتووەیەتی لە گێڕانەوەو ڕوونکردنەوەی شتەکاندا بەشێوەیەکی وا کە بەرامبەر بە ئاسانی بڕوای پێ دەکات. ئێکۆ بە درێژایی دیراسەکردن و خۆئامادەکردنەکانی بۆ زانکۆ، لە داهێنەرە خۆشەویستەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، فێری هونەری دروستکردنی نموونەیی بووە و لە چیرۆکی ئادزۆ – *Adso*– دا، کە بەئەوپەڕی تاموچێژ و ئارەزووەوە خوێنراوەتەوە، ئەو هونەرە بەرجەستە دەکات، کە لە یەکێك لە لاپەڕە بەناوبانگەکاندا هەمان ئادزۆ دەڕوانێتە دەروازەی کڵێساکە و بەڕێز و پێزانینەوە لە بەهرە و هوشیاریی هونەریی و ڕەمزیی ئەو هونەرمەندە گومناوە ڕادەمێنێ کە نەخشاندوویەتی.

لە ڕاستیدا، بەناو سەرجەم ئەم ناسنامەی ئێکۆدا، یەك (ڕەگەز – ئێلیمێنت) هەیە کە ڕەتدەبێت و تێمان دەگەیەنێ کە هەموو ئەمانە بەشێکن لە بەهرەکانی هەمان پشوودرێژ.

چەند ساڵێك لەمەوبەر، ئالان ئێلکان – *Alain–Elkann* لە زانکۆی فەڕەنسا، ئامادەی وانەیەکی ئێکۆ بوو لە بارەی (کابالیزم – *Cabalism*o[1])ی مەسیحییەوە، لە کۆتایی وانەکەدا ووتی: "ئێکۆ، گوێگرتن لەمجۆرە وانانە، بەڕاستی پیاو فێری شت دەبێت".

لە حەقیقەتدا وانەکانی ئێکۆ مرۆڤ هاندەدەن بۆ خوێندن، نەك تەنها هەر ئەو کەسانەی تەمەنیان شیاوی خوێندنە لە زانکۆکاندا، بەڵکو هانی نووسەر و ڕووناکبیرانیش دەدات بۆ سەرلەنوێ خوێندن و گەڕانەوە بۆ زانکۆ. خەڵکێکی زۆر دەگمەن کتێبێك لە بارەی کانیبالیزمی مەسیحییەوە دەخوێننەوە، بەڵام خەڵکێکی زۆر دەگمەنترن ئەوانەی کە ئارەزووی خوێندنەوەی ئەو کتێبانە ناکەن پاش ئەوەی گوێیان لە ڕانان و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانە دەبێت لە لایەن ئێکۆوە. (جۆرجۆ مەنگەنێلی) لە ڕانانی کتێبێکی ئێکۆدا بە ناونیشانی "چۆن نامەی دەرچوونی کۆلێژ ئامادە دەکرێت" کەم تا زۆر نووسیویەتی "ئەم کتێبەی ئێکۆ وامان لێدەکات هەوڵبدەین جارێکی دیکە خۆمان لە زانکۆ ناونووس بکەینەوە، بۆ ئەوەی نامەی بەکالۆریۆس بنووسین، من ئامۆژگاری خوێنەر دەکەم لەو هەوڵدانە کۆڵنەدەن".

نزیکترین ڕێگا بۆ گەیشتن بەم بلیمەتە ئەوەیە بچینە شاری بۆلۆنیا –*Bologna*– ئێکۆ لە سەرەتای حەفتاکانەوە لەم شارەدا مامۆستای زانکۆیە و

ئێستاش سەرۆکی خوێندنگەی بالای زانستییە مرۆییەکانە. ئێکۆ لەو کاتەدا کە خەریکی نووسینی (شاوڵەکەی فۆکۆ – *il Pendolo di Foucault*) بوو لە (*Dams* – دیسپلینی هونەریی، مۆسیقی، نمایشکاریی – و) وانەی دەوتەوەو زۆر بە قوڵی سەرتاپای پڕوپاگەندەگەرایی فیکری تەمومژاویی و ئاڵۆزیی دەپێوا، ئەمەش هەر لە سەرچەمی بەرهەمەکانی (ئێرمێتیێ تریسمێجیستۆ)وە هەتا دەگاتە هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە نهێنیی ئامێزەکانی بەرهەمەکانی (دانتێ – *Dante*). ئەقڵیەت و شێوازی گفتوگۆی (ئێرمێتیکی – *Ermetico*[2]) یان شێوازی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی ئێرمێتیکی (واتە: تەمومژاویی و ئاڵۆزیی – و) ئەو بابەتانەیان پێکدەهێنا کە ئێکۆ لەو کۆرسەدا بە خوێندکارەکانی دەووتەوە: بەڵام ئەو مێتۆدەی کە لە وانەووتنەوەدا کاری پێدەکرد، کارێکی وای دەخوڵقاند کە بابەتەکە وەك زنجیرەیەکی فیلمی (وێسترن – عصابە)ی لێبێت. لەگەڵ خەیاڵە کیمیاگەرە دێرینەکان و پەیڕەوکارانی ڕێبازی فیکری (بێنێدێتتۆ کرۆچێ) و لووڕەلوورکردن و هەڵکوتانە سەر گالیسکە و کاروانسەراکانی فیکری خۆرئاوا و پرینسیپە سەرەکیەکانی ئەو فیکرە. کارتێزی –*Cartesio*– لە دژی مارەکەی کوندالینی – *Kundalini*– دەجەنگێ؟ پێدەچێ لە سەدا سەد بەو شێوە کۆمێدی و کاریکاتێر ئامێزە نەبێ، بەڵام بە دڵنیا ئێکۆ دید و تێڕوانینێکی نمایشئامێزی هەیە بۆ سەرجەم ڕەوتی هزر و فیکری مرۆڤایەتی. لەلای ئێکۆ، فەیلەسوف، جگە لە فەلسەفەکەی ئەویش مرۆڤێکە وەك ئەوانی تر و دەبێ چالاکی و پراکتیکی هەبێ. هەروەها مامۆستای زانکۆش دەبێ مامۆستا بێت، بە هەموو ماناکانی ووشەی مامۆستا: بە تەواویی خەسڵەتی ئامال بە بیرۆکراتی لە هەلومەرجی مامۆستادا (وەك ئامادەبوون لە کۆلێژدا، ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی ئەرك و فەرمانی سەرشان، بەستنی بۆینباخ) لەسەداسەد خۆی دەگونجێنێ لەگەڵ ڕۆحی باو و عادەتیدا بۆ خزمەتکردنی شار و ناوچەی زێدی ئێکۆ (واتە ناوچەی پیۆمۆنتێ لە باکوری ئیتالیا – و). ئەمەش بە تەنها کێشەیەکی فۆرمالی –شکڵی– نییە: دەفتەرو دۆسیەی تۆمار، شوێنی مامۆستا لە پۆلدا، یان ژووری تایبەت بە سەرۆکی بەش، یان بە مامۆستای کارا، یان یاسا تایبەتیەکانی فۆرمی زانکۆ، یان مۆدێلی دیار و ناسراو.. ئەمانە هەمووی بۆ مامۆستایەك، شانبەشانی دەباشیر و تەختەسڕ، ئامێری کارکردنن. کاری ڕاستەقینەی مامۆستا چنینەوە و کۆکردنەوەی زانین و زانیاریەکانە، لەگەڵ ئەوە لە دوای ئەوەدا گەیاندنی فیکر و شارەزایی و لێزانینەکان.

کتێبی "چۆن نامەی بەکالۆریۆس ئامادە دەکرێ" جگە لەوەی ڕێنمای ئەوانەیە کە دەبێ بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەدەست بێنن، کتێبێکیشە زۆر بە فراوانی بیۆگرافیای کەسی نووسەر خۆیەتی، گونجاندنی ئەم دوو بابەتەش پێکەوە حاڵەتێکی زۆر تایبەتیە و بەڵگەیەکی تری سەلماندنی توانای نووسەرە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەو متمانە بەخشین بە خوێنەر.

ئێکۆ لەو کتێبەدا دەڵێت لەو کاتەوەی خوێندکاری بەکالۆریۆس لەگەڵ مامۆستاکەیدا لەسەر بابەتێك و ناونیشانێك بۆ نامەکەی ڕێکدەکەوێ، لەو ساتەوەختەوە دەبێتە جۆرێك لە فەرمانبەر و خزمەتگوزاری مرۆڤایەتی. هەرچەندە بابەتەکەی گرنگ بێت یان پەراوێزیی بێت، پێویستە کرۆك و ناوەڕۆکی بابەتەکەی زۆر بە قوڵی

ساغبکاتەوەو بێ کەموکوڕی بیخاتە ڕوو: هەر ئەمەشە ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە، یان ئەو فەرمانەی لە ئەستۆی گرتووە.

ئێکۆ ڕووناکبیرێکە. چونکە وا بیردەکاتەوە کە فیکرەکان ئەرکێکی کۆمەڵایەتیان هەیە و ئەمەش دەگەیەنێ، یان با بڵێین ئەو فیکرانەش بەهۆی ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتیەوە دەگەنە خەڵکەکان. پاشان ئێکۆ چیرۆکنووسە، چونکە وا بیر دەکاتەوە فیکرەکان بەشێکن لە مێژوو وە ئێمەش چیرۆکەکان لەو مێژووەوە دەگێڕینەوە بۆ ئەوەی فێربین لە جیهاندا بین: وە هەندێجار چیرۆکە داهێنراوەکان ڕاستترن لە چیرۆکە ڕاستەکان. ئێکۆ هەروەها قۆشمەباز و فلوتژەن و میچی کتێبە کۆنەکانە، ئەمانەش لەگەڵ هەموو ناسنامەکانی تری ئێکۆی پشوودرێژدا خۆیان دەهاوێژنە دوروبەری یەك کێشە و مەسەلەوە کە ئەویش گەیاندنی زانیاری و زانینەکانە، با بڵێین خوێندنگەیە بە مانا ڕاستەقینەکەی. لێرەدا حاڵەتی ئاهەنگسازیی زۆر کەمن، بەڵام هەروەك ڕووداوە ڕۆژانەییەکان دەگێڕنەوە، حاڵەتی کارکردن و خۆماندووکردن ئێجگار زۆرن.

## پەراوێز

*ئەم ووتارە لە (iL VENERDI) پاشکۆی هەفتانەی ڕۆژنامەی (لە ڕێپوبلیکە)ی ڕۆژی 2002/1/4دا بۆ یادی (70) ساڵەی لەدایکبوونی نووسەر بڵاوکراوەتەوە. وێنەی بەرگەکەش هەر تایبەت بووە بە ئومبێرتۆ ئێکۆ.

1-کابالیزم -*Cabalism*-ی مەسیحی. لەلایەك کابالیزم ئەو تیۆرە یەهودیانەی سەدەکانی ناوەڕاستە کە باس لە خواوەند و گەردوون دەکات و تەنها خەڵکێکی زۆر تایبەتی توانیویەتی بیانبینێ و بیانخوێنێتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو سیستەمانەیە کە داهاتووی پێ دەبینرێ، یان مەبەست لە کار و کردەی سیحراویە.

2-ئێرمێتیك -*Ermetic*-واتە ئاڵۆزیی و تەمومژاویی لە زمان و دەربڕیندا، یان ئەوانەی کە سەر بەو ڕێبازە شیعریە ئیتالیە بوون کە ئەو ئاڵۆزییە خەسڵەتی سەرەکیان بووە.

# کۆمەڵگەی شارستانیو دەوڵەت
# لە پراکتیکی سیاسیی خۆرئاوادا

عەبدولباقی هرماسی
لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

## دەستپێك

مەسەلەی کۆمەڵگەی شارستانیو پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە, لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا سەریهەڵداوەو لەنیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەهەمیشدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوەو پاشتر بۆ ماوەی سەدەیەکی تەواو پاشەکشەی کردوە, ئێستاش ئەوەتا لە دوا سێیەکی سەدەی بیستەمدا لە ڕیزی پێشەوەی گفتوگۆی سیاسیدایە.

هەمیشە کۆمەڵگەی شارستانی تێۆریستی خۆی هەبوەو ناوەڕۆكو پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە لە گۆڕاندا بوە. شان بەشانی ئەم ڕەهەندە کاتدارو واتادارانەش, ڕەچاوی تایبەتمەندیی جوگرافیش دەکەین, چونکە چەمکی نوێی کۆمەڵگەی شارستانی وەك کیانێکی جیا لە دەوڵەت, سەرەتا لە دنیای ئەنگلۆسەکسۆنی سەریهەڵداوە, لەبەر ئەوەی پێچەوانەی ئەزموونی ئەوروپی, دەوڵەتێکی بەهێز لەئارادا نەبوە کە بتوانێ پانتاییەك داگیربکاتو دەستوپێوەندەکانی ناچاری ملکەچیی تەواو بکات.

لەناو ئەوروپا, چەمکەکە بەشێوەیەکی خێراتر لە ئینگلستانو فەرەنسا خەملی, بەپێچەوانەی ئەڵمانیاوە کە ئەو چەمکە تەقلیدییەی پاراست کە دەوڵەتو کۆمەڵگەی شارستانی لێك جیاناکاتەوە.

ئەم جیاوازیانەی دەرکەوتنی کاتدارو واتادارو جوگرافی, ناچارمان دەکات چەندین پرسیاری جۆراوجۆر و پێکەوە گرێدراو دەربڕین:

- مەبەستی نووسەر و تیۆریستەکان چییە, لە لێك جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی شارستانیو دەوڵەت؟
- ناوەڕۆکی ئەم چەمکە, بەپێی ڕۆژگار و ئاقارە فیکرییەکان, چۆن گەشەی کردوە؟
- چۆنو بە چ لۆژیکێك سەرهەڵدانو پاشەکشەی ئەم چەمکە لێکدەدەینەوە؟

- چۆن ئەوە لێكدەدەینەوە بزووتنەوەی جۆراوجۆر و پێك ناكۆك، لە بزووتنەوەكانی دژ بە ڕژێمە سەرتاپاگیرەكانەوە بیگرە تاكو بزووتنەوە موحافەزەكارە نوێكانو ئەو شەپۆلە دیموكراسییەی كۆمەڵگەكانی خوارووی تیخكردووە، ڕوویانكردۆتە پشتبەستن بەم چەمكە بۆ هێنانەدی ئامانجەكانی خۆیان.
- لە كۆتاییشدا، كاریگەریی ئەو بەكارهێنانانە چی بوون لەسەر چەمكەكە؟

## یەكەم: ئەوروپاو میراتی هیگڵی

بە بەراورد لەگەڵ بیریارەكانی پێشوو، وەك ئادەم فریگسۆن (*Adam Freguson*)، ئادەم سمیس (*Adam Smith*)، تۆماس پەین (*Thomas Paine*)و ئەوانی دیكەی وەك ئەلێكسس دی تۆكڤیل (*Alexis de Tocqueville*) كە كاریگەریان لەسەر سەردەمەكانی پاش خۆیان هەبوو، هیگڵ تاكە بیریارێك بوو بایەخێكی سەرنجراكێشی بە كۆمەڵگەی شارستانی نەداو پێوابوو "یەكەیەكی دەستەوەستاوە"و هەمیشە پێویستی بە چاودێریكردن هەیە لەلایەن دەوڵەتەوە. هاوشانی ئەگەری لادانەكانی دەسەڵات، هیگڵ تێڕوانینێكی سەبارەت بە چەمكی كۆمەڵگەی شارستانی خستەڕوو.

هیگڵ پێی وانەبوو كۆمەڵگەی شارستانی مەرجو چوارچێوەیەكی سروشتییە بۆ ئازادی، بەڵكو بە پانتاییەكی "ژیانی ئەخلاقی" دانا كە بەرهەمێكی مێژووییەو دەكەوێتە نێوان هەردوو دامەزراوی خێزانو دەوڵەتەوە. ئەو دەوڵەتەی ئابووری بازاڕ لەخۆدەگرێو پێكدێت لە چینە كۆمەڵایەتی، گروپە پیشەییەكانو دامەزراوەكانی تایبەت بە بەڕێوەبەرایەتی ئاستە جیاوازەكانو مافە شارستانیەكان. كەواتە كۆمەڵگەی شارستانی مۆزایكێكە پێكدێت لەو تاك، چین، گروپو دامەزراوانەی لەناو یاسای شارستانیدا ڕیزدەبەستن. ئەم مۆزایكەش لە دوائەنجامدا ڕاستەوخۆ گرێدراوی دەوڵەت نابێت.

بەو پێیە، كۆمەڵگەی شارستانی هەرگیز دەرهاویشتەی ژیانی سروشتی نەبوە، بەڵكو بەرهەمی نەشونماكردنی كۆمەڵێك گۆڕانكاریی مێژوویی درێژخایەنو ئاڵۆز بوە. چونكە كۆمەڵگەی شارستانی داهێنانی دنیای نوێیەو شێوازی ئەو پێداویستییانەی دەیخوڵقێنن، دابڕانێكی بنەڕەتیو بڕیاردەر پێكدێنن لە ژینگەی سروشتیدا.

لەلایەكی دیكەوە، دەبینین هیگڵ هەبوونی لێكچوونی پێویست یان هاوئاهەنگی نێوان توخمە جۆراوجۆرەكانی كۆمەڵگەی شارستانی دەرنابڕێ. چونكە هاوئاهەنگیی دامەزراو لەسەر بنچینەی خۆشەویستی شتێكە سەر بە دنیای خێزان، لەكاتێكدا ڕووداوەكان بەشێوەیەكی دی لەناو كۆمەڵگەی شارستانیدا ڕوودەدەن. با ئەوە وەبیربهێنینەوە كە سروشت لە فیكری تۆماس پەیندا، لە گشت ڕواڵەتەكانیدا، گرتبوونەوەیەكی هاوئاهەنگە. "لەبەر ئەمە، توخمە جۆراوجۆرەكانی كۆمەڵگەی شارستانی خۆڕسكانەو هاوئاهەنگانە تێكەڵ بەیەكو ئاوێتەی یەكدی دەبن"، بەڵام هیگڵ ئەم گریمانە سروشتییەو چەمكی ساویلكانەی ڕیشەكانی هاوسەنگیی كۆمەڵایەتیش ڕەتدەكاتەوە.

كۆمەڵگەی شارستانی هاوچەرخ، بە گوێرەی ململانێیەكی شڵەژاو دەچێت كە تیایدا بەرژەوەندییە تایبەتییەكان بەریەك دەكەون. چونكە كۆمەڵگەی شارستانی لە ڕوانگەی هیگڵەوە، كە تیایدا هەر تاكێك تەنیا سەرقاڵی پاراستنی موڵكی خۆیەتیو لە

کۆششدایە بۆ هێنانەدی خواستە تایبەتیەکانی خۆی، پێکهاتەیەکی نائارام، پەشۆکاو و شڵەژاوەو هەمیشە مەترسی تەقینەوەی لەسەرە. هەروەها پێکهاتەی کۆمەڵگەی شارستانی (ئەنجامی ئەوەی پێشەوە) دەبێتە قوربانی ململانێ و چینە کۆمەڵایەتییەکان، بەو جۆرەش دیمەنی "گشت جۆرەکانی ئاژاوەنانەوەی کۆمەڵایەتی و بێدەرەتانی و گەندەڵی" پێکدێت.

کۆمەڵگەی شارستانی هەرگیز ئەو گرتبوونەوە هاوئاهەنگە نەبووە کە تۆماس پەین و ئادەم سمیس بە زەمینەیەك بۆ هێنانەدی خواست و پێداویستیەکانی تاك دایاننناوە، هەروەها بوارێك نەبوە کە ئازادیی سروشتی تێدا پراکتیزەکرابێ، بەڵکو ئەو پانتاییە بوە کە ئازادیی واقیعی تیادا ونبوەو لە دەروازە نەزۆکەکانی بەرژەوەندیدا تواوەتەوە.

هیگڵ لە بیرکردنەوەی خۆیدا هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵدێنێ، بەلام ناگاتە ئەو ئاستەی بڵێ کۆمەڵگەی شارستانی دۆخێکە جەنگ جڵەوی دەکات و هەموو دژی یەکترن، چونکە بوارژوازیەت نەیتوانیوە وەها خۆی ڕێکبخات بگاتە ئاستێك کە شێوەیەکی تاڕادەیەك گەردوونی بەخۆوە بگرێ. بەم واتایە، کۆمەڵگەی شارستانی پانتاییەکە بۆ دامەزراوە ئازادەکان و گروپە پیشەییەکان و کۆمەڵەکان. ئەم دامەزراوانە، وێڕای جیاوازیان، ماڵی دوەمی بۆرژوازیەتن، چونکە بۆرژوازیەت دەتوانێ بەهۆیانەوە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی ڕێکبخات و چارەسەربکات و دەکارێ لە ڕێگەی دەستوورەکانیەوە هەندێ لە ململانێ بەرژەوەندخوازەکان هەڵوەشێنێتەوە.. بەلام ئەو ململانێیانەی کۆمەڵگەی شارستانی پێیاندا تێدەپەرێ هەمیشە هەڕەشە لە کۆمەڵگە دەکەن و دامەزراوە تایبەتە ئازادەکان، کە چاودێری بەرژەوەندییە بە کۆمەڵەکان دەکەن، هەردەم سەرکەوتوو نابن لە بەدوور ڕاگرتنی ئەو ململانێیانەدا.

تێگەیشتنی هیگڵی بۆ کۆمەڵگەی شارستانی جەخت لەسەر ئازادی و سەربەخۆیی ئەم کۆمەڵگەیە لە دەوڵەت دەکاتەوە، لەهەمان کاتدا سنوورێك بۆ ئەم ئازادییە لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنێ. وێڕای ئەوە کۆمەڵگەی شارستانی لە ڕێگەی دەوڵەتەوە نەبێ دانامەزرێ، چونکە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە ناکۆکییە ناوەکیەکانی کۆمەڵگەی شارستانی چارەسەربکات و ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگەی شارستانیشە ملکەچی دەسەلاتی دەوڵەت بێت. لە دوا شیکردنەوەدا، هیگڵ پێیوایە کۆمەڵگەی شارستانی دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتەوە کە سیستەمی ئاشتکردنەوەی ململانێکانە.

لە کاتی سەرهەڵدانی فیکری هیگڵەوە، هەنگاو بۆ ئەوە هەڵهێنراوە جیاوازی لەنێوان کۆمەڵگەی شارستانی و دەوڵەتدا بکرێت. کۆمەڵگەی شارستانی دەوڵەت نییە، بەلام لە ڕێگەی ئەوەوە نەبێ ناتوانێ خۆی بنوێنێ. لە دوائەنجامدا ئەم دوانە یەکەیەکی ئالۆزی ململانێ و یەك تەواوکردن پێکدێنن.

هیگڵ (لە خوێندنەوەی مارکسدا) جیاوازی دەکات لە نێوان کۆمەڵگەی شارستانی و دەوڵەتدا. هەروەها مارکسیش ددان بەم جیاوازییەدا دەنێت: "حەقیقەتێکی واقیعیە لە دەوڵەتی هاوچەرخدا". چونکە دەوڵەت، بەهۆی دامودەزگای بیروکراتی خۆیەوە، جیاوازی هەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی شارستانیدا، واتە مەرجی مادیی بۆ بوونی تاکەکان داناوە. کەواتە لەم بوارەدا چاکەکە بۆ هیگڵ دەگەڕێتەوە، کاتێ هەڵساوە بە شیکردنەوەی دەوڵەتی بروسی، ئەو دەوڵەتەی بە ژیاندنەوەی

دامودەزگایەکی بیروکراتی جڵەوی کۆمەڵگەی شارستانی کردوە.

دەبینین کارل مارکس دەگاتە ئاستی هێنانە ئاخاوتنی هیگڵ و وای لێدەکات (لەخوێندنەوەی مارکسدا) بڵێت: کۆمەڵگەی شارستانی تەنیا جیا لە دەوڵەت نییە، بەڵکو بەرەنگاریشی دەبێتەوە، دەوڵەت مانای نامۆبوونە. جیابوونەوەی کۆمەڵگەی شارستانی لە دەوڵەت و ڕزگاربوونی کۆمەڵگەی شارستانی لە دەسەڵاتی دەوڵەت، دوائەنجام دەبێتە هۆی دروستکردنی دۆخی کەرتبوون لەناو تاکدا" کەرتبوونی لایەنی مرۆیی و لایەنی هاوڵاتیبوونی، لایەنی ژیانی وەك هاوڵاتیەك و ژیانی وەك بۆرژوایەك. هەڵەی سیاسیی لیبرالیزم بە لای کارل مارکسەوە، بریتییە لە پاراستنی جیاکردنەوەی بواری گشت و تاك لە ژیانی واقیعی تاکداو هاوکات توانەوەیان لە نێو ژیانی سیاسیدا.

لەم گۆشەنیگایەوە، کارل مارکس خوێندنەوەیەکی دوولایەنە بۆ کۆمەڵگەی شارستانی دەکات: لەلایەکەوە ئەو کۆمەڵگەیە بە بناغەی واقیعی و ماددیی دەوڵەت دەژمێرێ و لەلایەکی دیکەشەوە بە دژی دەوڵەتی دادەنێ. کەواتە لای مارکس دوو واتە بۆ کۆمەڵگەی شارستانی بەدیدەکەین و دوو تیۆر بۆ دەوڵەت دەدۆزینەوە.

**لایەنی ئابووری:** کۆمەڵگەی شارستانی ئەو ژێرخانەیە کە قەوارەی سیاسیی دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت. بەم واتە سەرەتاییە، کۆمەڵگەی شارستانی کۆمەڵگەی بورژوایە کە لەلایەنی بزووتنەوەو ئەرکی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە سەیری دەکرێ. لەڕوانگەی کۆمەڵناسیشەوە، کۆمەڵگەی شارستانی لە مێژووی دەوڵەتی نوێدا کە مارکس لێرەدا نموونەیەك دێنێتەوە، دەوڵەتی بۆناپارتی (هێمایە بۆ ناپلیۆن بوناپارت) و دەوڵەتی بروسی، ئەو ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەیە کە پرۆسەی جیاکارەکردنی دەوڵەتچێتی (*Etatique*) دەیسەپێنێ. چونکە مارکس وتەنی، دەوڵەتی بۆناپارتی توانی خۆی لە کۆمەڵگە جیابکاتەوە. کەواتە کۆمەڵگەی شارستانی لە ڕوانگەی مارکسەوە، قەوارەیەکی هاوجووتە: لەلایەکەوە کۆمەڵگەیەکی شارستانی ئابوورییە و لەلایەکی دیکەوە کۆمەڵگەیەکی شارستانی سیاسییە. شیکردنەوەکانی گرامشی لە بنچینەدا پشت بەم چەمکە (واتە ناوەڕۆکی سیاسیی کۆمەڵگەی شارستانی) دەبەستن.

گرامشی بازی بەسەر مارکسدا داوەو گەڕاوەتەوە بۆ هیگڵ، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی شارستانی بەو پانتاییە ببینێ کە پێکدێت لە دامەزراوی تایبەتی و سەربەخۆ: کڵێساکان، خوێندنگەکان و سەندیکاکان.

گرامشی پێیوایە نابێ دەوڵەت تەنیا لایەنی سەرکوتکردن لەخۆبگرێت، بەڵکو پێویستە لە ڕووی یاساییەوە ئەو دامەزراوە ئازادانە بگرێتەوە کە ڕۆڵ دەبینن لە چەسپاندنی ئایدیۆلۆژیای باڵادەستدا. کەواتە کۆمەڵگەی شارستانی پانتاییەك نییە پێش دەوڵەت بکەوێت، بەڵکو "بناغە" و "ناوەڕۆکی ئەخلاقی"ی دەوڵەتە. هەروەها ئەو شوێنەیە کە دەوڵەت تیایدا ئەرکی باڵادەستبوونی ڕۆشنبیری و سیاسیی خۆی پراکتیزە دەکات. بەم واتەیە، کۆمەڵگەی شارستانی لە فیکری گرامشیدا، بوارێکی سیاسیشە و تەنیا لە بواری ئابووریدا قەتیس ناکرێ. واتە ئەو بوارەیە کە دامەزراوەکان ڕێکدەخات و پانتایی پێکهاتن و بڵاوبوونەوەی ئەو ئایدیۆلۆژیا جۆراوجۆرانەیە کە بەشەکانی جەستەی کۆمەڵایەتی پێکەوە دەبەستن.

تێگەیشتنی ئابووریی بۆ کۆمەڵگەی شارستانی، بریتییە لەوەی لێرەدا ئەم کۆمەڵگەیە شێوازێکی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری نییە، بەڵکو

سیستەمێکی کارپێکردنی ئەرکی ئایدیۆلۆژیو سیاسیی دەوڵەتە. مەسەلەکە لێرەدا پەیوەندیی بە گۆڕانی ڕاستەقینەی چەمکی تەقلیدیی کۆمەڵگەی شارستانییەوە هەیە، چونکە گرامشی لە لێکدانەوەی دامەزرێنەرانی ئەم چەمکە دوورتردەڕوات. ئەم گەشەکردنە واتە ادارە، گۆڕانی واتای چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی لە سەدەی بیستەمدا ڕادەگەیەنێ.

## دووەم: تۆکڤیل و هونەری دامەزراندنی کۆمەڵەکان لە ئەمریکا

پێش تێپەڕبوون بە سەدەی بیستەمدا، هەوڵدەدەین باسی بوارێکی ڕۆشنبیریی جیاواز بکەین کە بە یەکێك لە سەرچاوەکانی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی دەژمێررێت. لێرەدا ئەو چەمکە لەو لێکۆڵینەوە مەیدانییەوە پەلدەهاوێژێ کە ئەلێکسس دی تۆکڤیل لە کتێبی "دیموکراسی لە ئەمریکا"دا ئەنجامیداوە. چونکە ئەوەی سەرنجی دی تۆکڤیلی ڕاکێشابوو، کە لە فەرەنساوە هاتبوو، زۆریی کۆمەڵەکان بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها گرنگی ئەو ڕۆڵە جۆربەجۆرانە بوو لەناو کۆمەڵگەدا دەیانگێڕا. دی تۆکڤیل لە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەیدا (1839) نووسیویەتی: "ئەمریکییەکان لە هەموو تەمەنو شوێنو بنەچەکانەوە، خەریکی کۆمەڵە دروستکردنن. ئەوان تەنیا خاوەنی کۆمەڵەی ئابووریو پیشەسازی نین کە هەموو بەشداری تیادەکەن، بەڵکو جۆری دیکەی زۆری کۆمەڵەیان هەیە، جا ئایینیو ئەخلاقیی گرنگ بێت یان بێبایەخ، کۆمەڵەی گشتی بێ یان تایبەتی، کۆمەڵەی مەزن بێ یان زۆر بچووك. ئەمریکیەکان تەنانەت کۆمەڵە پێکدێنن بۆ ڕاپەڕاندنی ئاهەنگەکانو بنیاتنانی ئوتێلە گوندییەکانو بەرزکردنەوەی دیوارەکانی کڵێساکان. هەروەها کۆمەڵە پێکدێنن بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبو ناردنی پەیامبەران بۆ ئەوپەڕی دنیا، بەهەمان شێوەش نەخۆشخانەو زیندانو خوێندنگەکان دادەمەزرێنن. ئەوەش پەیوەندی بە ڕاستییەکی ڕوونەوە هەیە: ئەوان لە هەموو لایەنەکانی ژیانی خۆیانو هەموو بوارێکدا بەردەوام کۆمەڵە پێکدێنن. بۆیە لە لوتکەی دامەزراوێکی نوێدا، لە فەڕەنسا ئامادەیی دەوڵەت بەدیدەکەیت، لە ئینگلستان ئامادەیی دەرەبەگێك دەبینی، کەچی لە ئەمریکا جگە لە کۆمەڵەکان شتێکی دیکە نابینی.

لە وڵاتە یەکگرتووەکان کۆمەڵەی وام بینیوە کە بیرۆکەی دامەزراندنیان بەمێشکمدا نەدەهاتن. هەمیشە سەرسامبووم بەم هونەرە بێکۆتاییە کە وا لە ئەمریکیەکان دەکات ئامانجێك بۆ خۆیان دابنێنو بە کۆششی ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ ئازادانە هاوکاری بکەن بۆ هێنانەدی ئامانجەکە".

ئەوەی نووسەر دەیەوێ، لە ڕێگەی ئەم دەقەوە، ڕۆشنایی بخاتە سەر ئەو فرەتواناییە بێکۆتاییەی مرۆڤە بۆ هێنانەئارای کۆمەڵەکان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا. کۆمەڵەگەلێکی وەها کە مرۆڤ بەتەنیا دەستەوەستاوە لەئاست جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا، چونکە گرتبوونەوەی خۆویستو ئازادانە توانای مسۆگەرکردنی وزەی کاری مەزنی هەیە، بەوپێیەی ئەنجامدانی پڕۆژەکان ئامرازی گەورەی گەرەکە. چۆن دەتوانین ئەوە بەدەستبێنین؟ دەقەکەی پێشوو سێ شێوازمان بۆ دەخاتەڕوو: لە ئینگلستان دەرەبەگ ڕاستەوخۆ خاوەنی ئەو ئامرازانەیە، لە فەڕەنسا حوکمڕان پێشنیاری دەکات دەیسەپێنێ بەسەر هاوڵاتیاندا، کەچی لە ئەمریکا دەبینین ئەوە کۆمەڵەکانن ئەو ئامرازانە کۆدەکەنەوە.

تۆکڤیل لەلایەکەوە لەو بڕوایەدایە گەشەکردنی ژیوار لە ئێستاو داهاتوودا کەڵەکەبوونێکی زۆری ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و ڕێکخستن دەسەپێنێ, لەلایەکی دیکەشەوە پێیوایە گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لەئێستاو داهاتوودا ئەو ئامرازە کەڵەکەبووانە وردوخاش دەکات کە بەدەست خودی تاکەکانەوەن. جا لەبەرئەوەی گەشەکردنی ژیوار تەنیا گرێدراوی دەوڵەت یان کۆمەڵەکانە, بۆیە تۆکڤیل بنەڕەتیانە لایەنگیری ئەوەیە کۆمەڵەکان دەستپێشکەربن.

دەبێ کۆمەڵەکان هەموو پانتاییە چاوەڕوانکراوەکانی ناو کۆمەڵگە پڕبکەنەوە, ئەمەش ئەو نموونەیەیە کە پاڵی بە تۆکڤیلەوە نا ڕووبکاتە ئەمریکا بۆ دیراسەکردنی ئەم دیاردەیە کە خۆرئاوای ئەوروپا بەو هێزە بەخۆیەوە نەدیبوو: "هیچ شتێك هێندەی کۆمەڵە ڕۆشنبیری و ئەخلاقییەکان لە ئەمریکا سەرسامی نەکردوم. دەشێ دەرك بە کۆمەڵە سیاسی و پیشەسازییەکان بکرێت, بەڵام کۆمەڵەکانی دیکە لە هەموو دەستنیشانکردنێك خۆڕادەپسکێنن, تەنانەت ئەگەر توانیمان بشیاندۆزینەوە, ئەوا سەختە بتوانین دەرك بە ناوەڕۆکیان بکەین, چونکە نموونەیان لای ئێمە بەدیناکرێت. هەروەها دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەم کۆمەڵانە زیاتر لە هاوشێوە سیاسی و پیشەسازییەکانیان پێویستن بۆ گەلی ئەمریکا.

لە وڵاتە دیموکراسییەکان, هونەری دامەزراندنی کۆمەڵەکان گرنگترین گەشەکردنە, چونکە گەشەکردن لە هەموو بوارەکان گرێدراوی ئەو هونەرەیە. بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بتوانن شارستانیبوونی خۆیان بپارێزن یان شارستانیتربن, یەکێك لەو یاسایانەی جڵەوی کۆمەڵگە مرۆییەکان دەکات و لە یاساکانی دیکە وردکارترو ڕوونترە, یاسای هونەری دامەزراندنی ئەو کۆمەڵانەیە کە دەبێ هاوشانی پێگەیشتنی دەرفەتی یەکسانی نێوانیان لەناویاندا پەرەبستێنێ".

دەبێ سەرەتا بڵێین, تێڕوانینی تۆکڤیل سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەو مەترسیانەی کەلەپووری هیگڵی لەخۆی دەگرێ, ئەو کەلەپوورەی بەناوی بەرژەوەندیی گشتی و گەردوونییەوە بەهانە بۆ ئەوە دێنێتەوە کە دەبێ دەوڵەت جڵەوی کۆمەڵگەی شارستانی بکات. پشتئەستوور بە کتێبی "دیموکراسی لە ئەمریکا" و "ڕژێمی کۆن و شۆڕش", تۆکڤیل ئەو مەترسیانەمان بۆ ئاشکرادەکات کە هەڕەشە لە نەتەوە نوێکان دەکەن و لەڕوانگەی ئەوەوە بەری ململانێکان و ئاژاوەی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان نین, بەڵکو (جیاواز لەگەڵ هیگڵ) بەری ئەو شێوە نوێیەیە کە ئیستیبدادی نوێ بەبەری خۆیدا دەکات. جێی تێڕامانە, ئەو زەینەی هانی مرۆڤەکان دەدات پەنا بە ئامرازە دیموکراسییەکان بەرن بۆ بەرەنگاربوونەوەی نایەکسانی لە دەسەڵات و ساماندا, هەمان زەینە کە ئاسانکاری دەکات بۆ چەقبەستنی دەسەڵات لەلای دەوڵەت, چونکە ئەو کاتەی بەناوی گەل و یەکسانییەوە کار بۆ مسۆگەرکردنی ئاسوودەیی هاوڵاتیان دەکات, هاوڵاتیان بێ ئاگاداری خۆیان ڕووتدەکاتەوەو ئازادییان لێ زەوتدەکات. ئەم ئیستیبدادە نوێیە لە مێژوودا نموونەی نەبوە, بۆیە سەخت و گرانە لە ناوەڕۆکەکەی تێبگەین, بەتایبەتی کە کۆمەڵگە دیموکراسییە نوێکان بانگەشە بۆ لەناوبردنی ئیستیبدادی تەقلیدی دەکەن و ئەوە ڕادەگەیەنن کە هەڕەشەلێکراونین.

لەلایەکی دیکەوە, تێزەکەی تۆکڤیل هەمان تێزی "شۆڕشی دیموکراسیی مەزن"ە, ئەو تێزەی خۆراك دەداتە خرۆشانێکی بەهێز بۆ یەکسانی لە

دەسـەڵات و خاوەندارێتیـدا و دەیگـۆڕێ بـۆ دۆخـی ڕواڵەتکارانەی بەدناو: هەموو توێژە نەدارەکان بچنە گۆڕەپانی پێشبڕکێ و پارەپەیداکردنەوە، بۆ ئەوەی هـەموو بتـوانن لـە ڕێگـەی پرۆسـەیەکی دەسـتبەرداربوونی بەردەوامـەوە ئـەو شـتانە بەدەسـتبێنن کـە تـا ماوەیـەک لەمەوبـەر لەلایـەن توێژێکی کەمەوە پاوانکرابوون، ئەوەی تایبەت بوو بە توێژێك بڵاوبێتەوەو ببێتە دیاردەیەکی گشتی کە هەموو جیاکارەکردنێکی لەدەستداوە.

ململانـێ بەمەبەسـتی هێنانـەدی یەکسـانی و ئـازادی ناکۆکییـەکی نـاوەکی گـەورە لـەخۆدەگرێ. ئەمـە خـاڵێکی بڕیـاردەرە لـە فیکـری تۆکڤیلـدا. ئـەو پێیوایـە سـەردەمی نـوێ بـە جێگـۆڕکێی ڕۆڵـەکان جیاکارە دەکرێت: ئەوەی ململانێ بوو بۆ هێنانەدی ئـازادی و دژی شـێوازەکانی ئیسـتیبداد بـوو، هێنانـەدی ئاسـوودەیی بەپشـتگیریکردنی دەوڵـەت جێگەی گرتەوە، بەڵام ئەوەش ڕووی دا کە حکومەت بەناوی هێنانەدی دادپەروەریی دیموکراسییەوە بوە ڕێکخەر، چاودێر، ڕاوێـژکار، پەروەردەکارو دانەری سـزاکان لـە ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا. ئەمـەش مانـای خنکاندنی کۆمەڵگەی شارستانیە لەلایەن دامودەزگا بەڕێوەبەرەکانەوە.

ئیسـتیبدادی نـوێ گەشـە بـە ئـامراز و میکانیزمـەکانی چـاودێری و سـزادان دەدات و شارستانیانەیان دەکـات، ئەمـەش وادەکـات بـەلای هاولاتیانەوە لە ئیستیبدادی کۆن کەمتر بێزارکار و ڕیسواکار بن. بەو جۆرە دەبینین ئیستیبدادی نوێ، بە شێوازی ئاشتیانەو یشتئەستوور بەو یاسایانەی بەشـێوەیەکی دیموکراسـی دارێـژراون، هاولاتیـان دەکاتە مرۆڤی بێ ویست و خۆبەدەستەوەدەر، ئەمە لەکاتێکدا کە پێیانوایە دەسەڵاتێك هەیە شەونخونی دەکێشـێ بـەدیار هـەموو لایەنـەکانی ژیانیانـەوە: خێـزان، کـارو بـەکاربردنی ڕۆژانـە. بۆیـە دەبیـنین تۆکڤیل لەئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە ترسێکی زۆری لـێ نیشـتوەو تۆقیـوە لـەو ئاسـۆ نوێیـەی هەڕەشـەی لـەناوبردنی هـەموو دەسـتکەوت و ئامانجـەکانی شـۆڕش (ئـازادی، دادپـەروەری و یەکسـانی هـەموو هاولاتیـان) نیشـاندەدات. ئەمـەش یەکێکـە لـە گرفتـەکانی گەشـەکردنی دیموکراسـییە نوێکـان لـە سـەدەی دوایـیدا. شـایانی باسـە، تەنگوچـەڵەمەی سیاسـیی سـەرەکی لـە ڕۆژگـاری نوێـدا لێـرەوە سەرچاوە دەگرێ: چۆن دەشێ ئەو ڕەوتی یەکسانیە بپـارێزین کـە شۆڕشـی دیموکراسـی هێنایـەئاراوە، بەبێ ئەوەی ڕێگە بە دەوڵەت بدرێت دەسەڵاتی خۆی ڕەتبکات و ڕێگە لە هاولاتیان بگرێ ئازادیی خۆیان پراکتیزەبکـەن؟ بـۆ ئـەوەی ڕێگـە لـە لادانێکـی وەهـا بگـرین، دەبێ گەشە بەهەندێ میکانیزمی پێویست بدەین بەمەبەستی ڕێگەگرتن لەلایەنە خراپەکانی ئەو گەشەکردنەو چاودێریکردنی ئەنجامەکانی.

دەتـوانین لـە ڕێگـەی دابەشـکردنی دەسـەڵاتە سیاسییەکانەوە لەنێوان چەند لایەنێکدا، مەترسیی ناو دامەزراوەکانی دەوڵەت کەمبکەینەوەو سنووری بـۆ دابنـێین، چـونکە دەسـەڵاتی یاسـادانان بـەپێی هەڵبـژاردنی چـەند سـاڵ جارێکـەوە پێکـدێت، دەسـەڵاتی بـەڕێوەبردنیش جیـاوازەو دادگایـەکی سـەربەخۆش لەئارادایـە. ئـەم دابەشـکردنەی دەسـەڵاتەکان ـــ وەك مۆنتسـکیو لـە سـەدەی هەژدەهەمـەوە فێـری کـردوین ـــ دەتوانـێ مەترسـییەکانی ئەگـەری ئیسـتیبدادی سیاسـی کەمبکاتـەوە، بـەڵام هـەبوونی سانسۆری سیاسی بۆ بەرەنگاربوونـەوەی ئەگـەرەکانی ئیسـتیبدادی سیاسی، پێویستە بوونی ئەو کۆمەڵە شارستانیانە بـەهێزی بکـات کـە خـۆ لـە سانسـۆری حکومەت ڕادەپسکێنن.

تۆکڤیل هەمیشە وتەیەکی دووبارە دەکردەوە کە ئەمــە پوختەکەیــەتی: دەبــێ کۆمەڵگــە چــاوێکی پشکنەر و سەربەخۆی هەبێت, ئەم چاوە پشکنەرە گرووپێك کۆمەڵەی شارستانین کە هەمیشە بەئاگان و بـــەپێی ڕێکخســـتنێکی خـــۆیی دامـــەزراون. ئەمــەش پێداویســتیەکی گرنگــە بــۆ بــەهێزکردنی شۆڕشی دیموکراسی.

## سێیەم: سەرهەڵدانەوەی چەمکەکە لە سەدەی بیستەمداو ڕەهەندەکانی

بــەکارهێنانی چــەمکی کۆمەڵگــەی شارســتانی هەتاکو ماوەیـەکی درەنگـی سـەدەی بیستەم جۆرێك لە سستی بەخۆوە دی و ماوەیەك بەکارهێنانی ئەو چـەمکە لـە فەرهـەنگ و گفتوگـۆی فیکریـدا بەگشـتی پەنهانبوو, کەچی ئێستا دەبینین ئەو چەمکە بەسەر گفتوگۆکانـدا زاڵـە. ئەمــەش پێویسـتی بــەوە هەیــە بپرسین: هـۆی ئـەو پـەنهانبوون و سسـتییە و ئینجا سەرهەڵدانەوەی چەمکەکە چی بووە؟

لێرەدا بڵاوبوونەوەی زاراوەسازیی مارکسیستانە هۆکـارێکی پڕاوپـڕ نییــە بـۆ ئــەو پشتگوێخسـتنە لەلایــەن فیکــری لیبرالیســتانەوە, چــونکە خــودی مارکسیســتەکان کــە دابەشــبوون بەســەر زەینــی مارکسیســتانە و ئیجتهــادی گرامشــیانەدا, ئیمــڕۆ ڕەوتـی دەستبەرداربوون لـە ئیشـکالیەتی دەوڵـەت و کۆمەڵگەی شارستانیان گرتۆتەبەر. نووسەر فرانسوا ڕۆنجــۆن (*Francois Rangeon*) چــەندین گریمانــە دەخاتـــەڕوو بـــۆ لێکدانـــەوەی کەمبوونـــەوەی بەکارهێنانی زاراوەی کۆمەڵگەی شارستانی, لەوانە: ڕەخنەگرتن لە ئیشکالیەتەکە لـە بنچینەوەو تێپەڕین لــە دیراســەکردنی پەیوەندییــە ئاڵۆزەکــانی نێــوان دەوڵـــەت و کۆمەڵگـــەی شارســـتانییەوە, بـــۆ دیراســەکردنی پەیوەندییــەکانی ئــەو دەســەڵاتە کــە کۆمەڵگــەی شارســـتانی و دەســـەڵات پێکـــەوە تیخدەکات. هەروەها گریمانەیەکی دیکەش هەیـە کـە سەرهەڵدانەوەی ئیشکالیەتەکە لێکدەداتەوە, ئەویش ســەرهەڵدانی دەوڵــەتی یاســایە کــە دەبێتــە هــۆی گومــانکردن بــە ڕاسـتبێژیی ئاخــاوتن ســەبارەت بــە کۆمەڵگەی ناسیاسی.

دەبێ لێرەدا ئەو هەوڵانە بخەینەڕوو کە لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا بوە هۆی نەهێشتنی جیاوازی نێــوان دەوڵــەت و کۆمەڵگــەی شارســتانی, ئەمــەش لەڕێگەی ستراتیژگەلێکی سیاسییەوە کە خوازیـاری ڕەتکردنــەوەو لــەناوبردنی ئــەو دەوڵەتــەن کــە هەیــە, چـــــــونکە دەوڵەتێکـــــــە "ســـــــەرمایەداری" بەرجەستەدەکات. ئـەوەی جێـی سـەرنجە, تێۆرەکـەی گرامشــی و ســتراتیژە سیاســییەکانی لــە ســەردەمی فاشــیزمدا, دەکەونـــە نـــاو ئـــەم چوارچـــێوەیەوە. نۆربێرتۆ بۆبیو (*Norberto Bobbio*) ئەمـەی بـەڕوونی خســتۆتەڕوو و پێیوایــە گرامشــی وەفــاداربوە بــۆ ئامـــانجی مارکســـیزمی کلاســـیکی: خوڵقانـــدنی کۆمەڵگەیـــــەکی شارســـــتانی کۆمۆنیســـــتانەی ناچـــینایەتی کـــە تیایـــدا دەوڵـــەت و کۆمەڵگـــەی شارستانی لێك جیاکرابنەوە. واتە خوڵقاندنی ئەوەی گرامشی ناویدەنێ کۆمەڵگەی ڕێکوپێك کە ئامانجی بـاڵای خـەباتی کرێکـاریی ڕابەرایـەتیکراوە لەلایـەن حیزب و ڕۆشنبیرانەوە, بۆ خوڵقاندنی باڵادەستییەك دژ بە بۆرژوازیـەت لەناو کۆمەڵگەی شارستانیدا کە بـە تـوخمی پەیوەنـدیی نێـوان ئـابووریی لـە ڕووی چـینایەتی ڕێکخـراوو دامـەزراوەکانی دەوڵـەت کـە پشـت بـە هێـز و زۆربۆهێنـان دەبەسـتن. ئاشـکرایە گرامشی لەناو مارکسیستەکانی تردا بەوە بەناوبانگ بوە کە دژی ستراتیژگەلی کودەتاخوازی ڕاستەوخۆ بـوە, ئـەوەی مارکسیسـت لێنینیسـتەکان پێڕەویـان

دەکــرد. چــونکە گرامشــی پێیوابــوو شــەڕی شــوێنەوارەکان ئــامرازێکی چــاکترە بــۆ لێــدان/ لــەناوبردنی دەســەڵاتی بۆرژوازیــەت لەناوجەرگــەی ماڵی خۆیدا، واتە لە گۆڕەپانی ئابووریو سیاسیدا، لەبەرئـەوەی بەدەسـتهێنانی دەسـەڵات لەلایـەن چینە میللییەکانـەوە پـێش هـەموو شـتێك بەشـێوازێکی سـەرەکی لـەناو کۆمەڵگـەی شارسـتانیو بـە گـۆڕانی ئەو کۆمەڵگەیە بەدی دەهێنرێت.

شـەڕی شـوێنەوارەکان لەلایـەن پرۆلیتاریـاوە کـە دڵسـۆزانەو وردکارانـە ڕابەرایـەتی دەکـرێ، توانـای پێکهێنــانی کۆمەڵگەیــەکی کۆمۆنیســتانەی هەیــەو دەشــێ نموونەیــەکی گــەردوونی بێــت، ئەمــەش لــە مەترســـییەکانی کۆیلـــەکردن بـــەدووردەگرێ کـــە ئـەنجامی شـەڕی بـزۆك یـان هێرشـی ناڕاسـتەوخۆو کتوپڕ بۆ سەر دامودەزگاکانی دەسەڵات دێنەئاراوە.

ئاشـکرایە گرامشـی بـەرەنگاری سـتراتیژییەکانی بۆلشــــەفیکەکان دەبــــوەوە، ئــــەوەش بــــەهۆی بەدەســتهێنانی دەســەڵات لەڕێگــەی بــەکارهێنانی هێـــزەوە. بۆیـــە تێورەکـــەی بـــە ڕوخۆشـــی یـــان بەزەییهاتنـەوە بـە هێـزی شارسـتانیو ڕێزگرتنـی ئەوانی دیو یاسا ناسرابوو.

پرسـیارەکە لێرەدا: کـوا ئـەو سـتراتیژییەو چۆن ئیمڕۆ دەتوانین دایمەزرێنین؟

ســـەرەتا ڕەچـــاوی ئـــەوە دەکـــەین بـــارودۆخی ئــابووریو کۆمەڵایــەتی ئــەورووپای خۆرئــاوا، لــە ڕۆژگارەکــانی گرامشـــییەوە، گـــۆڕانی درامـــاتیکی بەســـەردا هـــاتووە: هەڵوەشـــانەوەی بزووتنـــەوە کرێکارییـــەکان، ژێرکـــەوتنی ئـــەوەی بـــە نـــاوکی تونـدوتۆڵی چینی کرێکـار دەژمێـراو پەرەسـەندنی بزووتنـەوە کۆمەڵایەتیـە نوێکـان، ئـەنجامی ئـەوەش گومـان بەرامبــەر بــە بــڕوای گرامشـیانە بــە چـینی کرێکـاران دروسـتدەبێت، ئـەو چینـەی بـەلای ئـەوەوە "چـینی سـەرەکی"(*La Classe Fondamentale*)یـەو دەشـــێ گـــرنگترین ڕۆڵ ببینـــێ لـــە شۆڕشـــی دژی سـەرمایەداریدا. بۆیـە پێویسـتە شـیکردنەوەی پـاش گرامشی بۆ چەمکی کۆمەڵگـەی شارسـتانی ڕەچاوی ئــەو گەشــەکردنە نوێیانــە بکــات، بــەلای کەمــەوە پێکەوەبەستنی تواناکانی چینی کرێکاران بە توێژو بزووتنەوەکانی دیکەوە.

هەروەها بڕوای گرامشی بە ڕۆڵـی پێشڕەوایەتی/ ڕابەرایــەتیکردنی حیزبــی کۆمۆنیســت سەرچــاوەی ئیشـکالیەتە، چـونکە ڕەچـاوی ئـەوە ناکـات بـوونی تاکـەحیزب پرۆژەیـەکی سـەرتاپاگیرەو دەبێتـە هـۆی ســـەرهەڵدانی ئیســـتیبداد. هـــەروەها گرامشـــی زیادەڕۆیـە لەمـەڕ توانـای ئـەو حیزبانـە بـۆ توانـەوەی کۆمەڵگەی شارستانی لەنێو ڕیزەکانی خۆیانـدا، بـەو جــۆرەش بزووتنـــەوەو ســـتراتیژییەکانی دی بـــۆ دیمــــوکراتیزەکردنی کۆمەڵگــــە لــــە دەرەوەی تاکەحیزبێك پشتگوێدەخات.

لە کۆتاییشدا، پشتبەستنی گرامشی بـەو تێزەی مارکسـیزم کـە پێویسـتیی لـەناوبردنی دەوڵـەتو بـەو پێیـەش کۆمەڵگـەی شارسـتانی دەردەبـڕێ، جێگـەی تێبینـی کۆمەڵناسـیانەو سیاسـیانەو بەهاخوازانەیـە، چـونکە پێدەچـێ بایەخـدانی ئـەو بـە کۆمەڵگـەی شارســـتانی لـــە دوائەنجامـــدا بایەخـــدانێکی هەلپەرسـتانە بێـت، بـەو پێیـەی وەك پێکهاتەیـەکی کاتیو ناپێویست دەڕوانێتـە پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی دامـەزراو، لەبەرئـەوەی داهـاتوو ملکەچـی پێوانـەی کۆمەڵگەی ئاڵۆزە.

ســـەیرکردنی کۆمەڵگـــەی ســـەرمایەداری، وەك کۆمەڵگەیـەکی بارگـاوی بـە ناکۆکییـەکی بنچینەیی، هەروەها دەربڕینی ئەوەی تـەنیا بکـەرێکی بەختـەوەر هەیـە دەتوانـێ مێـژوو بەرەوپێشـەوە بـەرێت، هـەموو ئـەم بۆچـوونو تێڕوانینانـە نـاکۆکن لەگـەڵ واقیعـی

کۆمەڵگەی سەرمایەداریی هاوچەرخدا کە ڕووی لە ئاڵۆزبوون و جیاوازی کردوە. ئاشکراشە هەموو هەوڵدانێك بۆ ژێراوژوورکردنی ئەم پرۆسەی جیاوازییەو یەکخستنی دەوڵەت و کۆمەڵگەو تەماهیکردنی تەواو لەگەڵ هەریەکێکیان ئەنجامی سەرتاپاگیرانەی لێ کەوتۆتەوە.

بێگومان ویستی لێکدانەوەی هاتنەوەئارای چەمکەکە پێویستە گرێدرێتەوە بە کۆمەڵێك توخمی بنچینەییەوە کە بایەخیان بە گەشەکردنی کۆمەڵگەو فیکر هەیە لە دوا سێیەکی سەدەی بیستەمدا.

## ڕەخنەگرتن لە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی

سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئابووریی سەرمایەدارییانەی ئەورووپی و ئەو بارودۆخەی پاش جەنگ، واتە بارودۆخی نوێ خستییەوە، وایان لە خەڵك کرد بەگومانبن بەرامبەر بە توانای دەوڵەتی خۆشگوزەرانی لە بواری دابینکردنی پێداویستییە بنچینەییەکاندا، بەتایبەتی توانای هێنانەئارای ئاستێکی دادپەروەرانەی کارپێکردن، چونکە شکستیەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی "کینزیانە" بوە هۆی خوڵقاندنی کۆمەڵێك ناکۆکی بنچینەیی کە مەسەلەی جیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانیان هێنایەوە پێشەوە. گرفت و تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی ئەم دەوڵەتەش بوونە هۆی سەرهەڵدانی بێبڕواییەکی زۆر و گومانکردن بە بیرۆکرات و تەکنۆکرات و پسپۆڕەکان، هەروەها بوە هۆی هاتنەخوارەوەی ڕەوایەتیی هەریەکێك لە سۆسیالیزم و بەرنامەکانی دیموکراسییە کۆمەڵایەتییەکان. بێگومان ئەوەی زۆرتر ئەم گرفتانەی لە بەرژەوەندیی خۆیدا بەکاربرد، موحافەزەکارە نوێکان بوون کە سووربوون لەسەر دەربڕینی خراپی دەستێوەردانی دەوڵەت لە بازاڕی تایبەتی (بەواتای فراوانی مانای بازاڕ) کۆمەڵگەی شارستانی، چونکە ئەو موحافەزەکارە نوێیانە هەموو تێکشانەکان دەگێڕنەوە بۆ دەستێوەردانی دەوڵەت، بۆیە بانگەوازی ئازادکردنی هێزەکانی بازاڕیان لە بوارەکانی وەك تەندروستی و فێرکردن و هاتوچۆدا ڕاگەیاندوە. ئەمەش بەلای ئەوانەوە مانای تایبەتیکردن و کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئەو دامەزراو و خزمەتگوزارییانەیە کە دەوڵەت خاوەنیانە یان دەوڵەت پشتگیریان دەکات. هەروەها سنووردانان بۆ ڕۆڵی سەندیکاکان لەپێناو خوڵقاندنی هێزێکی کاری ملکەچ و هاوکاردا کە دەشێ لە ڕووی جوگرافییەوە بە ئاسانی بگوێزێتەوە.

لە ڕاستیدا موحافەزەکارە نوێکان داوای کەمکردنەوەی هەنگاوبەهەنگاوی پایەی دەوڵەت دەکەن، چونکە هێشتا پێیانوایە دەوڵەت ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دیاریکردن و بەڕێوەبردنی یاساکانی پێشبڕکێی ئابووریدا. بۆیە ئەوان داوای دەوڵەتێکی بەهێز دەکەن، بەڵام بە دابەشکردنی پایەکان لە هەندێ کاردا.

وێڕای ئەوانە، ئاقار/ ڕەوتی موحافەزەکارانەی نوێ، لەلایەن داکۆکیکاران لە دەوڵەتی خۆشگوزەرانییەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توندوتیژ بووەوەو یەکێك لەوانە: پیار ڕۆزنڤالۆن (*Pierre Rosanvallon*) بوو کە پێیوایە تەنگوچەڵەمەی ئابووری ئێستای دەوڵەت، چەندین پرسیاری بنچینەیی و قووڵ سەبارەت بە شێوەو سنوری دەسەڵاتی دەوڵەت و پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگەی شارستانی دەخاتەڕوو، بەڵام لەو بڕوایەدایە کە ئێستا ستراتیژی باڵادەست، جا لە بەتایبەتیکردنی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیدا بێت یان پاراستنیدا،

گرێدراوی مۆدێلێکی سیاسییە کە حەز بەبوونی ناکرێت.

بێگومان دەربڕینی (تا ڕادەی بتپەرستیی) سەرەتاییبوونی پێشبڕکێ لەنێوان تاکەکانی بازاڕو خستنەڕووی بڕوای بێسنوور بە دامودەزگای دەوڵەت، دوو دەربڕینی ڕووبەڕووی یەکترن، بەڵام تەواوکەری یەکتریشن. چونکە هەردووکیان کار بۆ ئەوە دەکەن هانی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگەی شارستانی بدەن. بۆیە هیچ یەکێك لەوانە توانای وێناکردنی بەهێزبوون و چڕبوونەوەی ئەو پەیوەندیانەی نییە.

بەو جۆرە ڕۆزنڤالۆن ئەرکێکی بنچینەیی بۆ قۆناغی ئێستا پێشنیاردەکات، ئەویش هێنانەئارای کۆمەڵگەیەکی شارستانییە کە لەلایەن دەوڵەتەوە مسۆگەرکراوەو خاوەن چڕییەکی بەرز/ گەورەو توانایەکی زۆرە بۆ بەپیرەوەچوونی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان، لە ڕێگەی تۆڕی داکۆکیکردنی دوولایەنەوە. ئەمە لەبری دابڕینخوازیو خۆبەستنەوە بە یەکێك لە پۆڵەکانەوە: بازاڕ یان دەوڵەت. بەمەش تێزی موحافەزەکارانەی نوێی نادادپەروەرانەو وردوخاشکارانە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕەتدەکاتەوە یان وەلاوەدەنێ. بەو جۆرە ڕەخنە لەو تێزەی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی دەگرێت کە پێیوایە خزمەتگوزارییە تایبەتییەکان بەپێویست هاوواتای بازاڕ و قازانج، واتە نایەکسانی دەبن. وەك ئەوەی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان نەتوانن پێبڕکێ لەگەڵ دەوڵەتدا بکەن، چونکە ئەو خزمەتگوزاریانە تەماهی دەکەن لەگەڵ ڕۆڵی ئەودا وەك دەوڵەتێك و پەیوەندیی سروشتیشی پێوەی وەك تاکە ڕێگەیەك بۆ یەکسانیو وەلاوەنانی خواستی قازانجکردن. لەبری ئەوە ئامانجێتی بگاتە چەندین جۆری جیاوازی میکانیزم بۆ بڕیارسازیی گشتی لەپێناو دابینکردنی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکاندا. لە نووسینەکانیشیدا پشت بە تێزێکی سێ ڕەهەندی دەبەستێ:

- کەمکردنەوەی پێویستیی پشتبەستن بە داهاتی دەوڵەت.
- خوڵقاندنی جۆرێك لە ڕێکەوتن لەنێوان خاوەن کار و کرێکاراندا.
- فراوانکردنی شێوازەکانی هاوپەیمانێتی دیموکراسی لەناو خودی کۆمەڵگەی شارستانیدا.

## سەرهەڵدانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان

کاتی ئاخاوتن دەربارەی سەرهەڵدانەوەی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی، نابێ ئەوەمان لەیادبچێت کە دەبێ هێما بۆ سەرهەڵدانی شتێك بکەین پێیدەوترێ بزووتنەوە کۆمەڵایەتیە نوێکان، چونکە سالانی ڕابردوو لە ئەوروپای خۆرئاوا چەندین شێوازی نوێی کارکردنی بەکۆمەڵ سەریانهەڵداوە. لەوانە بەتایبەتی: هەڵمەتەکانی بەناوی مافە شارستانیەکانەوە، بزووتنەوە خوێندکارییەکان، هەروەها بزووتنەوە ئاشتیخواز و ژینگەخواز و فیمینیستیەکان. ئەم بزووتنەوانە جێی ڕەزامەندیی چینە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانن و بایەخێکی زۆر دەدەنە شێوازەکانی ڕێکخستنی خوارەوەو ڕێکخستنە نارەسمییەکان کە تەریبن بە کەناڵە ڕەسمییەکان و ڕوودەکەنە هاوکاری نەکردن لەگەڵ ڕێکخراوە تەقلیدییەکاندا، وەك حیزب و سەندیکا بیرۆکراتیەکان و لە بنکەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەدا کاردەکەن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم بزووتنەوانە لە بنکەی فراوانیاندا لە دەرەوە یان دوور لە دامەزراوە

باڵادەستەکانی کۆمەڵگەو دەوڵەت پێکدێن, بۆیە پرسیارگەلی گرنگ سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردن و ڕادەی ڕەوایەتی پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەسەر ئاستی گشتی دەخەنەڕوو. هەروەها ئەم بزووتنەوانە بەو پێیەی دەربڕی پێوەنالاندن و شڵەژانەکانی ژیانی ڕۆژانەن, بەرەنگاری شێوازەکانی کاری ڕەسمی ناو کۆمەڵگەو دەوڵەت دەبنەوەو لە دەرەوەی ئەوانە کاردەکەن... جا لەبەر ئەوەی ئەوانە لە دەرەوەی سیاسەتی ڕەسمی ئیشدەکەن و پشت بە تۆڕێکی نەبینراوی گروپی بچووکی نقومبوو لە ژیانی ڕۆژانە دەبەستن, بۆیە ئەم شوێنەوارەی دەرفەتی دەداتێ بەرەنگاری پێوانەو بەهاو سرووتە باوەکانی ژیانی ڕۆژانە ببنەوە, بەوەش کەلێنی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانی قوڵدەکەنەوەو بەشداری دەکەن لە بنیاتنانی شێوازی نوێی هاوکاری و بڵاوکردنەوەو چڕکردنەوەی پلورالیزم لەناو خودی کۆمەڵگەی شارستانیدا.

## کاریگەریی گۆڕانکارییەکان لە بلۆکی سۆسیالیستیدا

ئەوەی لەم ماوەیەی دواییدا بەشداری کرد لە چڕکردنەوەی گوتار دەربارەی کۆمەڵگەی شارستانی, خەباتکردن بوو دژی مۆدێلی سەرتاپاگیر لە وڵاتە سۆسیالیستیەکاندا. لێکۆڵەرانی ئەوروپای ناوەڕاست و خۆرهەڵات ڕەچاوی ئەوەیان کردوە, شێوازە سەرتاپاگیرەکان ئەوکاتە دەتوانن ئارامیی خۆیان بپارێزن کە سەرکەوتووبن لە جڵەوکردنی کۆمەڵگەی شارستانیدا, ئەمەش لەڕێگەی تۆقاندن و پاڵنانەوە ڕووەو بێموبالاتی. بۆیە کاتێک کۆمەڵگەی شارستانی سەرکەوتوودەبێت لە بەدەستهێنانی بڕوابەخۆبووندا, ئەوا ئەو دەوڵەتانە دەسەڵات لەدەستدەدەن و ئامانجی لەقاڵبدانیان ئاشکرادەبێ.

لە کتێبێکدا, کە لەم دواییەدا میکلۆس مۆلنەر (*Miiklos Molnar*) دەربارەی پۆلۆنیا و مەجەرستان نووسیویەتی, ئەوە بەدیدەکەین کە وێڕای نیو سەدە باڵادەستیی تاکەحیزب ئەو کۆمەڵگانە سەرکەوتووبوون لە بەدەستهێنانەوەی ئەو دەسەڵاتەی بەزۆر لێیان زەوتکرابوو" ئەوەبوو لە پۆلۆنیا کڵێسای کاتۆلیکی و سەندیکای هاوکاری (*Solidarnosc*) سەرکەوتووبوو لە سەرلەنوێ بووژاندنەوەی کۆمەڵگەی شارستانیدا.

لە مەجەرستان دۆخەکە جیاواز بوو, بەڵام هەردوو وڵاتەکە خاوەنی تۆڕێك کۆمەڵە بوون کە سەربەخۆبوون لە دەسەڵاتە سیاسییەکان. لە مەجەرستان بەپێی ئاماری 1931 (16747) کۆمەڵە تۆمارکراوە, زۆربەیان کاتی هاتنەسەرکاری دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیست لەناوبراون و پاش تێخزانی ستالینیستانە تەنیا (225) کۆمەڵە لەئارادامابوون, ئەمە بێ ژماردنی کۆمەڵە ڕەسمیەکان. ئەم کۆمەڵانە یەکسەر دوای نەمانی فشار لەسەریان هێزی خۆیان بەدەستهێنایەوەو شوێنەواریان هەمیشە لە فراوانبووندابوە. گرنگترین و دیارترین ڕووداو بڵاوبوونەوەی دیاردەی زانکۆ گەڕۆکەکانە لە پۆلۆنیا, کە توانی ئەو مێژووە ڕاستە بگەیەنێ و بڵاوبکاتەوە کە سیستەمی ڕەسمی سوکایەتی پێکردبوو و ڕەتیکردبوەوە.

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کۆمەڵگە یان بزووتنەوەی هاوکاری تەنیا شوێنی حیزبی کۆمۆنیستی کلۆربووی گرتبۆوە؟ بێگومان ئەوە بەس نەبوو تێکۆشەرەکانی هاوکاری نووسینگە

بەتاڵەکانی حیزبی کۆمونیست پڕبکەنەوە, بەڵکو گرنگتر ئەوەبوو کۆمەڵگە توانای بەکارهێنانی ئامرازە گرنگەکانی خستنەگەڕی دیموکراسی لەدەستنەدات و سەرکەوتووبێت لە بەردەوامیدان بەو کارە. واتە نووسەر وتەنی, سەرلەنوێ بتوانێ ببێتە (ئەو دەسەڵاتەی دەسەڵات پەکدەخات *Le pouvoir qui arrete le pouvoir*).

## کۆتایی

ئیمڕۆ هەموولایەك, لە سیاسییەکانەوە تاکو ڕۆژنامەنووسەکان, لە ڕاستەوە بۆ چەپ تا دەگاتە بیریارەکان, بە جیاوازیی ئاقارەکانیانەوە, ڕوویانکردۆتە بەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی. ئەو چەمکە بۆتە چەقی ئەندازیاری پێکگەیشتنی گشت فیکرەکانی دژ بە دەوڵەت. هەروەها جۆرێك یۆتۆپیاخوازی لە بەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانیدا سەریهەڵداوە, وەك ئەوەی لە لۆژیکی بازاڕ و پێشبڕکێوە گۆڕابێت بۆ لۆژیکی خۆڕسکبوون و هاوکاریی و پێکەوە ژیان.

دەشێ ئەوەی چەمکەکە لە فرانبوونی بڵاوبوونەوەدا بەدەستی هێنابێ لە سەر ئاستی وردکاری لەدەستیدابێ. چونکە هەڵسەنگاندنی پۆزەتیڤانەی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی گۆڕیویەتی بۆ جۆرێك ئەفسانەی سیاسی, هەرکەسێك بانگەوازی دەستپێشکەریی تایبەتی ڕاگەیەنێ پەنای پێدەبات, هەروەها هەرکەسێك بانگەوازی هاوکاریی و خۆبەڕێوەبردنی ڕاگەیەنێ ڕووی تێدەکات, حکومەتەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسییە ناوخۆکان پشتی پێدەبەستن و بزووتنەوەکانی ئۆپۆزسیۆن لە ململانێی خۆیاندا لەگەڵ دەسەڵاتی دامەزراو پەنای پێدەبەن.

بۆ ئەوەی فیکر بتوانێ ڕەخنەگرانە بێت, پێویستە چەمکەکە بخاتە ژێر لێوردبوونەوەیەکی پێویستەوە, تا بزانین مەبەست لە کۆمەڵگەی شارستانی چییە؟ ئایا مەبەست لەو چەمکە قەوارەیەکی دیاریکراوە؟ یان وەك ئامرازێکی شیکردنەوە دەخرێتەگەڕ؟ یاخود وەك ئەفسانەو یەکێك لە شێوازە یۆتۆپییە سیاسییەکان پەنای پێدەبرێ؟

## سەرچاوەکان


*Bobbio, Norberto. "Gramsci and the Concept of Civil Society." In: John Keane (ed.). Civil Society and the State. London; New York: Verso, 1988, pp. 73-99.*

*Chatelet, Francois. Hegel. Paris: Seuil, 1968. (Ecrivains de toujours; 80)*

*Gramsci, Antonio. Gramsci dons le texte. Paris: Editions Sociales, 1977.*

*Hegel, Georg Wilhelm Friedrich. Le Droit naturel. Traduit de Iallemand, preface et annote par andre Kaan. Paris: Gallimard, (1972). (Collection idees; 255), p. 119.*

*Marx, Karl. Le Dix - huit brumaire de Louis Bonaparte. (Paris): Pauvert, 1984. P. 274.*

*Molnar, Miklos. La Democratie se leve a lest: Societe civile et communisme en Europe de lest: Pologne et hongrie. Paris: Presses universitaires de France, 1990.*

*Rangeon, Francois. "Societe civile: Histoire dun mot." Dans: Colloque sur la societe civile. Paris: Presses universitaires de France, 1986.*

*Rosanvallon, Pierre et Patrick Viveret. Pour une nouvelle culture politique. Paris: Seuil, 1977.*

*Stone, John and Stephen Mennell (eds.). On Democracy, Revolution and Society. Chicago, Ill.: University of Chicago Press, 1980.*

*Tocqueville, Alexis de. De la democratie en Amerique. Tome 2.*

## تێبینی

–ئەم بابەتە لە کتێبی "کۆمەڵگەی شارستانی لە نیشتمانی عەرەبو ڕۆڵی لە هێنانەدی دیموکراتیدا: توێژینەوەو گفتوگۆکانی ئەو دیدارە فیکرییەی ناوەندی دیراساتی یەکگرتنی عەرەب" وەرگیراوە کە لە بەیروت/ لوبنان ئەیلولی 1992 چاپی یەکەمی بڵاوبۆتەوە.

# مارسیل پروست و (من – *Le moi*)ی ناجێگیر و هەمیشە گۆڕاو

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید

## "منێکی تر"

مارسیل پروست لە –*contre sainte - Beuve*– هێرشی کردە سەر "میتۆدە بەربلاوەکەی" ڕەخنە کە بەپێی ئەو بەرهەمی نووسەر بەر لە هەموو شتێك بریتییە لە ڕەنگدانەوەی ژیانی و لەو ڕێگەیەشەوە دەتوانرێ تاوتوێ بکرێ. لە ڕاستیدا هەستی ئەفراندن هەرچەند ئاڵۆز و دەوڵەمەند بێت ئەوەندەش کەم دەگەڕێتەوە بۆ پێدراوە ڕووکەشەکانی بیۆگرافیایەك: "پروست دەڵێ کتێب بریتییە لە بەرهەمی – منەکەی تر، *autre moi* – کە لەمیان دابونەریتی کۆمەڵگە و نەنگییەکانماندا دەردەکەوێ". کەوابێ بەمجۆرە ناخی خۆیمان لە ڕێگەی نووسینەکانییەوە بۆ دەردەخات هەرچەندە بوونێکی سادە و بێهودەی "بە تایبەتی لە تافی لاوی" پێوە دیاربوو. ئەوی ڕاستی بێت لە پاشاندا بەردەوام ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجە و کەسەر دەباتە سەر. بەڵام ئەشکەنجە و نهێنی و تەنانەت نەنگییەکانی دی مرۆڤ وەك نەفس بەرزی خودی ڕۆماننووس لە ڕووی توانای شرۆڤەکاری و بوونی ئەزموونی چڕ و پڕ دونیا مەعریفییەکەی دەبەزێنێ.

## خێزان

مارسیل پروست وەك فلۆبێر کوڕە پزیشك بوو، لە دەی تەمووزی ساڵی 1871 لە پاریس لەدایکبووە. باوکی لە بنەڕەتا خەڵکی گوندی ئیلیە بوو (بڕوانە کۆمبرای لە گەڕان بە دوای زەمەنە ونبووەکاندا) کە دەکەوێتە سەر لێوارەکانی لواغ (لاڤیڤۆن) لە باشووری ڕۆژئاوای شاغتغ. باوکی کە پەیمانی کارێکی باشی پێدەدرێ، لە ساڵی 1870 کچە سەرافی جولەکە جان وایل دەخوازێ. مامێکی ئەو ئافرەتە لاوە خانوویەکی گەورەی لە ئۆتۆی دەبێ (کە نووسەر تیا لەدایك دەبێ) لە سەرەتای

نووسینەکانیا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ و یەکەمین بەرهەمەکانی دامو دوغۆز و ئودێت دوگنێسی دەنووسێت. مارسیل پروست بە کەسایەتی نەنکی – لە دایکەوە– گەلێ سەرسام بوو و زۆری خۆشدەویست! مردنی کتوپڕی ئەو لە ساڵی 1895 وای لێکرد بە قووڵی بیر لە نووسینی "گۆڕانکارییەکانی دڵ" بکات. پاشان بە ماوەیەکی دوور لە ساڵی 1907 لە میانی پرسەیەکی خێزانی لە ماڵی روبێرت دۆفلێری هاوڕێی، هاوار دەکات: "هیچ شتێك بەردەوام نابێت، تەنانەت خودی مردنیش". دایکی پروست پێشبینیکار و بەسۆز و ڕۆشنبیر بوو و چاودێرییەکی بێپایانی کوڕە نۆبەرەکەی دەکرد کە تاڕادەی نەخۆشی دووچاری هەستیارییەکی گەلێ توندی کرد. لە تەمەنی سیانزە ساڵی لە میانی دانیشتنێکدا لێیان پرسی: بە بیرو ڕای تۆ لوتکەی نیگەرانی لە کوێ بەدیدەکرێ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: "لە دوورکەوتنەوەی دایکدا." شانبەشان ڕۆبەرتی برای کە لە ساڵی 1873 لەدایك بوو بەردەوامی بە کاری باوکی دەدا.

مارسێلی منداڵ لە شەقامی شانزە لیزە لەگەڵ ئەو کیژۆڵە بچکۆلانە یاری دەکرد کە سروشتی کەسایەتی گیلێبرتیان پێبەخشی و خێزانەکەی پشووی هاوینەیان لە ئیلیەغ لە نێو قەدپاڵەکانی "مێزێگلیز" و "گێرمانت" دەوروبەری تانت لیۆنی دەبردە سەر و لەگەڵ فرانسوازی هاوڕێ و دڵسۆز کە پاشان دەبێتە کارەکەری نووسەر و دایك و باوکی دابونەریتی کۆمبرای پەیرەو دەکەن.

## بواری خوێندن

مارسیل پروست لە ساڵی 1882 لە خوێندنگەی ئەلاکازێغن دوە دەچێتە خوێندنگەی کۆندۆغسێ کە وێڕای خراپی باری تەندروستی سەرکەوتن بەدەست ئەهێنێ. لە تویێی ڕۆژگار و خۆشییەکان، *Les plaisir et les jours* – وەکو مسیۆ داغلۆی مامۆستا خۆی لە قەرەی فەلسەفە دەدات. هاوڕێیانی خوێندنگەی بەرەنگاری ئەو کەسە مەدەنی و هاوچەرخانە ڕادەوەستان کە دژ بە دیسیپلینە توندوتیژەکانی دولاغیڤ گۆش بوون. هەر لەوێ پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ دانیەل ئالێڤی و فێغنان گغێ و ڕۆبەرت دوفلێغ و گاستۆن دوکایاڤێ بەست و بە پەرۆشییەوە گفتوگۆی لەگەڵ نووسەرە هاوچەرخەکانی وەك فغانس، باغێ دیەغ و ماتێرلنگ سازدەدا و هەروەها بە لوکۆنت دولیل و وەرگێڕانە شیعرییەکانی سەرسام بوو کە هێلینیزمە سەرنج ڕاکێشەکانی ببوونە مایەی وەڕزکردنی ئاخاوتنەکانی بلۆش. پروست لە ڕۆڵی فەلسەفە بەرامبەر بە لێکۆڵینەوەیەکی بواری فەلسەفەی فەرەنسی خەلاتی نایابترین وەردەگرێ و هەروەها وەك یاریدەدەرێك لە توێژینەوەی – لاغوڤیو لیلا – دا کاردەکات کە لەلایەن خوێندکارەکانەوە دەنووسرێت و دەخوێنرێتەوە لە کاتێکدا هەموو ئەمانە ئەشێ ئەو نامانە بن کە لە لایەن هاوڕێکانی بۆ نموونە ڕۆبەرت دریفۆس پارێزرابن کە بە شێوەیەکی باش بەهرەکانی پرۆستی هەرزەکارمان پێ نیشان دەدات.

پرۆست لە مانگی نۆڤەمبەری 1889 لە ماوەی خزمەتی ئالا ڕەوانەی فەوجی پیادەی حەفتا و شەش ئۆرلیان دەکرێ. لەوێ زۆر بێزار دەردەکەوێ بەڵام هەموو یەکشەمەیەك بە ڕوخسەت دەچێتەوە پاریس و بە چاوپێکەوتنی هاوڕێکانی شادمان دەبێ. گاستۆن دوکایاڤێ گەلێ جار لە تەکیا ڕووی دەکردە ئەو شوێنە دوورانە: "لە تەك گاستۆن هاوڕێیەتیەکی قوڵم هەبوو و لە سەربازگە تەنها

لەگەڵ ئەو دەدوام تەنانەت عەریف و گەورەکەمان وایانـدەبینی کـە ئـەو جۆرێـك لـە خواوەنـدێتی تیا بەدیدەکرێ".

## ڕووەو ئەدەب

لـە مـاوەی گەڕانـەوە بـۆ ژیـانی شارسـتانی پرۆسـت لـە خوێندنگـەی زانسـتە ڕامیارییـەکان بـە خوێندنی وانـەکانی ئەلبـەرت سـۆرێل و لـوری بۆلیـۆ دەگـات. لـە سـۆربۆن بێرجسـۆن کـە تێزێـك لـە مـەڕ پێـدراوە هەنووکەییـەکانی هەسـت بڵاودەکاتـەوە دەخوێنێ و تـەواو کاری تێدەکات. لە ساڵی 1892 لیسانسی ئەدەب تەواو دەکات. پاشان بۆ ماوەیەکی کورت پشووی لە کۆمبرەی دەباتە سەر و ماوەیەکی دووریـش لەسـەر پلاژەکـانی نۆرمانـد و تروڤیـل و کابورگ دەمێنێتەوە و تیادا دەست بە نووسینی – بالبیـك– دەکـات. وتـار و هەواڵـەکانی لـە چـەند گۆڤـارێکی جۆراوجـۆری وەك لوبانکـێ و لاغوڤیـو بلانش و چەندانی تر بڵاودەکرێنەوە. بۆ نموونە لە گۆڤارێکی مارتی 1892 دەتوانین چەند دێڕێك بەدی بکـەین کـە ڕووەکـانی بەهرەمەنـدی ئـەم نووسـەرە بیست ساڵییە دەخاتە ڕوو: "هونـەر پـێش هـەموو شتێك ڕۆدەچێتە نێو ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەندێشەی تایبەت کە دابونەریت و زەوقی سەردەمی چینێك یان گەلـێ جـار هـی بەشـی هـەرە زۆری کۆمەڵگـە بـە بـەرگێکی ڕاسـتخواز و هەسـتیارانەی سـەراپاگیر دائەپۆشی" لەمەڕ هونەری سەرکەوتو و خۆشحاڵکەر دەڵێ: "درۆ و دەلەسەکانی هونەر خودی ڕاستیەکان پێکدەهێنن کە بە کەمی لە بۆتەی خۆشەویستییەکی راسـتەقینە خۆشمـان دەوێـن، بـوونی گیـانی گاڵتەجاڕیانەی دەوروبەر پەیتا پەیتا لە کەمبوونەو دەسـەڵاتی ئاسـوودەیی و نیگـەرانیمان هـەوڵی خۆکێشانەوە دەدات بۆئەوەی لە ناخماندا گەشەکات و کەسەرییەکانمان بۆ جوانی بگوازێتەوە".

## کۆمیدیای کۆمەڵایەتی

لە ژێر ڕۆشنایی ئەم دەقانە شارەزاییەك لەمەڕ ژیانی مارسیل پروست پەیدا دەکەین. ئەوی ڕاستی بێت پروست بێ ئەوەی هیچ ئەرکێکی پیشەیی بکەوێتە سەر لە ماوەی ساڵەکانی 1892–1895 کە تیا ئەلفرێد دریفۆس (لـە مانگـەکانی ئۆکتۆبـەر و دیسـەمبەردا) گـیراو دوورخرایـەوە، دەستەوسـان نەبوو. سامانی باوك و دایکی وای لێکرد هیچ کارێك نـەکات جگـە لـەو بـڕە پارەیـە نـەبێ کـە بەرامبـەر کارکردن لـە کتێبخانـەی مازارین دەسـتی دەکـەوت. بەڵام بەردەوام پشووی هەبوو مەگەر سەری لە هونەر دۆسـتێك دابـا بـۆ نیشـاندانی کارەکـانی. هـەروەها بەهۆی چەند چاوپێکەوتنێکی گرنگی نێو نێوەندە کۆمەڵایەتییـەکان ئامـادەیی خـۆی دەردەبـڕی و گەشەی بە کارەکەی دەدا. ژان ئیمیل بلانش وێنەی دەکێشـێ. بـۆ گـالوا دەنووسـێ. لای نیگارکێشـانی ئـاوی، مـادلین لـومێر، لاپرانسـیس ماتیلـد و مـادام دوشڤونێ و لاکونتیس گروفل و ڕوبەرت دومنتسکیو پەی بە نیمچە سوارچاکی و پلەی موترانی دەبات و سروشـی کۆمـەڵێك مـۆدێلی خانمـە گـەورەکان لاسـایکەرەوانی لاغوشێغشـیان پێدەبەخشـێ. لـە لایـەکی دی پەیوەنـدی بـە رینالـدۆ هـانی مۆزیکـار دەکـات کـە لەسـەر پیـانۆ مۆزیـك بـۆ هـۆنراوەو پیەسـەکانی دادەنـێ و لـە ڕوانگەیـەوە بـە ڕێنومایکـەری ڕاستەقینەی مـوزیکی ڤانتۆی دەژمێـردرێ کـە سـروش لـە مـۆزیکی سانت ساین و سیزار فرانك وەردەگرێ. لەگەڵ ئەم هاوڕێ ڕونـاکبیر و هەسـتیارە بـە چـاکی سـاتەکانی خوێندنـەوە دابـەش دەکـات و سـەبارەت –

بیرەوەریەکانی ئەودیو گۆڕ - ڕۆماننووس بەرامبەر ڕەنگدانەوەی کاریگەری کۆمەڵگە و سەرچاوەی بیرۆکە لەبن نەهاتووەکان هەست بە ئەرکێکی گەورە دەکات.

لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا کە هاتووچۆی پێشانگای فواغ ئۆڤانبتێ دەکات سەرسام دەبێ و ڕەچاوی گەلێ شت دەکات چەشنی سروشتگەرایەك بە پەرۆشەوە خەریکی لێکۆڵینەوە دەبێت. فرانسوا مۆریاك لەبارەیەوە دەڵێ "وەکو پلاینی لەناوچوو و دێرین لە نزیکەوە ڕەچاوی کەفوکوڵی ڤیزۆف دەکات، مایەی سەرسووڕمانە کە پرۆست بۆئەوەی وێنەی کامڵ و جوانمان پێشکەش بکات خۆ دەهاوێتە نێو فۆرمی دڕندەیەك". پاشان هێدی هێدی دەست بە بەرجەستەکردنی کەسایەتی کۆمیدیای کۆمەڵایەتی دەکات. ئەوەش نموونەی گەشتێکی نامۆ نییە کاتێ کە لە ناونیشانی یەکەم لاپەڕەی کارێکی بڵاوکراوەی مارسیل پرۆست بە تەواوی پەی بە فۆرمی بەلزاك دەبەین. کتێبی ڕۆژگار و چێژەکان کە لە ساڵی 1896 لە لایەن کالمان لێڤی بڵاوکراوەتەوە، ئەناتۆل فرانس لە پێشەکیەکەیدا نووسیویە: پێویستە نووسەری ئەم بەرهەمە نایابە لەگەڵ ژان لۆران مشتومڕ سازبدات چونکە لە ڕۆژنامەکاندا هێرشی کردۆتە سەر.

## قۆناغی پێگەیشتن

لە ئەنجامی بەرپابوونی کۆمەڵە ململانێیەکی جیدی لە نێوان ساڵانی 1898-1899 مەسەلەی گەشەسەندنی زۆلاو ئازادکردنی ئەلفرێد دریفیۆس کەوتنە ئاراو تاکو ڕادەی لێکهەڵوەشان بوونە مایەی ووژاندنی بیروڕای فەرەنسی. وەك دەگێڕنەوە پرۆست لایەنگرێکی دریفۆس بوو کە شێوازێکی ئاشکرا و توندوتیژی بەرامبەر بە هەڵسوکەوت و هەڵەی جۆراو جۆری پارتە سیاسیەکان گرتبووە بەر.

## ڤینیسیاو ڕۆسکان

دوای ئەوەی بۆ چوارەم جار ساڵێك پشوو لە کتێبخانەی مازارین وەردەگرێ ئیدی پەیوەندی لەگەڵ ئەو شوێنەدا دەپچڕێت. لە ساڵی 1900ڕوودەکاتە ڤینیسیا و لەوێ گرنگی بە مەسەلە جوانناسیەکان دەدات. ڕۆسکان کاریگەری گەورەی بەسەر دەسەپێنێ بۆیە کۆمەڵێك وتاری جۆراوجۆر لە بارەی بەرهەمەکانی دەنووسێ بە تایبەتی پێشەکی ئینجیلی دامیان بەڵام لە میان توێژینەوە سەبارەت ساڵۆنە کۆمەڵایەتییەکان شێوازی تایبەت دەگرێتە بەر و تیایدا ئاماژە بۆ دۆمینیك و هۆراتیۆ دەکات.

## پرسە ماتەمیەکان

پرۆفیسۆر ئەدریان پرۆست لە پایزی ساڵی 1903 کۆچی دوایی دەکات و دەبێتە هۆی بزاوتێکی ڕەچاوکراو لای پرۆست کە بە ئاراستەی بیرۆکەی ترسناکتر پەلکێش و دووچاری جۆرێکی دی لە مەترسی و ڕاڕایی دەکات هەروەك مۆریس بارێس بەردەوام لەبارەیەوە دەیگووت "نوسەرێکی سەرسوڕهێنەری ڕاستەقینەو پیتۆڵێکی کریسیانیزمە". مارسیل پرۆست بەرگری لەو کڵێسایانە دەکات کە بەر لێشاوی هەڕەشەی پرۆژەی بریاند کەوتبوون. لە ئابی 1904 لە نووسراوێکدا داکۆکی لە بوژانەوەی سروتە کاسۆلیکیەکان دەکات و بە دەسکەوتێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و شێوەکاری و موزیکیان لە قەڵەم دەدات. هاوینی دواتر، دایکی ڕۆماننووس لە ئیڤیان نەخۆش

ئەکەوێ و ناگەڕێتەوە پاریس. لە بیست و شەشی تشرینی یەکەمی ساڵی 1905 لەوێ کۆچی دوایی دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی سستبوونی بایەخ و کەمبوونەوەی سنووری دەربڕینی ئازادانەو وریایی مامەڵەی ڕاستیەکان. گشت ئەمانە لە تویێی یەکەمین ڕۆمانیدا -ژان سانتۆی- ڕەنگ دەدەنەوە کە لە تویێی سێ بەرگدا و لە نێوان ساڵانی 1896-1904 نووسیویە و لە ساڵی 1952 بڵاوکراوەتەوە.

## هاوکارێکی سروشهێن

بێ سڵکردنەوە لە برینداربوونی هەست و سۆزی دایکانە مارسیل پروست خۆی بۆ ئەنجامدانی کارەکانی تەرخان دەکات بەڵام ئایا لە ڕووی جەستەییەوە توانای هەبوو؟ پاش دوو مانگ چارەسەرکردن دەست بە کاری نووسین دەکات و لە شەقامی هۆسمان نیشتەجێ دەبێت و هاوینان لە نێو کیژە لاوە ناسکەکان لە کابوغ بەسەر دەبات.

## ڕۆمانی *Du cote De chez Swann*

لە دوانزەی تشرینی دووەمی ساڵی 1913 لە دەزگای بیرنارد گراسیە ڕۆمانی -دوکۆتێ دوشێ سوان - بڵاودەکاتەوە پاش ئەوەی زۆربەی دەزگاکان دەستنووسەکەی ڕەت ئەکەنەوە. زۆر زوو بە هۆی پشتگیری لیۆن و لوسیان دۆدێ و پۆل سوودای و ئانغی گییۆن و چەندینی تر دەزگای لانوڤێل غوڤیوفغانسێز لە تویێی نامیلکەکانی ساڵی 1914دا چەند کورتەیەکی بەنرخی کارە دەسپێکراوەکەیان بڵاوکردەوە. لە ساڵی 1916 پرۆست گراسیەی بەجێهێشت و ڕوودەکاتە گالیمار. لەو ماوەیە دەتوانین ئەو نامانە بخوێنین کە لەگەڵ جاک غیڤیەغ دەیگۆڕینەوە.

## کەشتی

لە ماوەی جەنگ لە بڵاوکردنەوە دەکەوێت بەڵام بەردەوام دەنوسێت. بێتو ڕەچاوی بڕێك لە ڕوانینە تایبەتییەکانی بکەین دەبینین لە چوارچێوەی بەندێتی و تەنهایی نێو "کەشتییەکدا" سەقام دەگرێ. "وێنەی شەیدایان لە کاتی سەرهەڵدانی ئەوین و شاعیران لە کاتی گۆرانی چڕین و نەخۆشەکان لە کاتی هەستی زۆر نزیکبوونیان لە ڕووحەوە (.......) کە زۆر منداڵ بووم پێم وابوو چارەنووسی هیچ کەسێکی مێژوویی پیرۆز هێندەی نوح ناهەموار نەبوو لەبەر ئەو لافاوەی کە ماوەی چل ڕۆژ لە نێو کەشتیەکەیدا بەندی دەکات. پاشان من زۆرجار ماوەیەکی دوور نەخۆش دەکەوتم دەبوو لە نێو "کەشتی"دا بمێنمەوە. ئەوسا بۆم دەرکەوت نوح تەنها لە نێو کەشتییەکەیدا نەبێ هەرگیز بە وردی نەیڕوانیبووە گەردوون هەرچەند داخراو و تاریکیش سەراپای تەنیبوو" (ڕۆژگار و خۆشیەکان).

ئەویش لەسەر زەوی ماوەی چوار ساڵ بە تووندی بەربەرەکانی کرد، بەڵام بێتو وێنەی کەشتییەکە بە داخراوی مابێتەوە ئەوا دەگەڕێتەوە زیاتر خراپبوونی باری تەندروستی پرۆست. ڕۆماننووس خەمی ئەوەی بوو ئاخۆ دەتوانێ کۆتاییەکی باش بۆ کارە ئەدەبیەکانی دابڕێژێ و هەروەها دەستی بە دیاریکردنی سەرجەم ئەوانە دەکرد کە نەخۆشییەکە دوچاری دەکرد و وای لێدەکرد گەردوون ڕەتبکاتەوە. مارسێل پرۆست لە ساڵی 1911 لە مەڕ نەخۆشی ئەمە بۆ لویس دوروبیرتی هاوڕێ و ڕۆماننووس تۆمار دەکات:

"کتێب چەشنی تەوژمی بەخوڕی ئاوی بیرە ئیرتوازییەکانە هەتا زۆر نرم نەبێتەوە بە خێرایی بەرز نابێتەوە (...). بۆ یەکێکی وەکو من بڕوای وایە ئەدەب بریتییە لە دوایین دەربڕین و نەخۆشیش یارمەتیدەرە بۆ نووسینی کتێب, ئەوا خەڵکانی دی وا دەڕوانن کە تۆ پێویستە بەبێ هەڵچوون پێشوازی لە هاوکارێکی ئیلهام بەخش بکەیت".

پروست لە پانزەی تشرینی دووەمی ساڵی 1918 نامەیەکی کورت بۆ مەدام سترۆسی هاوڕێی دەنێرێ تیایدا ئاماژە بۆ گەڕانەوەی چێژی تەندروستی باش دەکات وەلێ ژیانی تایبەتی گەلێ ئاڵۆز دەبێ: "کەوتوومەتە نێو بارودۆخێکی سۆزاوی قووڵ و ناخۆشی ئەوتۆ کە بەردەوام ئەشکەنجە و لاوازییەکی بێ پایانم تیا دەڕوێنن". دوای ئەوەی پووری ئەپارتمانی شەقامی هۆسمان دەفرۆشێت, بە شێوەیەکی کاتی نیشتەجێی ئەپارتمانێکی شەقامی چل و چواری هاملین دەبێت و هە لەوێش کۆچی دوایی دەکات.

### سەرکەوتن - *La gloire*

لە ساڵی 1919 ئەکادیمای کونکوغ بە شەش دەنگ بەرامبەر چوار لە (کغوا دوبوا دوئێغ دوغفلێ) بۆ بەرهەمی - کیژە لاوە گوڵاوییەکان - خەڵات بە پروست دەبەخشێ. چێژی سەرکەوتن تەکانێکی گەورەی دەداتێ بەڵام زەمەن قورسایی خۆی بەسەر دەسەپێنێ بۆیە دەبێ دەستبەرداری ئەو شتانە بێت کە پێویست نەبوون. نەخۆشی هەمیشە بەدوایەوە بوو و لە دووایین مانگەکانی ژیان دووچاری چەرمەسەریەکی لەڕادەبەدەر بوو. لە ساڵی 1920 - قەدپاڵی گێرمانت (1) - و - گێرمانت (2), لە ساڵی 1921-و- سۆدۆم و گۆمۆر (1) -و- سۆدۆم و گۆمۆر (2) لە ساڵی 1922 دەنووسێ. لە کاتێکدا دەگەڕێ بە دوای ناونیشانی چەند بەرهەمێکی (کە لە دوای مردنی بڵاودەکرێنەوە) لەوانە: کچە زیندانیەکە و کچە ڕاکردووەکە کە سەرەتا ناوی ئەلبیرتین بوو و زەمەنە دۆزراوەکان, بەردەوام دەکەوێتە زیادەکاری و ڕاستکردنەوە و وەك گەواهێك ئەم دێڕە ئاڕاستەی گاستۆن گالیمار دەکات: "من بە درێژایی کات خەریکی چاککردنی ئەم شتانەم و چیتر". هەڵچوون و سەرپێچیەکان زۆر دەگمەن بوون لەگەڵ ئەوەش پرۆست لە ڕۆژێکی حوزەیرانی ساڵی 1921 ناتوانێ ئارەزووی دیتنی پێشانگای ڤێرمیر دیلفت ڕەتکاتەوە کە لە مۆزەخانەی ژۆدوپۆم سازکرابوو چونکە زۆری خۆشدەویست. هەروەك بۆ ژان لوی ڤۆدوایێ دەنووسێ: دەتوانی لەسەر دەستی خۆت بێگیانێکی وەك من بگەیەنیتە ئەوێ؟ لە ماوەی سەردانەکە دووچاری تەنگژەیەکی تەندروستی بەهێز بوو کە سروشی بەشە سەرسووڕهێنەرەکەی ڕۆمانی (مردنی بێرگۆت)ی پێدەبەخشێ. لە کاتی سەردانی هاوڕێکانی تووشی هەوکردنی قەفەزی سینگ دەبێت. لە هەژدەی نۆڤەمبەری ساڵی 1922 مارسیل پروست کۆچی دوایی دەکات و دەگاتە شوێنی حەوانەوەی هەمیشەیی و چیتر هەرگیز بە تەنهایی بەهاری گوندی کۆمبرەی شاد نابێ و دوابەدوای ژیان دەتوانێ - بۆنی نادیار و هەمیشەیی - لەیلەکەکان,*Lilas* تەواو هەڵمژێ".

### ستراکچەری بەرهەمەکانی

"لە گەڕان بەدوای زەمەنە وونبووەکان کە هاوکات بریتییە لە مێژووی سەردەم و مێژووی هەست -*conscience*- ڕۆمان فرنانددێر دەڵێ

دوالیزمی ئەم ئاوێتە بوونە دەبێتە هۆی ڕۆچوون بە نێو قوولایی ڕەسەنایەتی سەرسامەوە". لە ڕاستیدا ئەم کارە ئەدەبییە هاوکات بریتییە لە چاودێری کردن و –استبطان, *introspection*– کارە ئەدەبییەکە بریتییە لە گەردون و خود (*Lemoi*) چونکە بەرفراوانترین دۆزراوە لای پروست ئەوەیە کە گەردوون تەنها لە دەوروبەرمان خۆی ڕێکناخات بەڵکو لە نێوانمانە و خودیشمان پێکدەهێنێ. سەبارەت بوونەوەران خۆمان ڕەهەندیان پێدەدەین و کەمتەرخەمی دەیانسڕێتەوە و خۆشەویستی و بەغیلی بە شێوەیەکی بەرفراوان پلە و پایەیان والاتر دەکات, زیرەکی و میلانکۆلیا لێکیان جیادەکا و سنوور و مەودا گومڕاکانیان دەتوانن خۆیان بهاونە نێو ژیانی تایبەتیمانەوە.

## هارمۆنیای ناوەڕۆک

ڕۆژێکیان لەبارەی ئەو کیژە لاوەی کە زۆر خۆشی دەوێ, دەنووسێ: "ئەلبێرتین هەرگیز ئەو کەسە نەبوو کە ئەم وەك بەردێك مەلەی بە دەورا کردووە, بەڵکو چەقی بزوێنەری بونیادێکی گەورە بوو". ووشەکە بەشێوەیەکی بێ پایان پەردە هەڵماڵەر و گەواهیدەری ئیرادەیەکی ڕێکخراوە و چاکترە بووتریێ بیناسازییە: گومانی تیا نییە ووردەکاری توێژینەوە لە ڕوانگەی پروست هەرگیز بێهێزی لە ڕێکوپێکی و هاوپەیوەستی تێکڕای ووشەکان بەرپا ناکات کە نووسەر لەگەڵ کاتیدرال بەراوردی دەکات "ئەو کەڵێسایەی کە بڕواداران تیا هێدی هێدی فێری ڕاستیەکان دەبن و پەی بە هارمۆنیایان دەبەن" لەوێ وێنە دووبارە دەکەوێتە بەرجەستەکردن چونکە ئەگەر کارەکە وەکو بینایەك تا دوا ڕەونەق پلە بە پلە بەرزبێتەوە دەتوانێ هەمدیس خۆی لەگەڵ سەمفۆنیایەك بەراورد بکات کە تەنراوە بە تێمی گەورە, ئەوین, بەغیلی بردن, مردن, بیرەوەری و زەمەن و ئاوێتە و ئاوێزانی یەکدی دەبن و لێکدی جیادەبنەوە و بەشێوەیەکی سووك و بێدەنگ نۆتەکان ڕێك دەخەن و لە چوارچێوەی هارمۆنی و ئۆرکسترالیدا یەکدەگرنەوە. بەلام ڕووەکانی موزیك و بیناسازی و یەکگرتوویی کارەکە بە شێوەیەکی ئۆرگانی و ئاشکرا دەردەکەوێ – شێوەیەکی زیندوو وەردەگرێ نەك درێو – وەك پرۆستی مەزن و سەرسام بە بەلزاك لە کۆمیدیای مرۆییدا ئەوە دەبێژێ.

## کۆمەڵ

هەروەك چۆن لاسایی ئاشکرای سان سیمۆن لە نووسینی – تەولیف و ئاوێتەکردن –ی پروست دەردەکەوێ, وەك چۆن لە هەڕەتی لاوی داپیرەی هانی دەدا –لابغوێغ– بخوێنێ زۆر لە نزیکەوە دەست ئەکات بە خوێندنەوەی کەسایەتی و ئاکارەکانی سەردەم و ڕۆماننووس بە سوود بینین لە ئاکارنووسان چەند دەقێکی وەك – کۆمەڵ و ئاخاوتن –و– سوودەکانی سامان –و– دڵ –و– ژنان – دەنووسێ. بەلام کەشوهەواو ئامانجی ئەم بوارە لای پروست گەلێ جیاوازە چونکە هیچ ڕقێك بەرامبەر بە چینەکانی کۆمەڵ دەرنابڕێ و ئەوان خۆیان ڕەخنە لە کەموکوڕی نێوەندی کۆمەلایەتیان دەگرن وەك خۆی دەڵێ: لە – تابلۆی دوای شانۆ – باسی دیمەنی نێوەندە سەرمایەدارەکان دەکات. ئەوی ڕاستی بێت چینە جەماوەرییەکان تەنها لە کەسایەتی خزمەتکاران نەبێ زۆر بە دەگمەن لە کارەکانیا دەردەکەون و نزیکەی سەرجەم کەسایەتیەکانی سەر بە بورژوای لاساییکەر و چینی

ئەرستۆکراتن. وێرای ئەوەش ئەم ڕەخنەیە وەلادەنرێ و بۆچوونی پۆل ڤالێری لەم ڕووەوە بەم چەشنەیە: پرۆست توانی ووزە و لایەنی دەروونی چینی دەوڵەمەند و چینە نزمەکان بە تەباییەوە نیشان بدات و لە کارەکانیا وێنەی کۆمەڵی ڕووکەش بە قووڵی ڕەنگ دەداتەوە. پروست چەشنی نووسەرە هاوچەرخ و ئیمپریشیونیستەکان دەزانێ هەرکە ناوەڕۆك ڕۆڵی ڕۆشنکەرەوە دەگێڕێ نابێ هەرگیز بە چاوێکی سووك سەیر بکرێ. ڕۆژێکیان لەسەر ئەم دێڕەی بۆدلێر "ئای، چی عەدەمێکی شێتگیرانەی ڕازاوە و سیحراوییە!" ئەم تێبینییە دەنووسێ "بەلام عەدەمێکی هەستپێکراوی دووبارە خوڵقێنراوە، تەنها عەدەم نییە بەڵکو هەموو ژیان و سەراپای هونەرە".

## کەسەکان *Les individus*

وەکو کەسەکانی بەلزاکە بەلام بێ ئەوەی گوشاریان بخاتە سەر و پۆلینیان بکات. کەسایەتیەکانی پروست بە ئامادەبوونێکی لەبیرنەچوو تەنراون، دەگمەن و نموونەیین، پورە لیۆنی، فرانسواز و پەندەکانی، لۆگغاندانی ئازیز و بلۆش و تەولیفە هێلینیەکانی، نۆرپوای دیپلۆمات لە ووتارە چەواشەکانی، سانت لو، چارلس و دۆقەی گیرمانتس و ئۆدێت ئاشنایەتییان هەمیشە سادە و ساکار بوو. ڕۆڵە لاوەکیەکان هاوکات بە ڕاشکاوی بەرجەستە دەکران بۆ نموونە لە - بالبێك - کەسایەتی بەڕێوەبەری میوانخانە و قسەلۆکەکانی مایەی خۆشحاڵی بوون. تێکڕای شتەکان لە بوون و سەردەم و نێوەند و چالاکی و سستی و گۆڕانکارییەکانی سۆز و ئالوودەیی و گومان و نەخۆشی و جیاوازییە ووردەکانی دیالۆگ و مۆنۆلۆگە ناوەکیەکان لە کەسایەتیەکانیا ڕەنگیان دەدایەوە.

## ئاوێنەی سیحراوی بیرەوەریەکان

ئەوی ڕاستی بێت سایکۆلۆجیای پروست جێگیر نەبوو بەڵکو بزووت و جوڵاوەبوو. دەیزانی - من، *Le moi* - پێدراوێکی ناجێگیرەو بێ ووچان لە خۆگۆڕکێدایە "مانەوەی جێگیر و زەمەن موژدەبەری هیچ شتێك نین، تەنانەت ئازاریش" ئەشێ وەکو وونبویەکی بێ کۆتا لێیان گەیشتبێ؟ نەخێر چونکە بیرەوەری دەیانژێنێتەوە، بیرەوەرییەکی نەخوازراو بەلام ئامادەباش پێشوازی لە دەرکەوتنی تەلیسماوی و چاوەڕواننەکراو دەکات کە لە سایەیداو لە تاموچێژی پارچەیەك کێك و بۆنی گوڵێك دروست دەبێت. "بینا گەورەی بیرەوەری" پروست لێرە بەشێوەیەکی هوشیار و ئاشکرا خۆی دەخاتە ژێر ڕکێفی سروش و ئیلهامی شاتۆبریان و نیرڤال و بۆدلێر. لە - زەمەنە دۆزراوەکان (2) ئەم چەند دێڕە سەرەکیانەی بیرەوەریەکانی ئەودیو گۆڕ دەخوێنینەوە: "دوێنێ شەو بە تەنیا پیاسەم دەکرد (...) کاتێ کە گوێم لە دەنگی گۆرانی باڵندەی (السمنة، *grive*) بوو بیرۆکەکان پەلیان کێشام و دەنگە سیحراوییەکە مەوداکانی باوانی هێنایە بەرچاوم".

بەمجۆرە تێکڕای گوندی کامبورگ بە هۆی ئەم گۆڕانییە تەواوی ژیانی چووەوە بەر: بڵێی نزیکیەکی کاریگەری ئەوتۆ لە نێوان گوندی کۆمبورگ و کومبرەی هەبێت؟. هەروەها کە هۆنراوەی - بۆن، *Le parfum* - ی پروست

دەخـــوێنین، هـــۆنراوەی – گوڵـــەکانی شــــەڕ–ی بۆدلێرمان دێتە یاد:

ئای لەو قووڵاییە جوان و سیحراوییەی
کە لە توێی ئێستا و
ڕابردووی بووژاوە دەمانهەژێنێ!

## هونەری مارسیل پروست

لــە ڕووی شــێوازەوە: لــە ڕۆژی یادکردنــەوەی مارسیل پروست لـە لایـەن دەزگـای *N.R.F* لـە سـاڵی 1923، پۆل ڤالێری بەمجۆرە لەبارەیەوە دەدوێ: "لە هەر کوێی کتێبەکانیەوە بێت دەتوانین دەسپێبکەین. تواناى نووسینی هێند چڕ و دەوڵەمەندە بە جۆرێك کـە هــەرگیز ڕسـتە و ووشــەکانی پشـت بەوانــەی پێشــوویان نابەســتن. وابەســتەی شــتێك بــوو کــە دەتــوانین نــاوی چــالاکی تایبــەتی لێبنــێین لــە بونیاتنانی گرێچن و تەنانەت خودی دەقیشدا". لە ڕاستیدا ئەم شێوازە بێ وێنەیە بەڕادەیەکی یـەجگار دەوڵەمەنـد بـوو مەگـەر ئـەوەی کـە مـۆنتێن نـاوی – خوێنـەری کەمتەرخـەم –ی لێـدەنێ بتوانـێ حـوکمی بێ سەر و بەری و شڵەژاوی بەسەرا بسەپێنێ. ئەوی ڕاسـت بێـت ڕسـتە لای پروسـت جارێـك درێـژدادڕ و لاواز و هەندێك جار لە شێوەی ئەستێرە و گوڵ خۆی دەنوێنـێ. پروسـت کۆمـەڵێك وێنـەی ڕەهـا و هـەزاران بیرۆکـەی تـەبا دەئـەفرێنێ و هەنـدێ جـار لـە نێـو ڕەهەنــدە جۆراوجۆرەکــان شــێوەیەك لــە ئــاڵوگۆڕی کاریگــەر بــەرپا دەکــات وەك لــە – چــارۆکەکانی ئیلیسـتیر – (لاپـەڕە 247) بەلەمـەکان لـەو خانووانـە دەچـن کـە بـە دەوری خۆیـان پێدەچـێ مەلـە لـە نێـو ڕەگـەزێکی شـلەدا بکـەن. لاپـەڕەکانی پروسـت لـە شـێوەی دوابەدوایـەك نـەبوون بـەڵکو لەیـەك کاتـدا دیمــەنی گــەردوون و قووڵاییــەکانی نــاخ ئاشــکرا دەکەن. لـە شێوازی کورت دووردەکەوێ و شێوازی ئاوێزەیی و بەرفراوان دەگرێتەبەر. پروست لە تافی لاوییـەوە وای دەڕوانـی کـە "تـەنها خـوازە دەتوانـێ جۆرێك لە بەردەوامی بە شێواز ببەخشێ".

## گۆڕینی واقیع

گـۆڕینی واقـع لـە ڕێگـەی بـەکارهێنانی چـەند ڕەگەزێکی زینـدو و گـۆڕاو ئـەنجام دەدرێ. کارەکـانی پروسـت بێجگـە لـە ڕۆمـانی – ئـەوینێك لـە سـوان – هــەمووی بــە کەســی یەکــەمی تــاك نووســراون کــە بەرپرسـیار دەبـێ لـە ڕوونکردنـەوەی شـتەکان. بـێ ئــەوەی خــۆی گرفتــار بکــات بــە قووڵاییەکانــدا ڕۆدەچێت. پەنابردنە بەر بەها هەرە بەرز و پاکەکان ئـــاواز و دەربڕینێکـــی تایبـــەتی لای پروســـت پێکهێنــابوو. دەرخســتنی لاوازی و نائومێــدی ڕووە مرۆییــەکانی وەك بێرگــۆتی نووســەر و ئیلســتیری نیگـارکێش و ڤـانتۆی مـوزیکزان مەبەسـتدار بـوو چـونکە ئەوانـە بـەهۆی بـەهرەوە گۆڕانکـاری بەسـەر خـود و ژیـانی دەوروبـەر دەهێـنن. هونەرمەنـدان خزمەتکاری خواوەندێکی نادیارن، سروش و ئەشێ ڕزگـار بـوون بـۆ مرۆڤـەکان دەسـتەبەرکەن. دەتـوانین ئەوە بڵێین کە هونەر لە ڕوانگەی پروست بە ڕاستی دەگاتە مەنزڵگای لێبوردویی.

## گەردوون لە نێو کوپی چادا

یەکێك لە بەرهەمە ئەدەبییە مەزنەکانی پروست – گـەڕان بـە دوای زەمەنـە وونبوەکـان–ە کـە تـەواو باسـی سـەربردەی ئـەو – مـادلین (جـۆرە کێکێکـە)–ە بەناوبانگــە دەکــات کــە ســـەرەتای ئاهـــەنگێك دەڕازێنێتـــەوە و ڕۆدەچـــێتە نێـــو ئـــەزموونێکی سـایکۆلۆژی گـرنگ و دەگاتـە ئاسـتی مـوجیزەی –

زەمەنە دۆزراوەکان –. دووبارەبوونەوەی لەپڕی دەربڕینە لێکچووەکان لە ڕێگەی خۆشنوودیەکی وەسف نەکراو ئاماژەی پێدەکرێ و ئاکام دەبنە ڕێخۆشکەر بۆ نووسەر بۆئەوەی پەی بە نهێنی ئەم خۆشنوودیە بەرێت. ڕوئیا لێرەدا بەشێکی زۆری کارەکە داگیر دەکات و هاوکات لە سنووەکانی هەست و نەست و لە ڕێی دەروونشیکاریەوە چارەسەری دەروونی ووردبینانە ئەنجام دەدات و بەرزی ئاستی هونەری و شێوازی لیریکیانەی ڕستەکان پەی بە مەسەلە گەوهەریەکان دەبەن.

لە ماوەی سالآنێکی دووری پێشووی گوندی کۆمبرەی سەرجەم ئەو شتانەی دووربوون لە ڕووداو کارەساتی خەونەکانم لە ڕوانگەی خۆمەوە نادیار بوون. لە ڕۆژێکی زستان کە بۆ ماڵەوە دەگەڕامەوە دایکم ڕوانی سەرمام بوو, داوای لێکردم بە پێچەوانەی ئارەزووم کەمێك چا بخۆمەوە. سەرەتا داواکەیم ڕەتکردەوە, پاشان نازانم بۆچی لە قسەی خۆم گەڕامەوە. ئەویش کەوتە گەڕان بە دوای پارچەیەك کێکی بچووك و خڕ کە پێی دەڵێن پوتیت مادلین. پێدەچوو لە نێو قاڵبێکی خەتخەتی سەدەفەی گوێچکەماسی سان جاك دروست کرابێت. گەلێ خێرا بە دەس ڕۆژێکی خەماوی و دیمەنی ماتەمی ڕۆژی دوایی ماندووبووم, کەوچکێ لە چاکەم بۆ لێوەکانم درێژکرد کە پارچەیەك کێکم تیا نەرم کردبوەوە. بەڵام ئەو ساتەی کە تەنانەت تیا تێکەڵەی قوومە چاو ووردیلە کێك بەر مەلآشووم کەوتن تەزوویەك هات بە لەشما و لە ناخما هەستم بە شتێکی سەیر کرد. خۆشنوودیەکی بەچێژ بێ ئەوەی هۆی بزانم داگیری کردم و دووری خستم و دەمودەست لە بۆتەی هەمان ئەو ڕۆڵەی خۆشەویستی دەیگێڕێ گەڕاندمیەوە بۆ چەرمەسەریەکانی ژیان و کەمتەرخەمی و کارەساتی بێ زیان و تراویلکە کورتخایەنەکان. گیانم پڕ بوو لە گەوهەری بەهادار: یان چاکترە بڵێم گەوهەرێك کە لە ناخما نەبوو بەڵکو خودی خۆم بوو. خۆم لە هەستی پووچیەتی و سەرباری فەنابوون دابڕی. داخۆ ئەم خۆشییە مەزنە چۆن توانی ڕووم تێبکات؟ هەستم کرد خۆشیەکە بە تامی چاو کێکەکە پابەندبوو, بەڵام بەشێوەیەکی ڕەها و ڕادەبەدەر تێپەڕیبوو, پێم وانەبوو سروشتی چاو کێکەکەی گرتۆتە خۆ. داخۆ لە کوێوە هاتبێ؟ مانای چی بوو؟ لە کوێرا پەی پێبەرم؟ کە قوومی دووەمم پیاکرد خۆشی یەکەم قومم بەدی نەکرد, سێهەمین قووم لە دووهەمیان کەمتر مەبەستی پێکا. کاتی ئەوە هات هەڵوەستە بکەم, تامی خواردنەوەکە پێئەچێ بەرەو کەمبوونەوە بڕوات. ئاشکرایە ئەو ڕاستیەی بە دووی وێڵم لە خواردنەوەکەمدا نییە بەڵکو لە ناومایە. خواردنەوەکە ئەوی بەئاگاهێنا بەڵام دەرکی پێنەبرد, بەدەم تەکانێکی نەرم تەنها توانی خودی ئەم هێمایە بە پەنهانی دووپات بکات من ناتوانم ڕوونی بکەم و دەمەوێ لانی کەم داوای بکەمەوەو بەردەوام بە ساغی لای خۆم بیپارێزم لە پێناو گەیشتن بە ڕوونکردنی تەواو. کوپەکەم دانا و پەنام بۆ ئاوەزم برد. ئەو دەبێ بە ڕاستی بگات, بەڵام چۆن؟ جێی گومانێکی گەورەیە. هەرکە ئاوەز هەست بە گوشاری خۆی دەکات, ئەو خودە پشکنەرە کەی دەبێ بە تەواوی لە ناوچەیەکی تاریکدا دەس بە پشکنین بکات لە کاتێکدا هەموو کەلوپەلەکانی تەنها ڕێی گەڕانی لێناگرن بەڵکو ڕێی ئەفراندنیشی لێدەگرن؟ بەرەنگاری تاکە شتێك دەبێتەوە کە هێشتا بوونی نیە و دەشبێ تاکە شتەکە بەدیبهێنێ ئینجا خۆی بکاتە نێو ڕووناکیەکەیدا. دەست ئەکەم بە ئاراستەکردنی پرسیار لە خۆم, ئایا ئەم

بارودۆخــــە نادیـــارە دەتوانــــێ چــــی بــــێ کــــەوا هــیچ بەڵگەیــەکی ژیربێژانــە ناداتــە دەســت بــەڵام خۆشــنوودی و ڕاســتی ئــەو چــێژە دەخەنــە ڕوو کـە شـتەکانی تـر لـە بـەردەمیا بـێ ئاگـا وەسـتاون. منـیش لـە بـەردەم روون و ئاشـکراکردنی ئـەوەدام. (قەدپاڵی دوشێ سوان، گالیمار).

بـەمجۆرە لـەم دەقـەدا گێـڕەرەوە هـەوڵ دەدات بگاتە سەرچاوەی خۆشنوودی. هەست دەکات شتێك لـە ناخیـدا گۆڕانکـاری بـەرپا دەکـات و دەیـەوێ بەرزبێتـەوە و لـە حاڵـەتی بـەرەنگار بوونەوەدایـە و گـوێی لـە هـەراو زەنـای مـەودا بڕاوەکانـە و ئـەوەش دەخـەملێنێ ئـەو شـتانەی کـە لـە ناخیدایـە ئەشـێ سـەرپاکی ئــەو وێنــە و بیرەوەریانــە بــن کــە بــە تاموچێژەوە بەندن.

## سەرچاوە

***XX^e^ siecle - Marcel proust***

***Collection litteraire lagarde et Michard***

***Page 219-225***

# سێ کاری هونەری و سێ خوێندنەوەی رەخنەیی

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

(1)

## تابلۆی (دەغڵ)ی ڤان کوخ

خوێندنەوەی: مایەر سکاپیرۆ



بە بۆچوونی من تابلۆی (دەغڵ) یەکێکە لەو تابلۆیانەی ڤان کوخ کە بە شێوەیەکی قووڵتر لەوانی تری، رەگەزەکانی هونەرەکەی دەردەخا. خودی هونەرمەند بەر لە چەند رۆژێك لە خۆکوشتنەکەی نامەیەکی نوسیوە، تیایدا باس لەم تابلۆیە دەکا و پەردە لەسەر دۆخی دەروونی خۆی هەڵدەماڵێ.

تابلۆکە چەند رەهەندێکی سەیری هەیە: تابلۆیەکی درێژ و باریکە، وێنەیەك دەردەخا کە بە تاقە نیگایەك ناتوانین ببینین، وەك ئەوەی بۆ دوو تەماشاکەر دروست کرابێت. بابەتەکەیشی لەگەڵ ئەو قەبارە سەیرەدا گونجاوە، چونکە دیمەنێکی دەستەجەمعی نییە، بەڵکو دەغڵێکە لە تەختاییەکدا کە سێ رێگای لێکترازاوی تێدایە. بەمجۆرە بینەر هەست بە پەشێوییەك دەکا، بە گومانەوە دەڕوانێتە ئاسۆ یان و بەرینەکە، چونکە هیچ یەکێك لەو سێ رێگایەی لە بەردەمیدایە نایگەیەنێتە ئاسۆکە، بەڵکو هەموویان لە دەغڵەکەدا ون دەبن یان لە سنوری تابلۆکە دەترازێن و دەچنە دەرەوە. پەشێویی بزاوت و ئاراستەکان لێرەدا، رەنگدانەوەیەکی تەواوی ئەو پەشێوییەیە کە ڤان کوخ هەستی پێکردووە، چەقبینی (مراکزة) لە تابلۆکەدا دادڕاو و پارچە پارچەیە، هێڵەکان چەند توولەڕێیەکی لێکترازاون، بە جۆرێك هەر جووڵەیەك بە ئاراستەی ئاسۆدا کارێکی ئاستەمە، خۆرێکی تیشکهاوێژ و تێکشکاو بۆتە پارچەیەك شەبەنگی پەرش و بڵاو و تاریك، چونکە خۆر چەقی خۆی لەدەستداوە. قەلەڕەشەکان لە

ئاسۆوە بەرەو شاشەی تابلۆکە دێن, بە جۆرێك ڕێگە نادەن بینەر قوڵایی تابلۆکە بەشێوەیەکی سروشتی ببینێ, هێڵە تێکشکاوەکان دەچنە پاڵ ئەو دیمەنە ئاڵۆزەی کە سێ ڕێگای شەپۆلاوی لە خۆدەگرێ, (سەرەنجام) لە بزاوتێکدا دەچنەوە یەك, کە ڕێ لە ئاراستە دژەکان دەگرن و ڕێڕەوە مرۆییەکان و سیمبۆلەکانی مەرگ نیشان دەدەن.

باڵندەکان تا نزیکتر ببنەوە گەورەتر دەبن بەلاّم دەغڵە سێگۆشەکان لە پەشێویی دیمەنی گشتی دەترازێن (دوو سێگۆشەی دەغڵەکە بە پێچەوانەی باڵندەکانەوە لە قووڵایی تابلۆکەدا پانن بەلاّم تا دێنە پێشەوە باریکتر و بچووکتر دەبنەوە –وەرگێڕ), واتە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی دوور دەکەونەوە زیاتر بەرچاودەکەون. قەلەڕەشەکان لە روانگەیەکی گونجاو لەگەڵ چاوی بینەردا بەرجەستە دەبن بە جۆرێك پەرە بە وزەی خرۆشان دەدەن, دێنە پێشەوە وەك شتگەلێك کە گوزارشت لە دڵەڕاوکێ بکەن, شتگەلێکی بزۆك, روانگەی کات و نزیکبوونەوەی چرکەساتی داهاتوو بەرجەستەدەکەن, بەلاّم پێدەچێ ئەو خاکە ڕەق و وشکهەڵاتووەی ڕێگاکانی پێداتێدەپەڕی, بەرەنگاری سانسۆری روانگە (المنظور) ببێتەوە. هونەرمەند لە دۆخێکی پەشێویی داخراودایە, جیهان لەگەڵیدا لە جووڵەدایە لە کاتێکدا خۆی ناتوانێ بچێتە ناو جیهانەوە, شتەکان لە دۆخێکی ئەوتۆدان وەك ئەوەی هونەرمەند هەست بە چەقبەستوویی خۆی بکا, لە بەرامبەردا چارەنوسێکی خەمناك بەرەوڕووی غاردەدا. ئیدی نیگارکێشەکە دەبێتە بابەتی نمایشکراوی چەند قەلەڕەشێك تا دێ نزیکتر دەکەونەوە, بابەتێك لە دۆخی ترس و داڕاندایە.

لێرەوە, لە ژێر کاریگەریی ئەم ترسەدا, لە ناکاودا پەرچە کردارێکی توند لە لایەن هونەرمەندەوە بەدیدەکەین, کە دژی گەندەڵی و لەیەکهەڵوەشان بەرگری لە خۆی دەکا, دەبینین بۆشایی لە تابلۆکەدا بە گشتی فراوان و ساکارە, فراوانی و ساکارییەك کە هاوشێوەی نیە, ئەمەش پێچەوانەی ئەو وردەکاری و هەراو هوریا و پاشاگەردانیەیە کە فڵچە دروستی کردووە, جیهانێکی نەخشاندووە کە لە دیمەنی یەکەمیدا بریتیە لە چەند چینێکی کەڵەکە بوو, فراوانترین و جێگیرترین ڕووبەر دوورترینیانە: ئاسمانێکی لاکێشەیی کە شینێکی تاریك داپۆشیوەو تابلۆکەی تەنیوە, هیچ شینایییەك لە ئارادا نیە جگە لەو شیناییەی کە بە تەواوی تێر بووە. دوای ئەوە رووبەری دەغڵەکە دێت, کە لە رووی چەندایەتیەوە بچووکترە و لە دوو سێگۆشەی سەربەرەوخوار پێکدێت, دواتر ڕەنگی سووری ئاڵ سێ جار لە کەناردا بەدی دەکرێ, پاشان سەوزایی گژوگیای سەر ڕێگاکان چوار جار بەدیدەکرێ, دواجاریش خڕبوونەوەی چڕی قەلەڕەشەکان کە نزیك دەبنەوە بەرچاو دەکەوێ. واتە هەر ڕەنگێك لە ڕەنگە جیاوازەکانی تابلۆکە چەند جارێك بەکارهاتووە کە بەشێوەیەکی پێچەوانەیی لەگەڵ ئاستی ڕووبەرەکان و جێگیرایی رووبەرەکان دەگونجێ. وەك ئەوەی هونەرمەند ئەم شتانەی ئامادەکردبێت" یەکەم: یەکانگیری و بەرفراوانی و ئاسمانێکی سایەقە لەگەڵ دوا بڕیاریدا لەو بارەیەوە. دووەم: رەنگێکی زەرد کە تەواوکەری جمکە دابەش و ناجێگیرەکان و تەواوکەری دەغڵێکە لە نەش و نوما کەوتووە. سێیەم: رەنگی سووری کەنارە لێکترازاوەکان کە ناچنەوە سەر هیچ شوێنێك. چوارەم: سەوزایی تەواوکەری قەراغەکان کە گژوگیا داپۆشیون. بەلاّم گەشەی بێکۆتا و پێچاوپێچی قەلەڕەشەکان وێنەی مەرگێکی دوور نمایش دەکا.

هونەرمەند لێرەدا لە وێنەی پیاوێکدایە کە تووشی نەخۆشییەکی نێرڤسی (عصابی) بووە,

شتەکان ئامادە دەکا و دەیانژمێرێ وەك ئەوەی لە ئامێزیان بگرێ و بیەوێ رووبەڕووی توندوتیژی بێتەوە. بەمجۆرە ڤان کوخ لە لووتکەی ئەو دۆخە دڵتەنگەدا سیستمێکی ماتماتیکی رەنگەکان و فۆرمەکان ئاشکرادەکا، تا لە رێگایەوە بەرەنگاری لەبەریەکهەڵوەشان و گەندەڵیی ببێتەوە.

لەو نامەیەدا کە بۆ براکەی نوسیوەو پێشتر ئاماژەیان پێدا، ڤان کوخ دەربارەی دواهەمین تابلۆی (دەغل) قسەدەکا و دەڵێ: "چەند رووبەرێکی بەرینە لە گەنم لە ژێر ئاسمانێکی پڕ هەوردا... تیایدا گوزارشت لە خەم و تەنهاییەکی قووڵ دەکەم".

بەڵام ئەوەی تووشی سەرسوڕمانمان دەکا ئەو قسەیەیەتی کە دەڵێ: "ئومێدەوارم بەم نزیکانە ببیینی.. ئەم تابلۆیە شتێکت پێدەڵێ کە ناتوانم بە قسە گوزارشتی لێبکەم، شتێك کە پێم وایە لەو گوندەدا دڵنەواییکەر و ئازارڕەوێنە". لێرەدا دەکرێ بپرسین: چۆن تابلۆیەکی گەورەی لێوان لێو لە خەم و خەفەت و تەنهایی قووڵ و کڵۆڵی (دڵنەواییکەر و ئازارڕەوێن)ە؟

لە نامەیەکی تردا باس لە تابلۆیەك دەکا کە وێنای دەغڵێکی گەنم دەکا لەگەڵ خۆرێك و چەند هێڵێکی بەیەکداچوو، جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە ئەو تابلۆیە گوزارشت لە (ئارامی و ئاسایشێکی زۆر) دەکا، بەڵام تابلۆکە – هەر وەك خۆیشی دەڵێ بە چەند هێڵێکی بزۆك و هەڵکشاو بۆ بەشی سەرەوەی قوماشەکە کێشراوە و چەند ناوەندێکی پڕ کێشمەکێشم لە خۆ دەگرێ، کە چاوی بینەر تووشی پەشێوییەکی زۆر دەکا، کە ئەڵبەتە لە دیدی هەر هونەرمەندێکی ترەوە مانای نیگارانی و هەڵچوونێکی زۆر دەگەیەنێ.

ئەم ناکۆکییەی کە لە نێوان تابلۆکە و هەستی ڤان کوخ بەرامبەر تابلۆکە هەیە، کاتێ لە چاوی خۆیەوە تەماشای تابلۆکە دەکا، دوو دیاردەی جیاواز دەردەخا.. یەکەم چڕکردنەوەی رەنگەکان و هێڵەکان، کە هەڵگری هەر بابەتێك بن دەبێت بەو شێوەیە چڕ بکرێنەوە. ئیدی ئەو رەگەزانەی کە لە سروشتدا ئارام و جێگیر و رێکوپێکن، لە کاتی نەخشاندنیاندا دەبنە چەند رەگەزێکی ناجێگیر، یان دەبنە قوربانی هەڵچوونێکی توند، لە لایەکی ترەوە هەرچەندە توندوتیژییەکی سۆزداری لە دیمەنی گشتیدا بەدیدەکرێ، بەڵام لە کاردانەوەی بەرهەمە هونەریەکەدا (لەلایەن هونەرمەندەوە) نەسەلمێنراوە.

بەهەرحاڵ، نامەکانی ڤان کوخ دەریدەخەن کە ئەو ناکۆکییەی لە باسکردنی تابلۆی (دەغڵی گەنم)دا تێبینی دەکرێ، دەرەنجامی لاوازییەکی کاتی نیە لە بینیندا یان دەرەنجامی تێکەڵاوکردنی (شتەکان) نییە، بەڵکو پەردە لە سەر ئەو پەرچەکردارانەی هونەرمەند لادەدا کە زیاتر لە جارێك دووبارە دەبنەوە. چونکە کاتێ ڤان کوخ نیگاری بابەتێکی خەمناك و دڵتەنگ یان پڕ لە هەڵچوون دەکێشێ هەست بە ئارامی و دڵخۆشی دەکا، لەگەڵ تەواوکردنی کارەکەیدا جۆرێك لە تەندروستی و هەستکردن بە ئاسایش و ئاشتی لا دروست دەبێ، واتە نیگارکێشان لای ئەو پاکژکەرەوەیە.. دوای گێژەڵووکەکانی سۆز و هەڵچون هەست بە دۆخێکی جێگیر و ئارامی دەکا.

بەڵێ! لە گەرمەی هەڵچوون و نەخشاندنی دەغڵی گەنم و ئاسماندا، ڤان کوخ هەستێکی بەهێز و ئازارڕەوێنی لا دروست دەبێت” چونکە ئەو لە مێژ بوو بڕوای وا بوو کە تەنها نیگارکێشانە لە دێوانەیی و شێتێتی دەیپارێزێ. (دەگێڕنەوە) جارێکیان هەستی بە نزیکبوونەوەی قەیران و گرفت

کـردووە, بۆیـە نوسـیویەتی و دەڵـێ "مـن زۆر بـە خێرایـی بـەرەو نیگارکێشـان دەچـوولێم" چـونکە ئەو پێی وابوو هونەرەکەی ئامرازێکە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی.

ڤـان کـوخ بـە گشـتی بـە دێوانەیـەکی خـاوەن ئیلـهام لـە قەڵـەم دەدرێ, کـە وزە ئەفرێنەرەکـەی لـە دۆخێکی دەروونیی خەمناکەوە سەرچاوە دەگرێ, لە ڕاستیدا خۆی ئەم دەربڕینەی دەسەلماند, بەڵام لە هەمان کاتدا پێی وا بوو ئەو شێت نییە بەڵکو توشی قەیران بووە " دەتوانم بڵێم من بە مانای وشە شێت نـیم, چـونکە وەك دەبیـنن ئـەو تابلۆیانـەی کـە لـە کـاتی مێشـك سـافیدا کێشـاومن وەك هـەر تابلۆیـەکی تر ساکارن".

ئـەوەی دەوتـرێ دەربـارەی پەیوەنـدیی نێـوان بەهرەی هونەری و دۆخی دەروونی ڤان کوخ, گومـان ناهێڵێتـەوە کـە نیگارکێشـان لـە دیـدی ئـەودا وەك کارێکی فیکریی گەورە وا بوو کە لە ڕێگایەوە خۆی لـەو هەرەسـە دەپاراسـت کـە لێـی نزیکـدەبۆوە, ئـــەو بـــە هوشـــیارییەکی زۆرەوە چـــاودێری هەڵسـوکەوتەکانی خـۆی دەکـرد تـاوەکو پێشـبینی قەیرانـــەکان بکـــا و خـــۆی بـــۆ ئامـــادە بکـــا و نائومێدیەکانی بڕەونەوە.

ڤان کوخ لە کاتی ململانێی دەروونیدا, وزە و سـۆزدارییەکی بـەهێزی چـنگ دەکـەوت, کـە بـە کارەکانیـەوە دیـارە. خەسـڵەتێکی تـری ڤـان کـوخ بەرەنگاربوونـــەوەی چرکەســـاتەکانی گەنـــدەڵی و لەناوچـوون بـوو. بـەڵام مـەزنترین خەسـڵەتی ئـەو, لەئامێزگرتنی ئەو شتە بـوو کـە وێنـەی دەکێشـا بـە شێوەیەکی واقعی پەیوەست بە کەسایەتی خۆیـەوە, لێرەدا مەبەست لە واقعیەت مانا دەستنیشانکراو و بێزراوەکـەی ئـەو وشـەیە نییـە, کـە ئەمرۆکـە باسـی لێوەدەکرێ کاتێ دەوترێ ڤان کوخ وێنـەگرە, بەڵکو مەبەست ئەو هەست و سۆزەیە بەرامبەر حەقیقەتی دەرەکـی وەك ئارەزوویـەك یـان وەك پێداویسـتیەکی ڕێـزدار. ئـەو حەقیقەتـە دەرەکییـە ئامرازێکـە بـۆ بەموڵککردن, یـان ڕێگـە چارەی پیاوێکە لـە دۆخـی ململانێدایـە لـە پێنـاو کـامڵترکردنی خـۆی, واتـە بنەمای پێویستی هەر هونەرێك دروست دەکا. (شت) لە دیدی ڤان کوخدا هێمایەکە بۆ تەندروستی فیکری و دەســـتەبەرکردنی ئـەو تەندروسـتییە, ئـەو لـە نامەیەکیـدا بـاس لـە دەرکـەوتی پێکـەوە گونجـاو و دڵنەواییکـەری شتەکان دەکا. لە نامەیـەکی تریشـدا دەڵێ: "من خۆم ئەو شتانەم خۆشدەوێ کە واقیعین, ئەو شتانەی دەشێ بین".

(کەسـایەتی)یش خـۆی لـە خۆیـدا (شـت)ە, چـونکە ڤـان کـوخ پڕاوپـڕە لـە خۆشەویسـتی بـۆ بوونەوەری مرۆیی کە هەرچەندە لێی جیاوازە بەڵام کۆپییەکی تری ئەوە. واتە ئەو دەتوانێ وێنەی خۆی و وێنـەی کەسـانی تـریش وەك شـتگەلێکی کـامڵ بکێشـێ کـە خۆیـان دەسـەلمێنن, هـەروەها دەتوانێ هـەموو ئـەو شـتانە بـە تاقـە وشـەیەك بکاتـە مـوڵکی خۆی. هەر بۆیە دەبینین سەرەڕای ڕوخساری دەغڵ و ئاسمانێکی پڕ لـە دڵتـەنگی کە قەلەڕەشـەکان تیایدا نزیکتر دەکەونەوە, ڤان کوخ لـە دەسـەڵاتیدا مـاوە لـە پەنا ئەو یەکانگیری و دڵتەنگییەدا وێنەی جۆرێك لـە تەندروســـتی و هێـــز بکێشـــێ کـــە تـــەنها واقـــع دەتوانێ بیبەخشێ.

تـەنها واقعـی ئـەم سـەردەمەی ئێمـە دەتوانـێ زەمینـــەی لـــەباری خـــۆی ببەخشـــێ بـــە خواســـت و هونـەری مـرۆڤ, بـەڵام ڤـان کـوخ نەیـدەتوانی لەسـەر زەمینەیـەك بگیرسـێتەوە کـە پێویسـتی بـە بڕوابـوون هەبوو بە سیستمێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ کە هەستی بـە زوڵـم و دڵڕەقـی و پەشـێوییە لـە ڕادەبەدەرەکـەی دەکرد. لە ڕاستیدا واقع لە دیدی هونەرمەندانی ئەو سـەردەمەدا تـەنها مانـای گوشـار و ڕوخانـدنی

دەگەیاند, بەڵام ڤان کوخ رازی نەدەبوو بەوەی لە جیهانێکی ناوەکیی پڕ لە تێڕوانینی سەیر و سەمەرەدا بێت, رەنگە ئەو جیهانە دڵنەوایی کردبێت, چونکە ئەو باش دەیزانی کە چارەسەرێکی لەو جۆرە بۆ ئەو مانای دێوانەییەکی حەتمییە. هەندێ جار ئەو هۆگری بۆچوونی ئاینی دەبوو, بەڵام (دواتر) بەرەنگاری دەبۆوە بەوەی بەشتێکی گەندەڵ و بە سەرچاوەی گەندەڵیشی دەزانی, ئەو خاوەنی جۆرێك لە دڵسۆزی بوو کە پێویستی دەکرد وەفادار بێت بۆ ئەزموونە راستەوخۆکان, کە ڕێگەی پێ نەدەدا تابلۆی ئاینی بەرهەم بێنێت.

لە هونەری ڤان کوخدا درێژبوونەوەیەکی ناوەکی هەیە بەندە بە دۆخی دەروونی و شێوازی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانیەوە, وەك ئەوەی هێماگەری و گوزارشتخوازی (الرمزیة و التعبیریة) لە قوڵایی کەسایەتییەوە سەرچاوەی گرتبێ.. درێژبوونەوەیەکی سەربەخۆ و جیاوازە لەو شتانەی کە لە دەوروبەری ڕوودەدەن, بەڵام تا کۆتاییش ئەو وەفایەکی زۆری بۆ جیهانی شتەکان هەبوو, بە گوێرەی سوێندێك کە لە سەرەتای وانەکانیەوە پابەند بوو پێوەی. ئەو تابلۆیانەش کە لە دوارۆژەکانی ژیانیدا کێشاونی, هەرچەندە جۆرێك لە نامۆییان پێوە دیارە, بەڵام دواجار لە ڕووی دیدی بۆ شتەکان و واقعی شتەکان لە قووڵترین تابلۆکانیەتی.

کاتێ کە (خود) بەو جۆرە لە داڕمان و هەرەس نزیك دەکەوێتەوە و باوەشێکی توند بە شتەکاندا دەکا, تێبینی دەکەین ڤان کوخ – لە پەرچە کردارێکی بەرگریکەرانەدا – پەرۆشی بۆ شتەکان هەیە, نەك تەنها پەرۆشییەکی مردوو کە خەمی وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بیجووڵێنێ, بەڵکو لە وێنەی پەیامێکی بنیاتنەردایە و پەیوەستە بە ڕەگ و ڕیشەی هەست و سۆزێکی قووڵەوە. هونەرمەند چووبێتە هەر وڵاتێك, هەر شتێکی بەرچاوکەوتبێ وێنەی کێشاوە تاوەکو بە تەواوی بچێتە ناو ئەو نێوەند و ژینگەیە, بە پێچەوانەی گوزارشتخوازەکانەوە کە تەنها هەستێکی لاوازمان پێدەبەخشن سەبارەت بە شتەکان و کەسەکان. ئەو پێویستی بە بابەتیبوون بوو, چونکە روخساری هاوڕێکان و ئەو شتانەی کە خاوەنی هیچ پرسێك نەبوون و لە دەوروبەری بوون شتە تایبەتەکانی ئەو بوون کە بەبەردەمیدا دەهاتن و دەیدواندن, واتە درێژبوونەوەی کەسایەتی ئەو بوون و نوێنەرایەتی بەهاو مەرجە پێویستەکانی فیکری شیاوی ئەویان دەکرد, لەمبارەیەوە دەڵێ: "هەستکردن بە خودی شتەکان گرنگترە لە هەستی وێنەگرتن, یان بەلانی کەمەوە لەو بەپیتتر و زیندوترە".

تووشی سەختیەك نابینەوە گەر بمانەوێ لەوە تێبگەین بۆچی ڤان کوخ هونەری وێنەگرتنی ناودەنا ئەبستراکت (تجرید), لە کاتێکدا ئەو هونەرە وێنای فۆرمەکانی ژیان دەکا. لە لایەکی ترەوە بۆچی ئەو دەغڵە گەنمەی کە لە پێکهاتەدا ئەبستراکتە, هونەرمەند لە ڕێگای ئەزموونی راستەوخۆوە پەی پێدەبا. بەڵام تابلۆکە رەهەندی قەیرانێك تۆمار دەکا کە پێکاهەڵپژانێکی سەیر و دوور لە واقعی بەرجەستە کردووە و گوزارشت لە گەرمایی سۆزدارییەکی بەهێز دەکا. ئەو ئاسمانە بێکۆتاییەش لە وێنەی (گشت)ێکی گەورەدا دەردەکەوێ کە وەڵامێکە بۆ ئارەزوویەکی هیستری لە ونکردنی (خود) لە ئاسۆدا. لە راستیدا لە رووبەری ئەم تابلۆ ناسروشتیەدا نوقمبوونی ئیرادە بەدی دەکەین, ئەو قوڵاییەش کە بنی نییە بەشێوەیەکی ناسروشتی ئیرادەی تاك دادەپۆشێ, تا ئەو ئەندازەیەی قووتی دەدا و نغرۆی دەکات.

(2)
## تابلۆی (گۆرنیکا)ی پیکاسۆ
## خوێندنەوەی: ڕۆژێ گارودی



پیکاسۆ هێرشی فرۆکەکانی هیتلەر و فرانکۆی بۆ سەر شاری گۆرنیکای بچووك لە هەرێمی باسکای، کە ڕۆژی 28ی ئەپرێلی 1937 ڕوویداوە، وەك بابەتێك بەکارهێناوە بۆ تابلۆکەی، بێئەوەی ڕووداوەکە بگێڕێتەوە، بەڵکو هەموو جۆرە گێڕانەوەیەکی لەو تابلۆیە دوورخستۆتەوە، تەنها (هەوڵیداوە) سوکایەتیکردنی فاشیزم بە ئینسان نمایش بکا. جۆرێك لە وێنەی ئەفسانەیی ئەم سەردەمەی پێشکەشکردووین لە تابلۆیەکدا بەرزیەکەی 3.50م و پانییەکەی 7.80م-ە.

جارێکی تر دووپاتیدەکەینەوە کە ئێمە لە ئاست کارێکی ڕەمزیدا نین، بەڵکو لەبەردەم ئەفسانەیەکداین. واتە مەغزای کارەکە لە دەرەوەی تابلۆکە چنگ ناکەوێ و ناکرێ لە گوتارێکدا کورتی بکەینەوە، بەڵکو مەغزا و فۆرم پێکەوە (گشت)ێك کە قابلی دابەشبوون نییە دروست دەکەن. دەبوو ڕەنگەکان لە وێنەی ئازار و هێڵەکان لە وێنەی کارەسات و تورەبووندا بن، دەبوو کۆنترۆڵێکی تەواو بەسەر پێکهاتەی تابلۆکەدا بسەپێنرێ، تا سەر لەبەری کارەکە ببێتە ناڵەی ئینسان، ئەڵبەتە ناڵەی ئینسانێك کە سەردەکەوێ.

تابلۆکە دیمەنی قەسابخانەیەکە، دیمەنێکە بە مانای وشە، وەك ئەو دیمەنەی پەردەی لەسەر لادەبرێ، بەڵام لەوەی تێپەڕاندووە هەڵگری تەنها تایبەتمەندییەك بێت و وەك چیرۆکێك بیگێڕینەوە، بەڵکو پێدەچێ لە ئاست ئەفسانەیەکدا بین لە ئەفسانە کۆنە مەزنەکان. ئێمە لە ناو مەنزڵێکدا نین و لە دەرەوەی مەنزڵەکەشدا نین، ڕووناکی نە ڕووناکی ڕۆژە و نە هی شەو. ناکرێ بڵێین ئەو چەند هێڵە لاوازەی ڕووناکی کە وردەکاریی قەسابخانەکە بەرجەستە دەکەن، بریتیە لە ڕووناکی خۆر یان ڕەنگدانەوەی ئاگرەکە یان ڕەنگدانەوەی ئەو تیشکە تیژ و قووچەی کە لامپەکە پەخشی دەکاتەوە، یان ئەو ڕوونییە ترسناکەی نیگایەکی جێگیر بەسەر شتەکاندا دەیڕژێ.

مەبەستمان وێنەگرتنی چیرۆکێك نییە. (بەڵام ئەوەی بەدیدەکرێ بریتییە لە) چەند لاشەیەکی هەنجن هەنجن و شێواو کە بەشێوەیەکی دزێو فۆرمە مرۆییەکان تێکەڵ بە فۆرمە ئاژەڵیەکان بوون. هاواری ژنێك بە پێوە لە چەپی تابلۆکەدا کە ساوایەکی مردوی لە باوەش گرتووە، ئەوە تەنها هاواری ژنێك نییە، بەڵکو هێمایەکی گەردوونییە بۆ ئازارەکانی مرۆڤ. جەنگاوەرێك لە سەرەمەرگدایە دەسکی شمشێرەکەی گرتووە و خۆی لەسەر پارچەکانی شمشێرەکەی گرمۆڵە کردووە لە ناو چەند گوڵ و گیایەکی پەرش و بڵاودا کە هیچی لی سەوز نابێت، ئەو دەستەی شمشێرەکەی گرتووە گوزارشت لە شکست ناکا بەڵکو گوزارشت لە ئیرادەی مانەوەو سەرکەوتن دەکا. بە هەمان شێوە حیلکەی ترسناکی ئەو ئەسپەی کە لە سەرەمەرگدایە هەر چوار پەلی هەنجن هەنجن بووەو بە هەموو ڕووبەرەکان و دیمەنە جیاوازەکاندا بڵاوبۆتەوە، بە هەمان شێوە هاواری سەرەمەرگی ژنێك بەدی دەکەین کە وەك بڵێسەیەك دادەگیرسێ و لە بۆشاییدا بڵاودەبێتەوە و نامێنێ، یان ئەو ئافرەتەی بە گوڕێك دەڕوات و بە گوڕێك دەگەڕێتەوە وەك ئەوەی نیشانەی پرسیارێکی زیندو

بێت و چاوانی پڕبووبن لە فرمێسك. هەر فۆڕمێك لە فۆرمەكانی ئازار و ترس جەستەیەك لە جەستەكان دەشێوێنێ, ریشاڵ ریشاڵی دەكات و لە مرۆڤایەتی دایدەماڵێ, وەك ئەوەی جەنگەكە پاشاگەردانییەكی كاتی نەبێت, بەڵكو وەك خۆیان وتەنی, دوژمنكاری بێت بۆ سەر یاسای شتەكان و بەرەنگاریی ناسروشتی ژیان بێت كە لەوپەڕی دزێوی و پەشێویدایە. لێرەدا شیكردنەوەو پاساوێك دەدۆزینەوە بۆ گەشەی سەیروسەمەرە و پاشەوپاشی قۆناغی بوونەوەرە شێواوەكان. وەك ئەوەی ئەو بوونەوەرانە هاواری پێشبینیكردنی هێرشی سەرتاسەریی هێزە نامرۆییەكان بن.

ڕوانگە و ڕووناكی لەم تابلۆیەدا ملكەچی یاسای چالاكین تا ئەوپەڕی, ڕووناكی و سێبەرەكان زادەی هیچ سەرچاوەیەكی سروشتی نین, تەنانەت گڵۆپە كارەباییەكەش كە لە چاوێك دەچێ نیگایەكی گێلانەی گرتبێتە دیمەنەكە. تیشكە تیژەكانی ئەو گڵۆپە هیچ شتێك ڕووناك ناكەنەوە جگە لەو فیگەرە زیندوانەی برین جەستەی تەنیون. باكگراوندیش ڕەنگێكی تێكەڵە لە ڕەنگی خۆڵەمێش و خامی كفن و مۆتەكە. ڕەنگێك ڕێگەمان نادا چاو بخلافێنین لەو ڕاچەنینە كارەساتبارە گەورەیە.

هەر فیگەرە و بە تەنها ڕوانگەی تایبەتی خۆی هەیە, هەر یەكێكیان فەزای تایبەت بە خۆی هەیە و یاسایەكی تازەی هێناوەتە بوونەوە بۆ خۆبەرجەستەكردن, هەروەك چۆن هەموو گوڵێك بە شێوازێكی تایبەت بە خۆی دەپشكوێ. بەمجۆرە هەموو شتێك لە تابلۆكەدا ئەوپەڕی چڕبوونەوەی بەخشیوە بە هەر ئازار و هەر كلۆڵییەك كە لە تابلۆكەدا تەقیوەتەوە.

بەڵام ئەم قەسابخانە و پاشاگەردانییە سەرتاسەرییە, هەستی شكست و بێئومێدیمان لا دروست ناكا, چونكە گوزارشتی دیمەنەكە ئەوە ناخوازێ. لێرەدا هەست دەكەین (چەقی) كۆنترۆڵكردنی پێكهاتەیی ڕۆڵێكی یەكلاكەرەوە دەبینێ, چونكە دڵنیابوون لەوەی مرۆڤ (دواجار) سەردەكەوێ لە وردەكاری فیگەرەكاندا چنگمان ناكەوێ, بۆ نموونە لە سیمای ئەو ئافرەتەدا بەدی ناكەین كە لەسەر لایە و لە وێنەی چرایەكدا لە پەنجەرەكەوە دێتە ژوورێ و ئاگرێكی ئاراستەی گایەك كردووە كە ناجوولێ و كاردانەوەی نییە. بەڵكو دڵنیایی لە پێكهاتەی گشتی تابلۆكەدا هاتووە كە گوزارشت لە بوونی گشتی مرۆڤێكی داهێنەر و ڕێكخەر دەكا یان هونەرمەندێكی شاعیر كە زاڵ بووە بەسەر قەسابخانەكە و هەڵبەز و دابەزی ڕووداوەكاندا.

ئەم تابلۆیە وادەردەكەوێ كرابێ بە سێ بەشەوە: دوو تاك لەمبەر و ئەوبەر و سێگۆشەیەكی گەورەی چێوەیەكسان لە ناوەڕاستدایە چرایەكیش لە لووتكەی سێگۆشەكەدایە, لە ناو سێگۆشەكەدا ڕەنگەكانی ڕەش و سپی و خۆڵەمێشی هاوتان, هەروەها ڕاستەهێڵ و هێڵە چەماوەكان هاوتای یەكن, سەرەنجام ریتمێك دروست دەكا كە هەموو تابلۆكە دەتەنێتەوە. تا ئاستێكیش ڕێكخستنی شكۆداری شتگەلەكان بەرجەستە دەكا, كۆنترۆڵی مرۆڤ بۆ پاشاگەردانی و سەركەوتنی بەسەر دزێوییەكاندا.

هەڵەیە گەر بڵێین ئەم كارەو هاوشێوەكانی ئەم كارە ناگەنە هوشیاری جەماوەر. لە ڕاستیدا ئەم هونەرە هەموو كەس لێی تێدەگا جگە لەوانەی دەیانەوێ شتەكان پارچە پارچە و دابەش بكەن, تەنانەت گەر پەناش نەبەین بۆ وردەكاری بنیاتی تابلۆكە و بۆشاییەكان و دابەشكردنی ڕەنگەكان, كە پلەبەندیی ڕەنگی خۆڵەمێشی بەسەریدا زاڵە, ئەوا مۆركی گشتی و بزوێنەری هەست و سۆزەكان لەم

کــارەدا لـــە ئاســـتی تێگەیشـــتنی هەموانـدایـــە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

قســەکردن دەربــارەی ئــەوەی هونــەری نــزم و واقعیـەتی پـەتی و ساکار نزیکترن لـە چێژوەرگرتنی میللی, مانای ئەوەیـە ئێمـە خوازیاری چەمکێکین بۆ هونەر بێ بایەخانە تەماشای میللەت دەکا. هاوزەمان لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی ئیسپانیادا تاریکی باڵی بەسـەر ڕەنگـەکانی پیکاسـۆ –دا کێشـا, تـەمتومان ئاسـۆکانی ئـەو ڕۆژگـارە شـوومانەی داپۆشـی. وەك ئـەوەی جیهـان بەدەسـت کرشـبوونەوە بنالێنـێ و هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی هێزی فاشیزم و جەنگدا تووشی هەڵوەشان بووبێت. تابلۆکان و نیگارەکانی پیکاسـۆ شـایەتحاڵی ئـەو کرشـبوونەوەیەن, لـە جیهـانێکی لـێکترازاودا, لـە دنیایـەکی مرۆییـدا, کـە دوای ئــەوەی لــە مرۆڤایــەتی دامــاڵراوە تووشــی پەشۆکان بووە.

(3)

پەیکەری زیۆس

خوێندنەوەی: ئەلکساندەر ئیلیۆت



ئەمـە پەیکـەری (زیـۆس)ە, کـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان گــەورەی شــاخی ئۆلۆمــپ بــووە, پەیکـــەرێکی کلاسـیکییە لـە برۆنـز, ئـەمڕۆ بـە گـەورەترین کـاری مۆزەخانـەی ئەسـینا لـە قەڵـەم دەدرێ. هەنـدێ کـەس دەڵێن ئەم پیاوە رووتـە کـە قەبارەیـەکی سروشـتیی هەیە, لـە ڕاسـتیدا کـەس نییـە جگـە لـە (بۆرسـیدۆن) خواوەنـدی دەریـا لای گریکـەکان, کـە لـە بنەڕەتـدا رمێکـی سـێ دەمـی بەدەسـتەوە بـووەو لـە دەریـادا دۆزراوەتەوە. بەڵام شکۆی بەسامی ئەم پەیکەرە زۆر بـە تونـدی بـاوکی خواوەنـدەکانمان دێنێتـەوە یـاد, هەردوو قاچی باریك و رووتی وەك ئەوەیە خەریك بن بخلیسـکێن, تەنانـەت یـەکێکیان بـە ئاسـتەم بـە زەوییەوە نوساوە. واتە دەتوانێ لە چاوتروکانێکدا خۆی وەربگێڕێ بەلادا.

ماسـولکەی هـەردوو ڕان و پووزەکـانی ژیـانی پێوە دیارە, هەروەها ژیان زۆر بە گەرمی لە بۆشایی پشـتی و هــەردوو ئەژنۆیـدا هەسـتی پێـدەکرێت, هـەروەها لـە هـەردوو گـون و زەکەریـدا کـە لـە وێنـەی سەرەتیرێکدایە. گریکە کۆنـەکان لـەو بڕوایـەدا بوون چەقی ژیـانی مـرۆڤ لـە دڵ و سـەردا نییـە, بـەڵکو لـە جەرگدایـــە, ڕەنگـــە هۆکـــاری بەرجەســـتەکردنی ماسولکەکانی سەر و هەردوو سمتی (زیۆس) بۆ ئـەو بڕوایەی گریکەکان بگەڕێتـەوە. لـە پشت و شـانیەوە تـا کەمـەری پـڕە لــە هەناسـەی ژیـان, چـونکە ڕۆح هەوایـە, وەك گریکـەکان وتوویانـە. روخسـاری بـۆری پەیکەرەکە کە سۆزێکی جێگیری تێدایـە داگیرساوە, دەستی چەپی درێژکردووە, بۆ نیشانەنانەوە, سەری پەنجەکانی توند کردووە و لە هەوادا دەلـەرزێ, بـەڵام دەسـتی ڕاسـتی بـەرز کردۆتـەوە بـۆ دواوە بـۆ ئـەوەی هاوسـەنگی ڕاگـرێ و خـۆی ئامادەکا بـۆ هاویشـتنی نەرمە بروسکەیەك.

کەواتــە لێــرەدا خواوەنــدێك هەیــە لەوێنــەی مرۆڤێکــدا, کــە ئەوپــەڕی جوانیمــان نیشــان دەدا. کاتێك بینـەر بـە دەوری پەیکەرەکـەدا دەسـوڕێتەوە, دەبینـێ پەیکەرەکـە لەسـەر هـەردوو پـێ وەسـتاوە,

هەناسـەیەكی قـووڵ هەڵدەكێشـێ و بەختـەوەرە بـەو هوشیارییەی بەرامبـەر جەستەی خۆی هەیـەتی وەك ئـەوەی هەسـت بـە هاتوچـۆی خـوێن بكـا بـەناو دەمارەكانیدا. كاتێ بەلای دەستی چەپیدا تێدەپەڕێ كـە نیشـانەی پێگرتۆتـەوە، هەسـت بـە مووچـڕكەی ترسـێك دەكـا. چـونكە خواوەنـد دەتوانـێ زۆر بـێ بەزەییانـە خـەڵك بكـوژێ. مـەرگیش لـە جیهـانێكی ترەوە دێت، كە ئەم جیهانەی ئێمە نییە.

ئەم ساتە بەسەردەچێت، بەڵام ساتێكە هـەرگیز لەبیرناچێتەوە، هەروەك چۆن ئەو ساتانە لەبیرناكەین كە لە مەرگەوە نزیكین. كاتێ مرۆڤ بە ترسەوە بە دەوری پەیكـــەری خواوەندەكـــەدا دەســـوورێتەوە دڵنیایی لێوەردەگرێ. چونكە باشتروایە مرۆڤ لایەنە خێرەكەی ببینـێ. مرۆڤ تووشی دوودڵییەك دەبێت، پاشـان بڕیـار دەدا.. بۆچـی نـا؟ وەك پەیكەرەكـە دەوەستێ: نیشانە دەگرێتەوەو ڕمە بروسكەیەك بە دەستی ڕاستی بەرزدەكاتـەوە! ئـای خـۆ مـرۆڤیش كەسانی تـر دەكـوژێ! بـەڵام نـا، ئەمـە شـتێك نییـە بەختـــەوەرمان بكـــا. زیـــۆس خواوەنـــدێك نـــەبوو بوونەوەرەكان بكوژێ، بەڵام ڕمە بروسكە چی ترمان بۆ دێنێ جگە لە مەرگ؟ ئاگر، یان ئیلهام! زیۆس بە بـەردەوامی ئـاگر ڕەوانـەی جیهـان دەكـا لـە ڕێگـای هەورە بروسكەوە. هیندیە سورەكانی ئاڤاجۆ ناویـان نـابوو (بروسـكەی نێرینـە)، بـەڵام (بروسـكەی مێینـە) ئـەو بروسـكە نـەرم و شـەوقدارەیە كـە بـە ئاسـۆدا تێدەپەڕێ. بروسكەی نێرینە بۆمبی زیۆسە، یەكێكە لە هۆكارەكانی مەرگیش لە وڵاتی ناڤاجۆ. بەڵام لە وڵاتی یۆنان وانییە، لەوێ نیشـانەیەك و موعجیزەیەكە كات ڕادەگرێ و لاقەی (دایكە زەوی) دەكا.

زیۆس هەموو ئەو شتانەی ئەنجامدا. ئەو كاتێ بەسـەر باوكیـدا (كرۆنـۆس) سـەركەوت، كـە گۆشـتی مرۆڤی دەخوارد، (كات)ی ڕاگرت، كچەكانی (دایكە زەوی)شی ڕاهێناو بەربووە گیانیان، هەر بۆیە زیۆس لـە لایـەن خـاوەن ئاكارەكانـەوە ڕەت كراوەتـەوە، لـە هـزری شارستانیشـدا پێگەیـەكی ئـەوتۆی نییـە، دواجـار بـە كـارە نـاڕەواو تاوانـەكانی و بـە ئەقڵـە تاریكەكەی بۆتـە هێمای دیكتاتۆرێكی بچوك، بەڵام مرۆڤـی كـۆن لـە هـەر خواوەنـدێكی دیكـە زیـاتر پەرســـتوویانە و بـــە ڕێزێكـــی زۆرەوە تەماشـــای ڕەفتارەكانیان كردووە.. بۆچی؟

خەڵكی كریـت دەڵێن: زیـۆس هـەموو ساڵێك لـە ئەشـكەوتێكدا لەدایكـدەبێ و دەمـرێ و دەنێـژرێ، بـەڵام یـەكێك لـە كریتیـەكان دەڵـێ: (خـەڵكی كریـت درۆزنـن). لـە ڕاستیدا (زیـۆس) نازناوێـك بـوو پاشـا كاهینـەكانی كریـت لـە خۆیـان دەنـا، تـەنها سـاڵێك حوكمیـان دەكرد و پاشان قوربانیەكیان پێشكەشی (خواوەنـدی مـەزن) دەكـرد. خواوەنـدە مەزنـەكان چـەندین فـۆرمی جۆراوجۆریـان هـەبوو كـە هـەموو دنیای دەگرتـەوە. لای خێڵـەكانی ناڤاجۆ بریتـی بوو لـە (ژنـە جاڵجاڵۆكـە)، لای كلتیـەكان نـاوی (دایكـە درەخت) بوو، لای (كەباڵا)ش (زەمین و با) بوو. ئەم دۆخـە لـە پۆشـاكی خـاتوونی پاكیزەشدا بەرجەستە دەبـێ، جلێكـی سـوور و عەبایـەكی شـین. لای چینیەكان تـاوس بـوو، لای مەكسیكیەكانی چاخی بەردین فەهدی مێینە یان پڵنگی خاڵ خاڵی دارستان بـوو، كـە خـۆراك دەبەخشـێ بـە بێچـوەكانی و پاشان دەیانخوا.

بەمجۆرە خەڵكی هەمیشە بۆچوونیان وابوو كە هــەوڵ بــۆ ئــامێزی (خواوەنــدی مــەزن) بــدەن، دەشـیانزانی كـە ئـەو دەیـانكوژێ. مـەرگ نوسـتنە، نوســـتنە لـــە باوەشـــیدا. جـــوانی لـــە ئـــاین و ڕێوڕەسمەكانیدایە. لە كریت و لە زۆر شوێنی تـر خواوەنـــدەكان زەمینـــەیان خۆشـــدەكرد بـــۆ ئاشـتكردنەوەی مـرۆڤ لەگـەڵ خـولی ژیانـدا، ئـەوان دەیـــانووت خواوەنـــدەكان دەیانهێننـــە بـــوون و

خۆشەویستیان دەدەنێ و پاشان دەیانکوژن, دواتر لە فۆڕمی تازەدا زیندوویان دەکەنەوە, خواوەندەکان نوێنەرایەتی (شوێن و کات) یان دەکرد, ژیانیان دەبەخشییە هەموو شتێك پاشان مەرگ.. ژیان.. مەرگ.. تاهەتایە. بەڵام کە زیۆس هات, واتە کە خواوەندی گریکی هات نەك کاهینی کریتی, جورئەتی ئەوەی کرد بە خواوەندەکان پێبکەنێ و ڕێ و ڕەسمەکانیان ڕەت کاتەوە. کاتێ کوڕەکانی زیۆس-ی گریکی بروسکەی پڕ شکۆی ئەویان لەو ئارامییە نائومێدکەرانەیە پێ باشتر بوو کە خواوەندەکان لە خولی لەناوچووندا پێشکەشیان دەکرد, بڕیاریاندا ئەو شتە هەڵبژێرن کە لای ئێمەش پەسەندە.

زیۆس بە ڕاگرتنی کات و لاقەکردنی شوێن, ڕێگەی نیشانی ئێمە دا و مرۆڤی ئاراستەکرد بەرەو نەمری. ئەو تەنها مەرگ ناباڕێنێ بەڵکو نەمری-ش دەبەخشێ. گەر مرۆڤ لاسایی وەستانی پەیکەرەکەی زیۆس بکاتەوە کاتێ نەمریی دەبەخشێتەوە, بۆی دەردەکەوێ ئەو هەمیشە بەنیازە چی بکا: تیشکی بروسکەیەك لە ناخیدایە, کە تاریکی ژیانێکی هوشیارانە ڕووناکدەکاتەوە.

## سەرچاوە

نماذج نقدیة معاصرة, افاق النقد التشکیلي, عباس الصراف. (بغداد: دار الرشید للنشر, 1979), ص 347-363.

# بەرهەمهێنانی فیلم

**مۆونس سڤانە** (1)

**لە دانمارکییەوە: ئازاد مەولود**

**پێداچوونەوە: پەیمان بەگۆك**

## پێشەکی

لە رۆژانی ئەمرۆماندا کۆمەڵێکی زۆر زۆرتر لە جاران لە هونەرمەندانی کورد خەریکی کاری فیلم دروستکردنن، جا ئەم فیلمانە بۆ تەلەفزیۆن بن یاخود تاك و تەرا فیلمی سینەما بن. ئەمەش پەیوەندییەکی تەواوی بەو گۆڕانکاریانەوە هەیە کە لە ناوچەی کوردستان لە نەوەدەکانی سەدەی پێشوودا سەریان هەڵدا، کە لێرەدا مەبەستی ئێمە نییە باسی لێوە بکەین.

لەگەڵ ئەوەی هەندێ هەوڵی چاك دراوە لە بواری بەرهەمهێنانی فیلم، کە ژمارەیان زۆر زۆر کەمن، کەچی لە لایەکی تریشەوە کۆمەڵێکی زۆر کاری کرچ و کاڵ ئەنجام دراوە.

بەڕای من ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزایی و نەزانی و نەبوونی کاری پرۆفیشنالی لەم بوارە گرنگەدا. لە کاتی خۆیدا خوێندن و زانیاری لە بواری فیلم بە تایبەتی و بەرهەمی سینەما بە گشتی تەنها لە پەیمانگا هونەریەکانی پایتەختدا هەبووە. ئەو کەسانەش کە دەستیان نەدەگەیشتە ئەم پەیمانگایانە ناچار دەبوون خۆیان بە دوای سەرچاوە بگەڕێن و ئەو کتێب و نووسراوانە پەیدا کەن کە باس لە کاری فیلم دەکەن.

ئەگەر باسی بەشی خوارووی کوردستان (کوردستانی عیراق) بکەین دەبینین زۆربەی هەرە زۆری ئەم کتێبانە _ ئەگەر نەڵێم هەمووی _ بە زمانی عەرەبی بوون. ئیتر شەیدایانی کورد بۆ کاری فیلم بە تەنها بۆیان هەبوو ئەو شتانە بخوێننەوە کە خەڵکانێکی دەرەوە بۆیان هەڵدەبژاردن. گرنگترین خاڵ لێرەدا ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە بوو. من سەرنجی خۆم و هاوتەمەنەکانی خۆم دەدەم و دەبینم ئەو مەتریالەی لەبەردەستمان بوو تەنها باسی لە لایەنە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی سینەما دەکرد. سەیری ناونیشانی ئەم کتێبانە بکە: سینەمای سەردەمی

سەخت _ سینەماو کۆمەڵ _ سینەما و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان _ هونەری سینەما و کێشەکانی بیروباوەڕ _ ئەستێرەکانی سینەما... هتد. ئەمانە هێندێکن لە ناوی ئەو کتێبانەی من لە بیرم ماون، بەلاّم ئەوەی بەڕای من زێتر پێویستە بۆ نەتەوەیەکی کەمشارەزای وەکو ئێمە لە بواری فیلم دروست کردن، ئەو باس و لێکۆڵینەوانەن کە راستەوخۆ باسی چۆنیەتی دروستکردنی فیلم و مەرجەکانی دەکەن.

هەر لەم روانگەیەوەیە من ئەم باسەم کردۆتە کوردی و ئومێدەوارم ئەم بوارە چیتر فەرامۆش نەکرێ و نووسین و لێکۆلینەوەی زێتر لە لایەن کورد خۆیەوە پێشکەش بکرێت بە تایبەت لەم دواییە خەڵکانێکمان هەیە کە خوێندنیان لەم لایەنەوە تەواو کردووە.

مەبەستی من لە وەرگێڕانی ئەم باسە گەیاندنی زانیارییە ستاندارەکانە بە خوێنەرانی کورد بە گشتی و کارمەندانی بواری فیلم بە تایبەتی. من بە تەواوی هوشیاری ئەوەم کە گشت نموونەکانی ئەم باسە لە جیهانی فیلمی دانمارکییەوە وەرگیراون. بەڕای من ئەمە کارێکی ئاساییە لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان نووسەری ئەم باسە خۆی دانمارکییە و باسەکەشی هەر بە زمانی دانمارکی نووسیوە و لە نزیکەوە ئاگاداری بوارەکەیە. دووەمیشیان ئەوەیە کە فیلمی دانمارکی بە تایبەت لەم ساڵانەی دواییدا گەیشتۆتە ئاستێکی جیهانی زۆر بەرز چ لە بواری تەکنیك و چ لە ناوەڕۆکدا، کە شایەنی ئەوەیە بکرێتە پێوەر بۆ لێکۆڵینەوە و باسکردن.

لەگەڵ هەندێش ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەین دەبینین زۆر ووشە و دەستەواژە و دەربڕین و ناوونیشانی پیشە و پسپۆڕیی بە زمانەکانی ئینگلیزی یاخود ئەلمانی لە نێو باسەکەدا وەکو خۆی ماونەتەوە.

من نەمویست بە دوای دۆزینەوەی جێگرەوەی کوردی بۆ ئەم ووشانە بگەڕێم، چونکە ئەوەی ئاشکرایە ئەم ووشانە وەکو زمانێکی نێودەوڵەتییان لێهاتووە لە بواری کاری فیلمدا و هەموو لایەك بە بێ پەنگینەوە بە کاریان دێنن.

لە هەندێك پەراوێزدا ووشەی عەرەبیم هەر بە تەنها لە پێناو روونکردنەوەدا بەکار هێناوە, ئەگەر فارسی و تورکیشم بزانیبایە بۆی هەبوو بە پێی پێویست ئەوانیشم بەکاربهێنابایە، بە حوکمی ئەوەی ئەمانە زمانی دراوسێ جوگرافیەکانی زمانی کوردین و نەتەوەی ئێمە کەم و زۆر گوێبیستیان بووە.

بە هیوای دواڕۆژێکی رووناك بۆ فیلمی کوردی.

ئازاد مەولود

کۆپنهاگن _ 2001/3/6

مرۆڤ هەر بە چوونە سینەما تێناگا بەرهەمهێنانی فیلم ( فیلمی نواندن )[2] چەند ئاڵۆزە و چەندی تێدەچێ. بەلاّم دروست کردن و گێڕانەوەی چیرۆکێك کە مایەی باوەڕ و خۆشی بینەران بێت و راستگۆیانە باس لە سەربوردەی مرۆڤ بکات، پێویستی بە دەزگایەکی زۆر زل و زەبەلاح و تەکنیکێکی زۆر گرانبەهایە و دەبێ چەندەها کەسانی داهێنەری بۆ بخرێنە کار لە ژێر سەنگەیاییەکی قورسی پراکتیکی و ئابووری و کاتئامێزدا. ئەم کارە پێویستی بە هەزارەها جار بڕیاردان هەیە، هەر لە نووسینی یەکەم ووشەوە تا دەگاتە هەڵبژاردنی ئەو سینەمایەی فیلمەکەی لێ پیشان دەدرێ. بۆیە بەرهەمهێنانی فیلم بەردەوام پێویستی

بــە بڕیــاردان و هەڵبــژاردن هەیــە لــە نێــوان چــەندەها دەرفــەتی بێــژماردا. هــەر هەڵبــژاردنێك دەبێ بە توخمێکی گرنگ دابنرێ لە هێنانەدی دوا شێوەی فیلمەکە.

ئــیتر ئەنجامــدانی فــیلم پرۆســەیەکی زۆر ئــاڵۆز و ناســکە کــە بــە تــەکنیك و پراکتیــك و کارامەییێکی تایبەتی زۆر بێ ئەندازەوە گرێ دراوە. لــە هــەمان کاتــدا وەکــو زانــراوە پارەیــەکی زۆریشی تێدەچێ.

فیلمێکی نواندنی دانمارکی بە مەعەدەل 15 ملیۆن کرۆنی تێدەچێ[3].

لەگەڵ ئەم خەرجییانەش هەر فیلمێك دێتە بەرهەم ئەوپەڕی حیسابی وورد و هۆشیارانەی بۆ دەکرێ، بە تایبەتیش قۆناغی وێنەگرتن زۆری تێدەچێ، کە عادەتەن لە دوو هەتا سێ مانگ دەخایانێ.

بــڕین (مۆنتــاژ) و دەنــگ ئامــادەکردن و تێکهەڵکێشانیان لە هەشت تا دە مانگ دەکێشێ.

ئەو ماوەیەی بەر لە وێنەگرتن: کاری سیناریۆ و پلان دانانی بەرهەمهێنان زۆر جیاوازە لە فیلمێکەوە بۆ فیلمێکی تر، بەڵام زۆر بە دەگمەن لەساڵێك کەمتری پێ دەچێ.

## فیلم و ووشە

دەڵێن »ئەوەی وێنەیەك دەری دەبڕێ، بە هەزار ووشە ناگوترێ « بەڵام بەر لەوەی تەنها یەك تاکە مەتر فیلمی کاڵ وەربگیرێت، هەموو بیرەکە لە میانی ووشــە و متمانــەکردن بــە نووســەری ســیناریۆ/ دەرهێنەر هەڵدەسەنگێندرێ.

وا بــــاوە لەســــەرەتادا بیرۆکــــەی فیلمەکــە لەشــێوەیەکدا بــاس دەکــرێ کــە پێــی دەگوترێ *synopsis* .

*synopsis* خستنەرووێکی زۆر کورتی ناوەڕۆك و رووداوەکانی فیلمەکەیە.

نووسەری سیناریۆ یاخود دەرهێنەر _ کە بە پەیوەند لەگەڵ فیلمی دانمارکی زۆر جار هەمان کەسە _ بە هۆی *synopsis* وە دەبێ بەرهەم هێنەرێك یاخود راوێژکارێکی **پەیمانگای فیلمی دانمارکی**[4] بینێتە قەناعەت تاکو یارمەتی دارایی بدات بۆ فراوان کردنی زیاتری بیرۆکەکە و لێکۆڵینەوە و داڕشتنی ناوەڕۆکی فیلمەکە. بە هۆی *synopsis* وە دەتوانرێ یارمــەتی لــە **پــەیمانگای فــیلم** وەربگــیرێ بــۆ پەرەپێدانی بیرۆکەکە.

لە پرۆسەی پاشتر لێکۆڵینەوە لە سەر بابەتەکە و سەرەتای رووداوەکان دەکرێت. ئنجا زنجیرەی کێشەکانی ناو فیلمەکە لە کردارێکدا بونیات دەنرێن کە پێی دەوترێ *treatment*[5] کە زۆرجاران گێڕانەوەی رێڕەوە درامیەکەی فیلمەکەیە لە شێوەی چــیرۆکدا، لەگــەڵ باســی یــەك بــەدوای یەکی کەسایەتییەکان.

لەم پرۆسەیەدا ئەگەر نووسەری سیناریۆ پێویستی بوو دەتوانێ یارمەتی لە (دراماتۆرگ)ێك وەرگرێ، کەوا پسپۆڕە لە بونیاتنان و پەرەپێدانی رەوتــی درامــایی و بونیاتنــانی کاراکتــەرەکان و پەیوەندی کەسەکان.

کەش و هەوای فیلمی دانمارکی لە هەشتاکاندا کەوتە ژێر کاریگەرییەکی بەهێزی دراماتۆرگی سویدی (ئۆلا ئۆلسۆن *Ola Olsson*) کە بیرو بۆچوونێکی بەهەڵەی لە لای هەندێ کەسدا دروست کرد سەبارەت بە کاری دراماتۆرگی، لە کاتێکدا خەڵك بۆ ماوەیەك وا لە شێوەی تیۆریەکان و شیکردنەوەکانی ئەو دەگەیشتن وەك ئەوەی ئەو لیستەیەکی بۆ کۆمەڵێك وەڵام[6] یاخود بۆ کۆمەڵێك ئەنجام[7] لەشێوەی گێڕانەوەدا دروست کردبێ.

بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ هەڵچنینی فیلم لەسەر نموونەیەك یاخود لیستەی چەند وەلأمێك ناکرێ، ئینجا چ جای ئەوەی سەرکەوتنی فیلمەکەی پێ مسۆگەر بکرێت.

کە دراماتۆرگی هێنراوەتە نێو بوارەکە و نێو دیسپلینەکانی خوێندنگای فیلم، ئەوا زۆربەی نووسەرانی سیناریۆ و دەرهێنەرەکان ئەمرۆ دراماتۆرگییان وەك کەرەستەیەکی پێویست بەدەستەوەیە.

ئەم زانیارییە وەك مۆخی ناو بڕبڕەی پشت وایە، کە بەرامبەرە لەگەڵ زانیاریە تیۆریەکەی وێنەگرەکان لە بارەی ئامرازەکانی بینایی و ڕێژەی شکانەوەی تیشك، کە مەرجی پیشەیی بنچینەن.

لەگەڵ هەندێش، ئەو خەڵکانەی داواکاری دەخەنە پێش کۆمپانیاکانی فیلم و پەیمانگای فیلم، چەند جیاوازن، بیرەکانیش بەوەندە شێوەی جیاواز دەخرێنەڕوو، بەڵام ئەگەر *treatment* لەبەردەستدا بوو، ئەوا مرۆڤ زۆر چاکتر دەتوانێ مەزەندەی لێبکا ئاخۆ ناوەڕۆکەکە یاخود مادده دراماییەکە ئەوەندە هەیە تاوەکو بیناکەی لەسەر هەڵبنرێ، و بەڵکو لە دواتریش بتوانرێ یارمەتی لە پەیمانگای فیلم بۆ نووسینی سیناریۆکە وەربگیرێ.

سیناریۆ باسێکی ووردی ڕووداوەکانە بە دیالۆگی ئەکتەرەکانیشەوە، بە پێی دیمەنە یەك لە دوای یەکەکانەوە دابەش کراوە. زۆر جار وایە سیناریۆ تا تەواو ئامادە دەبێ چەندین جار دەنووسرێتەوە.

پێداچوونەوەی ووردی دیالۆگەکان دەکرێ، و لەوانەیە نووسەرەکە داوا لە خزم و ناسیاوی خۆی بکا بەڵکو دیالۆگەکان بڵێنەوە تا بزانێ لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی بارو دۆخە دراماییە دیاریکراوەدا چۆن دێنە گوێ.

ئەم پرۆسەیە لەکاتی خوێندنەوەداو تەنانەت بەر لەوێنەگرتنیش لەگەڵ ئەکتەرەکاندا بەردەوام دەبێ.

هەر دیمەنێك لە سیناریۆدا بە دیارکردنی شوێن/ جێگا نیشانە دەکرێ، بۆ ئەم مەبەستەش دەنووسرێ ژوورەوە یاخود دەرەوە ( *int. / ext.* )[8] ، هەروەها کاتەکە لە نێوان شەو و ڕۆژ و ساڵدا (ڕۆژ/ شەو/ زستان)، لەگەڵ ڕوونکردنەوە بۆ ڕێنومایی کردنی ئەکتەرەکان لە بارەی تۆنی دەنگ/ هەل و مەرج بە پێی دیالۆگەکە (بۆ نموونە » بە گومانەوە «، » بە هیستیریاوە «).

شێوەی نووسینەوە و داڕشتنی سیناریۆ زۆربەی کات بە پێی نموونەیەکی (مۆدێلێکی) تایبەت دەخرێتە سەر لاپەڕە، تاوەکو لە دواتر بۆ کاری پراکتیك ئاسان بێت. بەم جۆرە هەر لاپەڕەیەکی سیناریۆ بەرامبەر نزیکەی یەك دەققەی وێنەگیراوی فیلمەکەیە.

لە سەرەتای هەشتاکاندا پەیمانگای فیلم مەبلەغێکی تایبەتی تەرخان کرد بۆ پێشبەرهەم[9]، تاوەکو کۆمپانیای بەرهەمهێن بتوانێ یارمەتی وەربگرێت بۆ نموونە بۆ وێنەگرتنی دیمەنێك یاخود بەرهەمهێنانی کورتە ڤیدیۆیەك کە ڕێباز و شێواز و ناوەڕۆکی فیلمەکە پیشان دەدات، ئیتر قەبلاندنەکە هەر بە تەنها لەسەر بنچینەی ووشەی نووسراو نابێ بەڵکو ئەو کاتە سکێچێکی لە شێوەی فیلم لەگەڵدا دەبێ. هەرچەندە هەر فیلمێك تاکە نموونەیەکە بۆ خۆی، کەچی پرۆسەی بەرهەمهێنان بە گشتی دابەشی سێ قۆناغی جیاواز دەکرێت: پێشبەرهەم، بەرهەم، پاشبەرهەم[10].

### 1) پێشبەرهەم

سەرۆکی کۆمپانیای بەرهەمهێنان، واتا بەرهەمهێن، کەسی ڕاستەقینەیە بۆ بە واقیع

گەیاندنی هەر بیرێك. بەرهەمهێن ئەو كەسەیە كە لە ڕێگای *synopses* یان *treatment* كە بە كورتی باس لە كارێكی هونەری دەكەن، دەگاتە باوەڕ و قەناعەت، و لە هەمان كاتیشدا توانای ئابووری راستەقینەی هەیە بۆ ئەنجامدانی كارەكە.

لە نێو كۆمپانیا گەورەكاندا زۆربەی كات بەرهەمهێن، بەرهەمهێنەرێك دەكاتە یاریدەدەری خۆی، تا لە سەرووڕا چاوی لە فیلمەكە بێ. ئەم كەسە بۆی هەیە لە هەمان كاتدا لە فیلمی دیشدا بەرپرسیاری هەبێ.

بەرهەمهێن یاخود بەرهەمهێنەر لە میانی كاركردنێكی سەخت و زۆرجار درێژخایەندا، لە ڕێگای ڕێككەوتن و كۆنتراكت[11] بەستن لەگەڵ هاوبەشانی خاوەن توانا، و دابەشكاران، و هاو _ بەرهەمهێنەراندا، بە بەشداری فاوندێشنە[12] نیشتمانی و نێودەوڵەتیەكاندا سەرمایەی پێویست كۆدەكەنەوە و پێكەوە دەنێن.

لەبەر ئەوەی فیلمی نواندن بە رادەیەكی زۆر زۆر خەرجیەكانی لە لایەن هەندێ بەشدارانی ترەوە بۆ دابین دەكرێت، بۆ نموونە ئێزگەكانی تەلەفزیۆن و ئەو كەسانەی سەرمایەكانیان دەخەنە كار[13]، ئیتر هەر یەكێ لەم فیلمانە بەشێوەی بەرهەمی هاوبەش لە نێوان ئەم لایەنانە دێتە ئەنجام، بە جۆرێك مەترسی خۆڵێدانی بەسەر چەندین دەستدا دابەش دەكرێت. لە هەمان كاتدا بەرهەمهێن بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەو دەزگایانەی یارمەتی دارایی، و گەرەنتی قەرز دەدەنە هەر یەكێك لەم فیلمانە، بۆ نموونە **پەیمانگای فیلمی دانماركی**.

لە لایەكی ترەوە كەسی سەرەكی و هەرەگرنگ دەرهێنەرە، كەوا بەرپرسیاری سەرووی هەموو لایەنە داهێنەری و هونەرییەكانە لە دروست كردنی هەر فیلمێك لە سەرەتاوە تا دوایی. لە هەندێك حاڵەتدا و لە لای هەندێ كۆمپانیا نێودەوڵەتیە گەورەكانی فیلم دروست كردن بڕیاری دوا شێوەی فیلمەكە لە لای بەرهەمهێنە.

لێرەدا ئەم باسە پەیوەندی بە مافی *final– cut* وە هەیە[14]. لە دانمارك و وڵاتانی تری سكەندیناڤی داب و دەستوور وایە كە *final– cut* لای دەرهێنەرە.

بەرهەمهێنەری هێل (لاین) *line – producer* بەرپرسیارە لە هەموو لایەنەكانی تری بەڕێوەبردن و ئابووری و تەكنیكی و پراكتیكی هەر بەرهەمێك. لە خوارەوەی *line – producer* بەڕێوەبەرێكی بەرهەم هەیە كە لە بنچینەدا پلانەكانی وێنەگرتن دادەنێ و بەڕێوەیان دەبات.

## پلان كێشان

تاوەكو وێنەیەكی سەرەتاییمان بێتە دەست بۆ ئەوەی بزانین ئەنجامدانی فیلمێك چەندی تێ دەچێ، پێویستە بەڕێوەبەری بەرهەم سیناریۆكە " هەڵوەشێنێتەوە " و بە پێی زانیاریە یەك لە دوای یەكەكانی ناو دیمەنەكان بیكاتە چەند یەكەیەكی بچووك، بە پێی ژمارەی ڕۆژەكانی وێنەگرتن ووردیان كاتەوە.

بە واتایەكی تر هەموو ئەو دیمەنانەی لە یەك شوێن ڕوودەدەن لەسەر كاغەز دەكاتە كۆمەڵ. كۆمەڵ: هەموو ئەو دیمەنانەی پێویستە لە یەك شوێنی دیاریكراودا (*location*)[15] وێنەبگیرێن، جیا دەكرێنەوە. هەروەها ئەو ئەكتەرانەش دیاری دەكرێن كە لەو دیمەنانەدا ڕۆڵ دەبینن.

بە هەمان شێوە كارەكانی جل و بەرگ، ئۆتۆمبێل و كرداره پڕ مەترسییەكان و... هتد كۆمەڵ دەكرێن. ئەمە دەبێتە بنكەیەك بۆ هەموو زانیاریەكان و دەتوانرێ هەموو تۆخمەكانی تیادا بە

ووردی بخوێندرێنـــەوە. بـــەم شـــێوەیە بەڕێوەبـــەری بەرهەم دەتوانێ هـەموو پێویستیەکان حسێب بکات وەکو ئەکتەر و تەکنیك و ئێکسسوار و..هتد.

ئەم کارە وەکو ئەوەیـە چەندەها پارچەی وورد لە پاڵ یـەك دانێیت بۆ دروستکردنی وێنەیـەکی زۆر مـەزن، کـە بـەردەوام شـتی تازەشـی دەخرێتـە پـاڵ، چـونکە هەمیشـــە لـــە هەنـــدێ شـــوێندا گـــۆڕانی بەسەردا دێت.

لەبـەر هەنـدێ وێنـەگرتنی فـیلم لـە دیمـەنی یەکەمەوە بەڕیز دەست پـێ ناکات، بەڵکو ئەو پـەڕی لێکدانـــەوەی ئـــابووری و حیســـابی ووردی تێـــدا ڕەچاو دەکرێت.

## پێکهێنانی تیپ (گروپی کار)

بەشی هەرە زۆری کارمەندانی فیلمی دانمارکی بە شێوەی *freelance* [16] کار دەکەن، بۆیـە پێکهێنـان و کۆکردنـەوەی گروپـی کـار ئیشـێکی زۆری دەوێ. بەڵام هەڵبژاردنی کارمەندان لەوانەیە کار بکاتـە سـەر شێوەی کۆتایی فیلمەکە، چونکە نێوانی کارمەندان یـــەکجار گرنگـــە بـــۆ چـــۆنیەتی بەڕێوەچـــوونی وێنەگرتنەکان.

لـــە بـــواری هـــاو _ بەرهـــەمی [17] نێودەوڵـــەتی، کـــارێکی بەڕاســـتی زۆر قوڕســـە کـــەوا تیپێـــك لـــە دانمـــارکی و فەرەنســـی و ئـــەلمان و ئینگلیـــز پێـــك بینێـت و وایـان لـێ بکـەیت لـە پێنـاو یـەك ئامـانجی هاوبەش کاربکەن. سەرەڕای ئەمـەش دەبـێ لە نێوان چەندەها کەسی خاوەن توانا _ هەرکەسە و لە بواری خـۆی _ باشـترین کەسـانێك هەڵبـژێریت بـۆ ئـەو ئەرکانەی فیلمەکە پێویستیەتی.

کارە بنچینەیی و گرنگەکان لە لایـەن وێنـەگر و کارمەنـــــدی دەنـــــگ و ســـــینۆگراف [18]، و سەرپەرشـــتیکاری جـــل و بـــەرگ، و سەرپەرشـــتی ماکیـاژ [19]، کۆمپۆنیسـت [20] و مـۆنتێیر [21]، ئـەنجام دەدرێ، کـە هـەر یەکـەیان بەرپرسـیاری بەشـێکە و سەرپەرشتی ئەو بەشەی خۆی دەکات. ئەوەی لێرەدا بە دەرهێنەرەوە پەیوەستە، دوو خاڵی گرنگن:

یەکـەمیان دەرهێنـەر وا دەکـا ئـەم کەسـانە بـە شارەزایی و هەستی داهێنـانی خۆیـان، بە هـۆی ئـەو کەرەســتانەی هەیانــە، روونکردنەوەیــەك، یــاخود گێڕانەوەیـــــەکی ناڕاســـــتەوخۆی چـــــیرۆکەکە. ئەنجام بدەن.

دووەمیـان دەرهێنـەر وا دەکـا لـە هـەمان کاتـدا کەوا ئەم کەسانە ببنە تەواوکەری یەکتر و ئەوە دابین بکەن کە تـەواوی مەبەست لـە لایەنـەکانی نـاوەڕۆك و درامـــایی و جوانکارییـــەوە ئـــەنجام دەدرێـــت. زۆر پێویســـتە شـــێوازێکی [22] سەرتاســـەری فیلمەکـــە هەڵبژێردرێ و دەستنیشان بکرێ.

بۆ نموونە وەکو شێوازی (ئیکسپرێشینیزم) [23] لە فیلمی (ئـەوروپا) لـە دەرهێنـانی *Lars von Trier* ، یـان (ئیمپریشـینیزم) [24] لـە فیلمـی (ئۆرشـەلیم) لـە دەرهێنـانی *Bille August* , و (ریالیزم) [25] لە فیلمی (ئـەو دورگەیـەی شـەقامی باڵنـدەکان) لـە دەرهێنـانی *Søren Kragh - Jacobsen* [26]. ئـەم شـێواز هەڵبژاردنەش لە خۆیدا کۆمەڵێك گریمانـەی تـری بۆ بـاقی کارمەنـدان لـێ دەبێتـەوە، وەکـو ئەنـدازەی فیلمەکـە و چەشـنی فیلمەکـە و ئـەو تۆنـە ڕەنگـەی لەگەڵ ئەم مەبەستەدا دەگونجێ. ئایا فـەزای فیلمەکە کـراوە بێـت یـاخود فەزایـەکی داخـراوی بـە ترسـی هـــەبێ...هەڵوێســـتەکان درێـــژ بکرێنـــەوە یـــاخود برینەکـە خێـرا خێـرا بێـت... ڕێبـازە تەقلیـدی و باوەکـان بشـکێندرێن یـاخود نـا.. گریمانـەکان زۆرن، بەڵام هەموویان دەبێ لە خزمەتی چیرۆکی فیلمەکەدا بن و شێوازێکی هۆمۆگین [27] پێك بێنن.

واباوە کە هەموو دیمەنەکانی ژوورەوە لە ناو ستۆدیۆ وێنە دەگیرێ. لەوێدا دەرهێنەر و کارمەندانی دیکە دەتوانن هەموو کارەکە بەڕێوە ببەن بێ ئەوەی شتێك نارەحەتیان بکات.

وێنەگرتنی *location* هەمیشە دەکەوێتە ژێر کاریگەری کۆمەڵێك توخمی ناڕەحەتکار کە دەبنە هۆی ئەوەی وێنەگرتن درێژە بکێشێ.

ئەو دیمەنانەی پێویستیان بە ئیفێکتی تایبەتی[28] و بزووتنەوەی خەتەرناکە، دەبێ پلانی ئەوتۆیان بۆ دابنرێ کە گشت ووردەکاریەکانیان تێدا دیار بکرێت، یەکێك لەم جۆرە پلانانەش بەکارهێنانی *storyboard* [29] ە. ئیفیکتە تایبەتیەکان بە پێی چەند پێوەرێك هەڵدەبژێردرێن: پێوەری ئابووری، یان پێوەری شێواز، یاخود پێوەری فەزای سروشتی چیرۆکەکە.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئەم تەکنیکانە ئەرکی کۆنترۆڵ کردن لە لای هەموو بەشداران زیاد دەکەن.

بڕیارێکی گرنگ سەبارەت بە سەرکەوتنی هەر فیلمێك، کە تازیارێکی زۆر بەرز و گرنگی هەیە، هەڵبژاردنی ئەکتەرەکانە. بۆ ئەم مەبەستە دەرهێنەر دەتوانێ *caster* [30] ێك بکاتە یاریدەدەری خۆی، کە پسپۆڕە لەم دەستنیشانکردنەدا. دوای ئەوەی هەموو ئەکتەرە سەرەکیەکان دەستنیشان دەکرێن، دەرهێنەر دەست دەکاتە پرۆڤەی خوێندنەوە، کە لە میانیدا بە ووردی باس لە ئامانج و مەبەستی کردارەکان دەکرێت.

ئنجا ئەکتەرەکان سەبارەت بە سیمای کاراکتەرەکان، زمانی جەستە[31]، دەربڕینی دەنگی ووشە و رستەکان، و شل و پەیت کردنی گوفتارەکان بە پێی رەوتە دراماییەکە مەشقیان پێ دەکرێت.

## گەردوونە ( جیهانە ) سروشتیەکە

بەر لەوەی بەرهەمەکە دەست پێ بکات، سینۆگراف و بەرپرسیاری جل و بەرگ خەریکی خۆڕێکخستنن بۆ دابین کردنی هەموو ئەو شتانەی پێویستن بۆ وێنەگرتن. هەر یەکێك لەمانە سەرۆکاتی بەشێك دەکات لە خەڵکی خاوەن پیشە، کە ژمارەیان بە پێی چەشنی فیلمەکە دەگۆڕێ.

ئەگەر فیلمەکە مێژوویی بێت ئەوا کارەکە زۆر فراوان دەبێ، کە لە لایەك پێویستی بە زانینی شێوازی مێژوویی ئەو سەردەمەیە و لە لایەکی ترەوە هەستێکی داهێنەرانە دەخوازێ بۆ شێوەکردنەوەی کاریگەرانەی هەموو پێکهاتە مەتریالیەکان، جا ئەمانە چ بیناسازی و پۆشاك و چەك و هۆیەکانی گواستنەوە بن چ کەرەستەی چێشت لێنان بن.

ئەوەی پەیوەندی بە سینۆگرافەوە هەیە (کە ئارکیتێکتی[32] فیلمە و شێوەسازی بەرهەمە) شێوەسازکردن و سەرپەرشتی بنیاتنانی کالیۆسەکانە بۆ ناو ستۆدیۆ، لەگەڵ/ یاخود دەستنیشان کردنی *location* ەکان.

توانا و زەوق و زیرەکی دارشتن لە لای سینۆگرافەوە توخمێکی زۆر گرنگە بۆ پێکهێنانی چوارچێوەیەکی سروشتی بۆ رووداوەکان. هەروەها مرۆڤ پێویستی بە شارەزاییەکی دیاریکراو هەیە لە بوارە تایبەتیەکانی تەکنیکی فیلم بۆ ئەوەی بتوانێ جیهانێکی سروشتی بخاتە بەرچاو.

هەرچەندە کۆمەڵە پسپۆڕێکی زۆر هەنە لە بواری ئیفێکتی تایبەتیەوە، وەکو ئەوانەی مۆدێل و بووکەشووشە دروست دەکەن، رەسم لەسەر شووشە دەکەن (سەیری وێنەی ژمارە 1 بکە)، و کاری هایدرۆلیك و تەقینەوە ئەنجام دەدەن، کەچی وا باوە

ئەمانــــە گشــــتیان لــــە لایــــەن ســــینۆگرافەوە دەستنیشان دەكرێن.

بــەر لــە دەســت كــردن بــە وێنــەگرتن، كۆمپۆنیستێك ڕادەسپێردرێ تاوەكو دەست بە كار بكات بۆ خولقاندنی جیهانە مۆسیقیەكەی فیلمەكە كە لە خۆیدا كارێكی مەزنە.

لــــەم قۆناغــــەدا بەڕێوەبــــەری بەرهــــەم وێنەگرتنەكانی ڕۆژ بە ڕۆژ، و دەم بە دەم بە تەواوی ڕێكخســتووە، لەگــەڵ هێشــتنەوەی دەرفــەت بــۆ گۆڕانكاری بچووك، لە بەر ئەوەی زۆر كات وێنەگرتن لەسەر باری ئاو و هەوا وەستاوە، یاخود چەندین گیروگرفتی لە پڕ دێنەپێش. بۆیە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ بە ووردی بڵێ چەند ئەبات بۆ ئەوەی دیمەنێك بە تەواوی بگیرێت. حسێبەكان تەنها بە پشتیوانی ئەو شارەزاییانە دەكرێن كە بەڕێوەبەری بەرهەم هەیەتی. دواكەوتن لە كات لەوانەیە ببێتە هۆی گێرەشێوێنی، چونكە لەوانەیە هەر بە تەنها یەك سەعات زێدەكاری كار بكاتە سەر كرێ و ڕۆژانەی 20 – 30 كەسێكەوە.

**2) بەرهەم**

لە كاتی بەرهەمهێناندا، دەرهێنەر مشووری ئەنجامدانی گشت كارەكانی داهێنان دەخوات، بگرە هەر لە ڕێنمایی كردنی ئەكتەرەكان تا دامەزراندن و ڕێكخستنی گشت چالاكیەكانی بەردەم كامێرا، لەوانەش دەستنیشان كردنی بیری سەرەكی، بزووتنەوەی كامیرا، پلانی ڕووناكی، بەكارهێنانی ئێكسیسوار و كۆمبارسەكان و ...هتد. سەرەڕای وێنەگر و سینۆگراف و بەرپرسیاری دەنگ و .. ئەوانی تر، دەرهێنەر یاریدەدەرێكیشی هەیە.

خاڵی دەستپێكردن بۆ هەموو ئەنجامدانێكی پراكتیكی لە بەشی بەرهەمهێنانەوە دەست پێدەكات، كە تیایدا بەشەكانی سكرتاریەت و ژمێریاری لە لایەن بەرهەمهێنەر و بەڕێوەبەری بەرهەمەوە بەڕێوەدەچن.

دوا فۆرمی پلانی ڕۆژانە لە بەشی بەرهەمهێناندا ئامادە دەكرێت، كە تیایدا پلانی بەرهەمی بابەتەكانی ڕۆژی دواتر دادەنرێت، چونكە لەوانەیە لە پلان دانانی یەكەمەوە زۆر ساتەوەختی وا دیاری كرابن كە نەتوانرێ بە دڵنیاییەوە پشتیان پێ ببەسترێ.

هەروەها ڕاپۆرتی ڕۆژانەش وەردەگیرێت تا بزانرێت چەند سەعات كار كراوە و چەند مەتر فیلم بەكارهێنراوە، تاوەكو بتوانن پێ بە پێ لەگەڵ بودجەكە بڕۆن و بزانن چەندی لێ خەرج كراوە.

ڕاپۆرتەكانیش بە بەردەوامی دەدرێن بە **پەیمانگای فیلم.**

## ڕووناكی و وێنە

لە فیلمێكی نواندندا، بەڕێوەبەری وێنەگرتن[33] بەرپرسیارە لە هەموو كارەكانی وێنەگرتن، كۆمپۆزیشیۆن[34]، چەسپاندنی ڕووناكی، جووڵانەوەی كامیراو.... هتد. وای لێ هاتووە ووردە ووردە بۆتە شتێكی ئاسایی كە بەڕێوەبەری وێنەگرتن یاریدەدەرێكی هەیە تەنها بۆ كاری كامیرا. وەزیفەی ئەم یاریدەدەرە ئەوەیە كامیرا بە ئیش دێنێت. بێجگە لەویش فۆتۆگرافی (وێنەگری) دووەمیش هەیە[35]، كە ئەركی یاریدەدەرێك دەبینێ. ئەمانە گشتیان لە كاتی وێنەگرتندا لەسەر شێوەی وێنەكان[36] ڕێكدەكەون.

بۆ دانانی ڕووناكیش كەسێك هەیە[37] كە بەڕێوەبەری ڕووناكییە. ئەویش لەبارەی خۆیەوە سەرۆكی كۆمەڵێك ڕووناكیكار و كارەباچییە.

چەسپاندنی رووناکی دیمەنی گەورە کاتێکی زۆری پێدەوێت.

ئەگەر هەڵوێستەکە وا بخوازێ کەوا کامیرا لەسەر فارگۆنێک[38] یان هێڵی ئاسن یاخود کرێن غلۆر بکرێتەوە، ئەوا کەسێك ئەم کارە دەکا پێی دەگوترێ *grip*.

ئەگەر وێنەگرتن وای خواست کەوا کامیرا بە خزاندن و بێ گرێ بجووڵێندرێ، بە شێوەیەك کە *dolly* پێی ئەنجام نەدرێ، ئەوا وێنەگری تایبەت هەیە کە بۆ ئەم مەبەستە مەشقی تایبەتی کردووە. ئەم وێنەگرە ئامێرێکی تایبەتی هەیە (*steadycam* ) کە بە لەشی خۆیەوە هەڵیدەواسێ. ئەم ئامێرە بەردەوام بەلانسی کامیراکە رادەگرێت.

*Clapper/ loader*[39] یاریدەدەرێکە، بەشێکی کارەکەی کلاکێتە[40] و بەشەکەی تریشی چاوی لە فیلمی ناو کامیرا دەبێ و رۆژانە راپۆرتی نێگەتیڤەکان بۆ لابۆر بەرێ دەکات.

لەبەر رۆشنایی ئەو شێوازەی بۆ فیلمەکە دیاری کراوە، چەشن و جۆری فیلمی کاڵ و رووناکی و پرینسیپەکانی رەنگ دەسنیشان دەکرێن. هەروەها پێش رۆژی وێنەگرتن، گۆشەکانی کامیرا و جووڵانەوەکانی بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ دەرهێنەر گفتوگۆی لەسەر دەکرێ و یەکلا دەکرێتەوە.

بەڕێوەبەری رووناکی، بەخۆ و بە تیپەکەی یەکەم کەسن بەیانیان لەسەر کار ئامادە دەبن تاوەکو ئەو هەموو گلۆپ و چرا مەزنانە رێك بخەن.

## دەنگی ساف

بەڕێوەبەری دەنگیش بەرپرسیاری کارێکی زۆر گرنگە، ئەگەر زانیمان هەڵبژاردنی میکرۆفۆنەکان و ئامێرەکانی تۆمارکردنی دەنگ و پرینسیپەکانی تۆمارکردن[41] چ رۆڵێك دەگێڕن لە باش و خراپی سەرجەمی تەواوی دەنگ و رەنگ. پێویستە لە کاتی تۆمارکردندا دیالۆگەکان ئەوەندەی دەکرێت ساف تۆمار بکرێن.

ئەم جۆرە تۆمارکردنەی دەنگ پێی دەگوترێ دەنگی100× بەو واتایەی کە 100× هاوکات بێت لەگەڵ وێنەکان.

لەکاتی ئەم تۆمارکردنانەدا پێویستە هەموو سەرچاوەیەکی دەنگەدەنگ و تەپەتەپ و هەراو هۆریا بەدوور بخرێنەوە. لێرەدا گشت ئامرازەکان و ئەوپەڕی تواناکانی نێو میکسەری دەنگ دەخرێنە کار.

ئەگەر لە فیلمێکی تەواو بوودا _ لەوانەیە بە بێئاگایی _ مرۆڤ گوێی لە جریوەی باڵندەیەك یان وەڕینی سەگێك یان ویقەویقی ئوتومبێلێکی پۆلیس یاخود ویزەویزی مێشێك بێ، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەبێ ئەم دەنگە بە ئەنقەست هەڵبژاردرابێ، ئینجا لە دواتر چووبێتە قۆناغی تێکهەڵکیش کردن بۆپێرفێکت کردنی فەزا دەنگئامێزەکە. ئەگەر بەڕێوەبەری دەنگ، کە بوومەرێك[42] یارمەتی دەدات، هەستی کرد لە کاتی تۆمارکردندا دەنگێکی کزی گرەگری فرۆکەیەك یاخود زەنگی تەلەفۆنێکی گیرفان دێتە گوێ و تۆمار دەبێ، لەسەری پێویستە داوا بکات (*take* )[43] یکی تازە وەربگیرێت.

## رێنمایی کردنی بەشداران

دیارە مەبەست لە رێنمایی کردنی ئەکتەرەکان شتێکی ئاشکرایە.

چەند دەرهێنەر لە دونیادا هەیە، ئەوەندە چەشنە رێنمایی کردنەش هەیە. هەر یەکێك

بۆچوونی تایبەتی خۆی سەبارەت بە جیهانی فیلمەوە هەیە.

فیلم هیچ شتێك ناشارێتەوە. تەنانەت بچووکترین بزواندنی شلەژاوی لالێوی ئەکتەرێك دەبیندرێت. بەڵام لێرەدا چاو لە هەموو ئەندامەکانی لەش گرنگترە. ئەکتەرەکان دەبێ ئەو توانایەیان هەبێ هەر بە چاو ناوەڕۆکی سەرەکی دیمەنەکە دەربڕن. ئەگەر زمانی جەستە زۆر بە زەقی بەکارهات، ئەوا وەکو شانۆی لێ دێت و نابێتە مایەی باوەڕی بینەران.

زۆر گرنگە کەوا دەرهێنەر لە کاتی ڕێنمایی کردنی ئەکتەرەکان هەموو زانیارییەکانی خۆی و گشت لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ کەسایەتیەکان و هەست و نەستیان و ڕابوردوو و باری دەرونییان بەکاربێنێت.

بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی وێنەگرتنەکان بە پچڕپچڕی بەڕێوەدەچن. پێویستە بە ئەکتەرەکان بگوترێ و وەبیریان بهێندرێتەوە دیمەنەکانی پێشوو چۆن بوونە، تاوەکو جوولانەوە و چاوتێبڕین و کەش و هەواکە شێوەیەکی گونجاوی بدرێتێ.

ئەگەر هەڵەیەك هەبوو و پێویستی بە گۆڕان بوو لە *take* ی دواتر، ئەوا پێویستە زۆر بە ووردی بە ئەکتەرەکان و بە کارمەندانی تری تیپەکە بگوترێت. لە کاتی وێنەگرتندا گرنگە هەمیشە بیر و مێشك لەوپەڕی چڕبوونەوەدا بن.

پێویستە هەریەکێك لە تیپەکە جێگای باوەڕی دەرهێنەر بێت، چونکە هەرچەندە دەرهێنەر لە کۆشش و کاری ئەکتەرەکان ڕازی بێ، بەڵام پێویستە ئەوانی تریش هەر یەکەو بەشداری خۆی لە دیمەنەکەدا ئەنجام بدات.

کە کاتێك هەموو ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی دیمەنی مەبەست بە تەواوی ئەنجام دراوە ئنجا *scripter* [44] لە ڕاپۆرتی سکریپتدا دەنووسێ، کە کارەکە بێخەوشە و (با چاپ بکرێت).

زمانی فیلم و کاری فیلم بە گشتی لەو دە ساڵەی دواییدا یەکجار پەرەی سەندووە و کەوتۆتە ژێر کاریگەریەکی بە تینی میدیا ئەلیکترۆنییەکان، بە تایبەتیش ڤیدیۆی مۆسیقا و گۆرانی.

ئێمە لە دانمارك لە ڕیزی پێشەوە *Lars von Trier* مان هەیە کە بە درێژایی هەموو ژیانی سینەمایی خۆی ڕووبەڕوو بوونەوەی زۆر مەزنی خوڵقاندووە بۆ هەموو ئەوانەی لە فیلمەکانیدا بەشدارییان کردووە.

ئەو پیاوە قالبەکان تێکدەشکێنێ، و یاسای 180 پلە فەرامۆش دەکا ( سەیری وێنەیەی ژمارە 2 بکە ).

ئەو بۆ هەڵگرتنی کامیرا سەرشانەکانی وێنەگر زێتر لە سێپێك بەکاردێنێت، ئەو سێپێکەی هەمیشە لە هەموو شتێك گرنگتر بووە بۆ وەدەست هێنانی وێنەی » جوان.

هەروەها وای پێ باشترە ڕووناکی سروشتی بەکاربێنێ.

## وێنەگرتن

کلاکێت بۆتە سمبۆلی فیلم. لە ڕاستیشدا کلاکێت ڕۆڵێکی تەکنیکی سەرەکی دەگێڕێ.

وێنە و دەنگ هەر یەکەی بە تەکنیکی خۆی تۆمار دەکرێت. هەر یەکەیان بە تەنها ڕێکدەخرێت.

بۆ مسۆگەرکردنی ئەوەی دەنگ و وێنە بە هاوکاتی بەیەکەوە بڕۆن، هەموو وێنەگرتنێك نیشان دەکرێ. سەرەتای هەر دیمەنێك بە وێنەگرتنی ژمارەی دیمەنەکە و *take* کە دەست پێ دەکات، لە هەمان کاتدا *clapper* ئەم ژمارانە بە دەنگێکی بەرز دەڵێتەوە، ئنجا تەختەکە لە یەك دەدات. بەم جۆرە لە

سەر هەردوو شریتی وێنە و شریتی دەنگ نیشانەی هاوکاتی وەك یەك دادەنرێ.

دوای ئەوەی هەر دیمەنێك پرۆڤەی لەسەر دەکرێ، ئیتر تەواوی تیپەکە بۆ تۆمارکردن ئامادە دەکرێ. سینۆگراف بە ووردی بە دیکۆرەکان و ئێکسسوارەکاندا دەچێتەوە. بەرپرسی جل و بەرگ جلەکان بە شێوەی راست هەڵدەواسێ. بەرپرسی ئارایشت پۆدرە لە دەم وچاوی ئەکتەرەکان دەدا، نەوەکو لەبەر روناکی بریقێنەوە. دەرهێنەر بۆ دواجار رێنمایی کۆمبارسەکان[45] دەکات و داوایان لێ دەکات لە شوێنی دیاریکراویاندا ئامادەبن.

کە هەموو شتێك تەواو لە جێی خۆی بوو، جاری یەکەم وێنەیەکی گشتی تەواوی دیمەنەکە دەگیرێ (*establishing shot*) ئنجا لە دوای ئەوە وێنەیەکی نیمچە نزیك و پاشتریش وێنەیەکی نزیك دەگیرێ، هەروەها تەواوی دیالۆگەکە تۆمار دەکرێ. ئەو دیمەنانەی دیالۆگیان تیایە جارێ لە پێشدا رووی کامیرا لە یەکێك لە کەسەکان دەکرێ و هەموو وێنەکانی دەگیرێ، دواتر کامیرا و روناکی دەگوازرێنەوە ئەوبەر و ئاراستەی کەسەکەی تر دەکرێن. ئەم کارە زۆر جار وایە کاتێکی درێژ دەخایانێ.

لەبەر ئەوەی لەوانەیە هەندێ جار ماوەیەکی زۆری پێ بچێ لە نێوان وێنەگرتنی دوو هەڵوێستی ئەوتۆ کە لە کۆتایی فیلمەکەدا دەبنە تەواوکەری یەکتر، *scripter* (سەیری پەراوێزی ژمارە 1 بکە لە پێشتر) تێبینی و سەرنجەکانی خۆی دەنووسێتەوە سەبارەت بە جوڵانەوەی ئەکتەرەکان و جل و بەرگیان و درێژی جگەرەی دەستیان و ئاخۆ چاویلکەیان لە چاوە یان نا و ...هتد.

بەم جۆرە کە فیلمەکە مۆنتاژ دەکرێ مرۆڤ دڵنیا دەبێ لەوەی دیمەنەکانی فیلمەکە وەك ئالقەی زنجیر بە دوای یەکەوەن.

(*Scripter*) دەستەڕاستی پراکتیکی دەرهێنەرە. ئەو کەسە لە راپۆرتەکانی خۆیدا راستیە تەکنیکیەکان تۆمار دەکا لەمەڕ *take* ە جۆراوجۆرەکانی وێنەگرتندا کە زۆر زۆر گرنگن لەبەر پاش و پێشی.

## پێداچوونەوە

لە دوای تەواو بوونی وێنەگرتن، هەموو رۆژێك فیلمەکە رەوانەی لابۆر دەکرێت تا وەکو نێگەتیڤەکە بشوورێتەوە، و کۆپیەکی ئیش کردن لە هەندێ *take* ی هەڵبژاردە دروست دەکرێت، کە بۆ مۆنتاژ بەکاردێت. دەنگەکە دەخرێتە سەر شریتێکی موگناتیسی کە هەمان ئەندازەی شریتی فیلمەکەی هەیە و بە هەمان شێوە کون کون کراوە. بەم جۆرە وێنە و دەنگ لەسەر مێزی مۆنتاژ هاوکات دەکرێن.

ئەو *take* انەی هەڵدەبژێردرێن ( *rushes* یاخود *dailies* )[46] لە لایەن دەرهێنەرەوە تەماشا دەکرێنەوە و لەگەڵ وێنەگر و مۆنتێر و خەڵکانی تر پیایاندا دەچنەوە. ئەگەر هاتو شتێك پێویستی بە گۆڕان یان چاککردنەوە هەبوو، ئەوا دەبێ حیسابی ئەوەی بۆ بکرێت کە کاتی زێدەی بۆ دابنرێ.

هەر رۆژێ بە مەعەدەل نزیکەی دوو دەقیقە فیلم دێتە بەرهەم[47].

## ئیفێکتە تایبەتیەکان

لە کاتی وێنەگرتندا دەکرێت جۆرەها شێوەی جیاجیای ئیفێکتە تایبەتییەکان بەکاربێت، وەکو شاشەی شین (سەیری وێنەی ژمارە 3 بکە)، و بەکارهێنانی وێنەی سلاید لە پێشەوە یاخود لە

دواوە، و زۆر شتی تر کە بەکاردێن بۆ کۆکردنەوەی چەندین سەرچاوەی وێنە و شتی بینراو لە نێو یەك وێنەدا. هونەری ئەم کۆکردنەوەیە لەوەدایە کە پێشخان و پاشخان بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئاوێتە بکرێن کە کەس هەستیان پێ نەکات. لێرەدا کە ئێمە ئەوە ناو دەنێین هونەر لەبەر ئەوەیە، چونکە کارێکی یەکجار سەختە کە روونـاکی و رەنـگ و بـاری کۆنتراست و بەرجەستەیی و قووڵایی و زۆر شتی تر وا لێبکەیت کە لەگەڵ یەکتردا بگونجێن و بیانکەیت بە یەك. سەرەڕای ئەمەش دەبێ جوولانەوەی ئەکتەرەکانیش لە نێو ئەم جیهانە دەستکردەدا قەناعەتبەخش بێت، لە کاتێکدا ئەگەر زانیمان ئەوان لە کاتی وێنەگرتندا نە هەست بەم جیهانە دەکەن و نەدەشی بینن. دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کەوا ئەم ئیفێکتانە قەناعەتبەخش نابن ئەگەر لایەنی دەنگ بە چاکی لەگەڵی نەڕوا و پاڵپشتی شتە بینراوەکان نەکات.

### 3) پاشبەرهەم

کە وێنەگرتن تەواو بوو، دەرهێنەر لە نزیکەوە دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ مۆنتێیر سەبارەت بە داڕشتنی دوا شێوەی فیلمەکە. مۆنتێیر قۆناغێکی داهێنانی تازە بۆ دەرهێنەر دەست پێدەکات، کاتێك مەتریالەکە بە چاوێکی تازەوە تەماشا دەکات. بەڵام ئەمە متمانە و شارەزایی خولق و خو و تەبیاتی دەرهێنەرەکەی گەرەکە.

مۆنتێیر سەیری کاتی درامی دیمەنەکان دەکات، کە تەواو جیاوازە لە کاتی راستەقینە کە وێنەگرتنی دیمەنەکان بردوویەتی. بێگومان دەرهێنەر هۆشیاری ئەم شتانەیە لە دەرهێنانی خۆیدا، بەڵام یەکەم جار لە ژووری مۆنتاژدا مرۆڤ دەتوانێ ببینێ کەوا ئامانجەکەی پێکاوە. ئەگەر زانیمان مۆنتاژ هاوتەریب لەگەڵ وێنەگرتندا بەڕێوەن، ئەوا دەرهێنەر دەتوانێ راوێژکاریی زۆر بەنرخ لە مۆنتێیر وەرگرێت، ئەگەر هاتوو. هەر شتێك لە سەر رێی خۆی لایدا. یەکێك لەم شتانە لەوانەیە ئەکتەرێك بێت کە پێویست بکات تۆزێ توند و تیژی دەربڕینی لەشی کەم کاتەوە، یاخود لەوانەیە یەکێك لە رۆڵە لاوەکیەکان بێت کە لە تواناد‌ا بێت باشتر سوودی لێ وەربگیرێت، لەوانەشە زانیاریەکی بەسوود بێت تاوەکو دیمەنێك لە بار و شێوەیەکی تردا وێنەی زیادی بۆ بگیرێ. بەڵام بەشی زۆری کاری مۆنتاژ پەیوەندی بە تێپەڕوانین و تایمینگ[48] و ریتمەوە[49] هەیە، ئەگەر دیمەنەکان بە چاکی تەواو کرابن، ئەوا مۆنتێیر دەتوانێ دیمەنەکان لە لایەنی کاتەوە درێژ و کورت بکاتەوە، ئەگەر وای بینی کەوا ئەمە خەستبوونەوە و کەش و هەوای چیرۆکەکە بەرەو پێش دەبات.

هەروەها دەتوانێ پێشنیاری ئەوە بکات کە هەندێ لە دیمەنەکان پاش و پێش بکرێن، ئەگەر ئەمە لە لایەنی دراميیەوە کاریگەرتر بێت.

ئەو وێنانەی گیراون و لە کۆتاییدا لەبەر دەستان، زۆرجار لەگەڵ ئەو مەبەستانە یەك ناگرنەوە کە لە کاتی نووسین و پلان داناندا دیاری کراون. بیر و بۆچوونی تازە هەمیشە دێتە ناوەوە. بۆیە مۆنتاژ لە راستیدا قۆناغێکی نوێی داهێنانە، کە تیایدا فیلمەکە شێوە و بونیاتی خۆی دەدۆزێتەوە. لە کاتی وێنەگرتندا ئەوە رەچاو کراوە کە مۆنتێیر کۆمەڵێ دەرفەتی لەبەردەمدا بێت. وا باوە ئەو مەتریالەی لە کاتی وێنەگرتندا بەکار هاتووە دە قات زۆرترە لەوەی لە راستیدا لە فیلمەکە بەکار دێت.

## تەواو کردن

کە دوا کۆپی تەواو مۆنتاژ کرا و دوا رەزامەندی لەسەر درا، ئیتر رێکخستنی دەنگ

جێبەجێ دەکرێت. بەڕێوەبەری دەنگ لە کاتی وێنەگرتندا هەوڵ دەدا ئەوەندەی بتوانێ دەنگ 100× ساف تۆمار بکات، تاوەکو بتوانێ دەنگی کەش و هەوای گشتی لە دواتردا هەڵبژێرێ و لەم ڕێگایەوەش هۆشیارانە دەسەڵاتی بە سەر جۆری ئەو وێنە دەنگییەدا دەشکێ. دەنگ زۆر جار لە لایەن بینەران و ڕەخنەگران بایەخی پێنادرێ و پشت گوێ دەخرێ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بوارە پرۆسەیەکی داهێنانی دوور و درێژە کە بەڕادەیەکی بەرز یەکەی دراماتیکی پێك دەهێنێ. هەموو دەنگەکان فێڵیان لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام ئەگەر ویستمان چۆنایەتی (کوالیتی) بپارێزین، ئەوا پێویستە تۆمارکردنە ئەسلیەکە (ئۆریگینال) لەو پەڕی بەرزیدا بێت.

دەنگی کەش و هەوای گشتی و دەنگی ئیفێکتەکان پێویستە بە جۆرێك هەڵبژێردرێن کە ببنە تەواوکەری وێنە دەنگیە ئەسلیەکە.

لەم قۆناغەدا و لە دوای ئەوەی ئیفێکتەکانی دەنگ لەگەڵ وێنەکاندا هاوکات دەکرێن *stunt* [50] و ئیفێکتە تایبەتیەکان دەگەنە ریالیستیەتی خۆیان، واتا شێوەی تەواوی خۆیان وەردەگرن.

بۆ دروستکردنی ئیفێکتەکانی دەنگ زۆرجار یەکێك دەخرێتە کار کە پێی دەڵێن *geräuschmester*[51] کە بەرپرسیاری دەنگەدەنگە.

کۆمپۆنیست زۆر لە نزیکەوە لەگەڵ کاری مۆنتاژدا دەڕوات، ئیتر شێوازی مۆسیقا و تۆنەکانی ڕەوتە درامیەکە پتەو و بەهێزتر دەکات. مۆسیقاکە بە پێی پێویست بە چەندین چەشن لێدەدرێ بۆ بەهێز کردنی کەش و هەوای هەر یەکێك لە دیمەنەکان. ئەگەر هاتوو مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژەکان لە فیلمەکە بەدەرکەوتن ئەوا دەبێ تەکنیکی *playback*[52] بەکاربێت کە مۆسیقاکەی پێشوەخت تۆمارکراوە. لە کۆتاییدا هەموو ئەم تراکانەی[53] دەنگ تێکەڵ دەکرێن و دەکرێنە وێنەدەنگێکی ستیریۆ، کە لە پاشتر وەردەگێڕدرێن بۆ تراکەدەنگی روون[54] کە پێی دەگوترێ نێگەتیڤی دەنگ.

لە نێو لابۆردا نێگەتیڤە ئەسلیەکە بە پێی دوا کۆپی مۆنتاژ دەکرێت، کە کۆمەڵێك نمرە و ژمارە لەسەر ڕۆخی نووسراوە، ئەمەش بە ئاسانی لەگەڵ نێگەتیڤە ئەسلیەکە دەناسرێنەوە و یەکدیگر دەبنەوە.

ئیفێکتە بینراوەکان و تێکستەکان و نەخشە گرافیکیەکانیش بە هەمان شێوە لە لابۆر ڕێکدەخرێن و بە هۆی مێزێکی شووشە دروست دەکرێن.

لە کاتی وەرگێڕان و دروستکردنی کۆپی پۆزەتیڤ، ڕەنگ و باری کۆنتراست لە میانی پرۆسەیەك ڕێك دەخرێن کە پێی دەگوترێ فلتەر دانان. ئەمە زۆر پێویستە چونکە لە کاتی وێنەگرتندا ناکرێت هەمان تۆن بدرێتە گشت بارەکانی دیمەنەکە.

کە کۆپی پۆزەتیڤی یەکەم دەردەهێنرێ، تراکی دەنگیشی لەگەڵ کۆپی دەکرێت. بەم کۆپیە دەڵێن کۆپی ئەلف *A-copy*، بەڵام ئەمە بەدەگمەن بێخەوش دەبێت. کۆپی جیم *C-copy* بە ئاسایی کۆپیەکی زۆر تەواو (پێرفێکت) دەبێت. ئیتر لەمەوە کۆپی سینەماکان دەردەهێنرێ.

## دیگیتالکردن _ کەرەستەی تازە

تەکنۆلۆژیای کۆمپیوتەر لەم دە ساڵەی دواییدا بە شێوەیەکی تایبەت کارێکی زۆری کردۆتە سەر قۆناغی پاشبەرهەم، لە لایەك لە شێوەی نا ڕاستەهێڵیی ئەلکترۆنی پێش کارەکانی ژووری مۆنتاژ، لە لایەکی تریش دەرفەتەکانی

دیگیتالکردنی ئەو وێنە فلمییانەی بە ئاسانی شی دەکرێنەوە، بۆ چۆنایەتیەك (کوالیتی) کە هەرچەندە لێبدرێنەوە و سەیر بکرێن و بۆ دواوە هەڵبکرێنەوە، چۆنایەتیەکەیان هەر وەکو خۆی بمینێتەوە.

ڕێکستنی نا - ڕاستەهێلیی لەم دە ساڵەی دواییدا وەك شۆڕشێك وابووە لە بواری مۆنتاژدا. ئەمەش لایەنەکانی دەرفەتی تازەی هونەری و ژیربیری و ئابووری دەگرێتەوە. لە جیاتی ئەوەی پێویستت بە سەدان مەتر شریتی فیلم و دەنگ هەبێ، و شریتەکان بەیەکەوە ببەستیتەوە و گرێیان بدەیت، ئەوا هەموو ئەم کارانە بە ئەلکترۆنی دەکرێن و برینی فیلم تا رادەیەکی زۆر بە ووردی و بە هاوکاتی دەکرێت.

بەم جۆرە مۆنتێیریش دەتوانێ زۆر خێراتر کاربکات، بەڵام گرنگترین کاریگەریەك (ئیفێکتێك) کە مۆنتێیر و دەرهێنەر وەدەستی دێنن ئەوەیە، کە دەتوانن ژمارەیەکی زۆرتر لە جاران تەحرە مۆنتاژ هەڵسەنگێنن. ئیتر بەم شێوەیە ئەم تەکنۆلۆژیا تازەیە توانای داهێنانی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.

تەکنۆلۆژیای تازەی کۆمپیوتەر بۆتە سەکۆیەك (پلاتفۆرم) بۆ ئیفێکتە تایبەتیە دیدەییەکان[55] و ئەو ئیفێکتانەی لە لابۆرەکان دروست دەکرێن. ئەم تەکنۆلۆژیایە لە هەمان کاتدا شۆڕشێکی لە قۆناغی تەواوکردنی فیلمدا بەرپا کردووە.

قەوارەی *Harddisk* [56] ئەوەندە گشتگر بووە، بەڕادەیەك دەتوانێ هەموو وێنەکان بە هەمان توانای بەرزی شیکردنەوە هەڵگرێ، کە لە مەتریالی فیلم خۆیدا هەیە. ئەو فێڵە پێشکەوتووانەی لەگەڵ وێنەدا دەکرێ کە لە بواری رادیۆ و تەلەفزیۆندا زانراوە، لە بواری بەرهەمهێنانی فیلمیشدا بۆتە راستی.

## لە نێوان سەرکەوتن و شکستیدا

هیچ دەستوورێك نیە بۆ ئەوەی سەرکەوتنی پێ مسۆگەر بکرێ، جا ئەمە چ لە بواری ئابووری بێت و چ لە هونەری. لەگەڵ ئەمەیشدا لەم 25 ساڵەی دواییدا چەند ڕێبازێك هاتۆتە نێو کارسازی فیلمی دانمارکی لە پێناو کەمکردنەوەی مەترسی زیانی ئابووری و مسۆگەر کردنی چۆنایەتی لایەنی هونەری. بەڵام لە لایەکی تریشەوە ئەم ڕێبازانە بونەتە هۆی ئەوەی مەسرەفی بەرهەمهێنان لە بەرزبوونەوەدا بێت.

لە قۆناغە زووەکانی پێشبەرهەمدا بۆتە شتێکی ئاسایی کە شارەزایان و پسپۆڕانی خوێندنەوەی سیناریۆ زێتر لەجاران بەکاربهێندرێن، بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆرتر را و تەکبیری بە توانا بدرێتە کەسانی خاوەن بڕیار سەبارەت بە چۆنایەتی هەر فیلمێك لەم قۆناغەدا. ئەو کەسانە لەوانەیە نووسەرانی ئەوتۆ بن کە زانیاری و توانایەکی تایبەتیان هەبێ، یاخود پسپۆر بن لە دارشتنی دیالۆگەکان بە پەیوەست لەگەڵ شیکردنەوەی دەروونی[57]، یان گوزارەیی[58]، یاخود سیمبۆلیدا. بەڵام ئەم زۆربوونەش خۆی لە خۆیدا مەترسی (زۆر کابان) ی تێدەکەوێت.

هەرچەندە راوێژکارەکان لە **پەیمانگای فیلمی دانمارکی** لە میانی چەندەها ساڵدا هەوڵێکی دیاریان داوە بۆ پەرەپێدانی بیرۆکە و گەشەپێکردنی سیناریۆ، لە هەمان کاتدا هەوڵی ئەوەش دراوە دەرفەتی چاکتر برەخسێندرێت بۆ بنەمایەکی باشتر بۆ هەڵسەنگاندن، بەر لەوەی بەرهەمەکان رەت بکرێنەوە یاخود بڕیاری یارمەتیدانیان بدرێت. یارمەتیدانی قۆناغی پێشبەرهەم کە لە 80 کاندا هاتە ئاراوە، دەستپێشخەریەکی لەم بابەتە بوو.

پاشتر وای لێهات **پەیمانگای فیلم** پێش ئەوەی دوایین قسەی خۆی لەمەڕ یارمەتیدانی بەرهەمەکە بکات، مەرجی تری خستە سەر بەرهەمهێن. لە هەردوو شێوە پرۆژەکانی فیفتی فیفتی، یاخود ئەو پرۆژانەی راوێژکار یارمەتی دەدات، پێویستە لە لایەک بەڵێننامەیەک لەگەڵ دابەشکارێک ئیمزا کرابێت، و لە لایەکی دیش پلانێکی دەستبەکار و بودجەیەکی دەستبەکار ئامادە کرابێت.

قەوارەی تیپی کارکردن ساڵ بە ساڵ گەورە دەبێت. چەندەها پسپۆڕی تر هێنراونەتە نێو بەرهەمهێنان، فەرمان و ئەرکی تازەتر پەیدا بوون، وەکو بەرهەمهێنەری هێڵ (لاین) *line – producer*، و دراماتورگ، و *caster*، و یاریدەدەران و زۆری تر. ئەمەش بواری زێتری رەخساندووە تاوەکو بە درێژایی پرۆسەی بەرهەمهێنان بتوانرێ وردەکاریەکان بە پێی گرنگییان رێك بخرێن. ئەم کردارەش فاکتەرێکی زۆر گرنگە بۆ چۆنایەتی فیلمەکە. لە کۆتاییدا بەرهەمهێنە دانمارکییەکان خەریکن کۆپیەك لە فیلمەکانیان وەکو تاقیکردنەوە پێشانی هەڵبژاردەیەك لە بینەران دەدەن، تاوەکو تامی زاریان بزانن. خشتەیەك بەسەر بینەراندا دابەش دەکرێت کە چەند پرسیارێکی تێدایە. لە وەڵامی پرسیارەکاندا رای خۆیان سەبارەت بە ناوەڕۆك و شێوەی فیلمەکە دەردەبڕن. دەرهێنەر و مۆنتێر دەتوانن لە دواتر کەم و زیاد فیلمەکەیان چاك بکەن و لەوانەشە جارێکی تریش وەکو تاقیکردنەوە پیشانی بدەنەوە.

فیلمی **شکاندنی شەپۆلەکان**[59] چوار جاران پێشان درا بەر لەوەی **لاس ڤۆن تغییەی** دەرهێنەر دوا کۆپی هەڵبژێرێت کە ئێمە لە سینەماکان بینیمان.

کاری دراماتورگیش بە درێژایی قۆناغی پاشبەرهەم بەردەوام دەبێت.

لە کاتی بەرهەمهێنانی فیلمی **دڵخەبەردانی خاتو سمیلا لەمەڕ بەفرەوە**، و لەبەر دڵنیایی نەبوون لەوەی کە کۆتاییەکەی *Peter Høeg*[60] بە کەڵکی ئەوە دێت بکرێت بە کۆتایی فیلمەکە، بەشێکی زۆر مەتریاڵی زیادە وێنە گیرا، تاوەکو لە کاتی مۆنتاژدا ماوەی ئەوە هەبێ کۆتاییەکی تر هەڵبژێردرێ، جودا لەوەی لە سیناریۆکەدا نووسراوە. ئەم مەسەلەیە ئەوەمان پێشان دەدات کە بەرهەمهێنانی فیلم چەند مەترسی تێدایە. هەروەها دانانی ئەم هەموو کۆڵەگەی پشتقایمکردن و دڵنیابوونە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کەوا ژمارەیەکی زۆر لە دەرهێنەران کەوتونەتە ژێر باری تەوژمی ستەمێکی زۆر، هەرچەندە لە سەر ئاستێکی دیاریکراودا شتێکی ئاساییە کە خاوەن پارە مەرجی ئەوەی هەبێ کە پارەکەی خۆی بێتەوە دەست.

## پەراوێزەکان

1-خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرە لە زانستی فیلم. فیلم و ڤیدیۆ و بەرهەمی تەلەفزیۆن. تا ساڵی 1996 مامۆستا بووە لە زانکۆی کۆپنهاگن و لەمەڕ هەواڵدەری و رەخنەی وێنە و دەنگ، و نەخشەی بەرهەمهێنان وانەی گوتووتەوە.

2-واتا فیلمی درێژ کە لە رێگای نواندنەوە چیرۆکێك دەگێڕێتەوە. ئەم جۆرە فیلمە جودایە لە فیلمی دوکومەنتار و فیلمی تەلەفزیۆن و فیلمی کورت و...هتد.

3-دەکاتە نزیکەی 2 ملیۆن دۆلار.

4-باڵاترین دەزگای رەسمییە بۆ کاروباری فیلم لە دانمارك، نەك شوێنی خوێندنی زانستەکانی فیلم وەك ناوەکەی بە هەڵە ئاماژەی بۆ دەکات.

5-چارەسەر، کە عەرەبەکان کردوویانە بە (معالجە).

6-وەڵامی پرسیار لە بارەی چۆنیەتی بە دراماکردن.

7-ئەنجامی کردارەکانی نێو دراماکە.

8-*intern - extern*

9-پێشبەرهەم، ئەو قۆناغەیە لە کاری فیلمدا کە دەکەوێتە پێش دەستکردن بە وێنەگرتن، لەم بەشەی دواتر زێتر روون دەکرێتەوە.

10-پاشبەرهەم، ئەو قوناغەیە کە دەکەوێتە دوای تەواوبوونی وێنەگرتن.

11-رێککەوتننامە، بەڵێننامە، تەعاقود.

12-سەرمایەی نەختی (بۆ مەبەستی تایبەتی)، خەزینەی دارایی، سندوقی دارایی.

13-مستثمر

14-فیلمەکە لە شێوەی کۆتاییدا.

15-شوێنی وێنەگرتن لە دەرەوەی ستۆدیۆ.

16-واتا بە بەردەوامی لەسەر کار دانەمەزراون. کە ئیش هەبێ ئەوا خەریکن، کە تەواو بوو ئەوانیش بێکار دەبن.

17-*Coproduction* بەرهەمی هاوبەش.

18-بەرپرسیاری دیکۆر و شوێنی روودانی دیمەنەکان.

19-کاری ئارایشت کردن.

20-دانەری مۆسیقا.

21-کارمەند و پسپۆری بڕینی فیلم.

22-*Style*، عارەبەکان (اسلوب) ی پێ دەڵێن.

23-تەعبیری

24-ئینتیباعی

25-واقیعی

26-لاس ڤۆن تغییە، بێلا ئاوگۆست، و سۆرین کخاو یاکۆبسن سێ دەرهێنەری دانمارکین کە لەسەر ئاستی جیهانیدا بەناوبانگن.

27-هاوچوونیەك، یەکشێوە.

28-*Special effects* ، مؤثرات خاصة.

29-نیگارکێشانێکی ووردی یەکە یەکەی وێنەکانە بە پێی سیناریۆ.

30-ئەو کەسەی کە *casting* دەکات، واتا رێکخستنی کاروباری هەڵبژاردنی ئەکتەرەکان.

31-واتا دەربڕین بە هۆی ئەندامانی لەشەوە.

32-ئەندازیاری نەخشەی بیناسازی.

33-نووسەری ئەم ووتارە ( سەرۆکی وێنەگران) ی بەکار هێناوە.

34-دروستکردن و پێکەوەنانی پێکهێنەرەکان لە نێو چوارچێوەی وێنەیەکدا.

35-*B- fotograf*

36-(*focus -puller*) بردنەپێش و راکێشانە دواوەی وێنەکەکان بە رادەی پێویست.

37-*gaffer*

38-*dolly*

39-ووشەی *Clap* بە مانای چەپڵە دێت چونکە شەققەی تەختەدارەکە وەك دەنگی چەپڵە وایە کە بەیەك دەکەوێ.

40-کلاکێت، ئەو تەختەدارەیە کە هەر جارەی ژمارەی دیمەنێکی لەسەر دەنووسرێ، لە کاتی وێنەگرتندا لە پێش دیمەنی دیاریکراو دەکەوێتە سەر شریتی فیلمەکە تا لە کاتی مۆنتاژ دیمەنەکان تێکەڵ نەبن و کارەکە ئاسان بێت.

41-بەکارهێنانی میکرۆپۆرت یاخود بووم.

42-*Boomer* یاریدەدەری دەنگ و راگرتنی مایکرۆفۆنەکان.

43-هەرجارەی کە وێنەی دیمەنێك دەگیرێ، لەوانەیە پێویست بکات زێتر لە جارێك وێنەکە دووبارە بکرێتەوە، ئیتر جاری یەکەم دەبێتە *take 1* و دووبارە کردنەوەی یەکەم جار دەبێتە *take 2* و..هتد.

44-سکریپتەر، ئەو کەسەیە چاودێری دیمەنەکانە، نەوەك شتێك یان گۆڕانێك بە هەڵە لەبیر بکرێت.

45–ئەو کەسانەن کە لە کاری هونەریدا ( فیلم, شانۆ) هیچ قسەیان نییە, بەڵام بوونیان پێویستە.

46–لای خۆشمان هەر ووشەی (ڕیشین) باوە، *dailies* بە مانای ئەو کارانە دێت، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەنجام دەدرێن.

47–لێرەدا مەبەست دوو دەقیقەیە لە دوای مۆنتاژ.

48–*Timing* ڕاگرتنـــــــی کـــــات و هاوکـــــاتی شتەکان و ڕووداوەکان و هێنانیان لە کاتی پێویست و گونجاودا.

49–ئیقاع

50–ئەنجامدانی جووڵانەوە و ڕاهێنانی ئەکرۆباتیك و پـڕ مەترسـی کـە لـە لایـەن جێگرەوەیـەکی ئەکتـەرە سـەرەکیەکە ئـەنجام دەدرێ. ئـەم جێگرەوەیـە پێـی دەگوترێ *stuntman*.

51–*Geräusch* ووشـــەیەکی ئەڵمانیـــە بـــە مانـــای دەنگەدەنگ و غەڵبە غەڵب دێت.

52–دۆبلاج

53–تراك بە مانای هێڵێکی دیاریکراو دێت، کە لەسەر شـریتەکاندا دەنـگ یـاخود مۆسـیقای لەسـەر تۆمـار دەکرێت.

54–ڕوون، کە دیوی ئەودیویشی دەبینرێ.

55–ئەوانەی لەبەر چاون

56–هارددیسـك، ئـەو جێگایـەی زانیاریـەکانی تێـدا هەڵدەگیرێ لە نێو کۆمپیوتەردا.

57–ڕێبازەکـــەی ســـیگمۆند فرۆیـــد لـــە زانســـتی دەروونناسیدا.

58–مەجازی

59–*Breaking the Waves*

60–نووسـەری ئـەو ڕۆمانەیـە, کـە فیلمەکـەی لەسـەر هەڵچنراوە.

## سەرچاوە

لە کتێبی *Dansk Film 1972 – 1997* وەرگیراوە کە لە ساڵی 1997 لە لایەن دەزگای *Munksgaard & Rosinand* لە کۆپنهاگن چاپ کراوە.

بڕوانە نەخشەی لاپەڕەی (106)

# گفتوگۆیەك لەگەڵ د. فەتحی ئەلتریکی

## کۆمەڵگە داخراوەکان بڕوایان بە ئەقڵ نییەو تیایاندا ئەقڵی زانستی ئاوێتەی ئەقڵی سیاسی بوە

سازدانی: ڕەزا ئەلمەلولی
لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

### فەلسەفەی هەمەڕەنگ

❑ **لەکۆتایی حەفتاکانەوە بانگەوازی فەلسەفەی فرەڕەنگ ڕادەگەیەنی, مەبەستت لەم فەلسەفەیە چییە؟**

❖ لە ڕاستیدا کاتێك لە کۆتایی حەفتاکاندا کتێبێکم سەبارەت بە فەلسەفەی فرەڕەنگ نووسی, خەمی سەرەکیم داکۆکیکردن بوو لە فەلسەفەیەکی کراوە کە مافی جیاوازبوون و فرەڕەنگی بۆ فیکر بچەسپێنێ. لە بنچینەدا ڕەخنەی من ئاراستەی تیۆری مارکسیزم کرابوو, بەو شێوازە دیکتاتۆرییەی لە یەکێتیی سۆڤیەت جێبەجێکرابوو. هەروەها ئەوەم ڕوونکردبوەوە کە فەلسەفەکەی مارکس تەواو دژی مارکسیزمە, چونکە مارکس بڕوای بە تاك و کاری ڕۆژانەی تاك هەبوو لە کۆمەڵگەدا...

فەلسەفەی فرەڕەنگ داخران قبوڵ ناکات, بەڵکو کرانەوەی فیکرە بەڕووی خەمەکانی خەڵك و هەوڵدانە بۆ ڕاهێنانی کۆمەڵگە لەسەر قبوڵکردنی جیاوازی. بۆیە ئەو فەلسەفەیە دژی سەرتاپاگیری و ناسنامەچێتی بوو, مەبەست بەکارهێنانی تەکنیکە نوێکانە لە کۆمەڵگەدا, بە مەبەستی ملکەچکردنی تاك بۆ دەسەڵاتێکی ناوەندی (بۆ نموونە ئەمریکا).

### چەمکی دەوڵەت

❑ **لە نووسینێکدا بە ناونیشانی: "چەمکی دەوڵەت لە بواری فەلسەفەی هاوچەرخدا" (گۆڤاری "الفکر العربی المعاصر" ژمارە 1983/24) جەغت لەسەر ئەوە دەکەیتەوە نابێ دەوڵەت بکەینە شتێکی ئەبستراکتی ڕووت کە هیچ پەیوەندییەکی بە واقیعی تیاژیاوەوە نییە, واتە تەنیا بە وێناکردنێکی کۆمەڵایەتی یان پێودانگێکی یاساکان و مافەکانی دانەنێین. هەروەها نابێ تەنیا لەڕووی واقیعی بابەتی و مادییەوە تێیبڕوانین و بە کۆمەڵێك فرمان و**

**دامودەزگـــــای دابنـــــێین... پێدەچـــــێ ئـــــەوە ڕەتدەکەیتـــەوە چـــەمکی دەوڵـــەت لـــەنێو چوارچـــێوەی ئەبســـتراکتخوازی یـــاخود بابـــەتیخوازیی هەســـتپێکراودا قەتیسبکەیت... کەواتە لە چ چوارچێوەیەکدا ئـەم چـەمکە دیاریدەکەن؟!**

❖ دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان مانای وشـەی دەسەڵات و وشەی دەوڵەتدا.. چونکە دەسەڵات مانای توانای تاکێك یان گروپـە کەسێکە بۆ ئـەوەی بـەهۆی فرمـــان دەرکـــردن, ڕێگـــەگرتن, یاســـاخکردن و ســزادانەوە هــەموو ئــەو مەســەلانە جڵــەوبکات کــە پەیوەنـدیی بـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی خۆیـەوە هەیـە... بـەم پێیـە وشـەی (دەسـەڵات) لـە دەوری دوو مانـای بنچینەیی دەخولێتەوە:

- مانـــای یەکـــەم توانـــای کارکردنـــە لـــە دنیـای سروشـتی و بـواری پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیـە مرۆییەکاندا بۆ هێنانە دی خواستەکانی مرۆڤ.

- مانـای دوەم ئـەو دامودەزگایانـە دەگرێتـەوە کـە هاوســـەنگییەکی پێگەیشـــتوو بـــۆ کۆمەڵگـــە مســـــــۆگەردەکەن, ئــــــەو هاوســـــــەنگییەی بەرژەوەندییـــەکانی خـــەڵك گرێدەداتـــەوە بـــە ئامانجەکان و پێداویستییەکانی گروپەکەوە.

کەچی دەوڵەت پێویستی بە قەوارەیەکی تـەواوی دەسـەڵات هەیـە بـە هـەردوو مانـای (توانا و هێـز) کە کۆمــەڵێك دەســتوور و یاســا جڵــەوی دەکــات. ئــەم قەوارەیەش لەو دامەزراوە شارستانیانەدا بەرجەستە دەبـێ کـە پشـت بـە دووجـۆر کـار دەبەسـتن: کـاری ڕۆشنبیریی ئایدیۆلۆژی و کاری ئاسایش و سەربازی کە پەنا بە توندوتیژیی ڕەوا دەبات.

بەو جۆرە ناکرێ دەوڵـەت بـە بیرۆکەیـەکی دابڕاو لــە ژیــان و پێداویســتییەکانی دابنــێین و ناشــتوانین تـەنیا بـە پاشـکۆی ئـەو ژیانـە بژێوییـەی دابنـێین... واتـــە دەوڵـــەت ئەبســـتراکتکردنە, بـــەڵام هاوکـــات بەرجەستەکردنیشـە... واتـە مـاکس ڤیبـەر وتـەنی, دەبـێ دەوڵـەت بـەرزترین پایـەکانی فیکـرو پایـەکانی توندوتیژی و هێز لـە کۆمەڵگـەدا بەدەسـتەوە بگرێت, ئەگـەر پـاوانکردنی فیکریشـی مسـۆگەرنەکرد, ئـەوا پـاوانکردنی توندوتیـژیی ڕەوای دەسـتور بـۆدانراو دابین دەکات, چونکە دەوڵـەت دەسـەڵاتی سـەروەریی ناوەکی و دەرەکی هەیـە, بۆیـە بـەو قـەوارە سیاسـی و یاسـاییە دانـراوە کـە دەسـەڵاتی سـەروەری هەیـەو پشت بە توندوتیژی ڕەوا دەبەستێ لەناو سنوورێکی جوگرافی دانپیانراودا.

## کۆمەڵگەی سیاسی

❑ **هەندێك بیریار (وەك عەبدوڵڵا ئەلعـەرەوی) هـەن پێیانوایە ناتوانین میکافیلیەت ڕەتکەین, لەو کاتەدا نەبێ کە ڕزگارمان بووبێ لەو کۆمەڵگەیەی سیاسەت بەرهەمدێنێ... پێتانوایە ئەم بیروڕایە ڕاستە؟ بەدەربڕینێکی دی, ئایا دەشـێ کۆمەڵگەیەك هەبێت لە بەرهەمهێنانی سیاسەت بکەوێت؟!**

❖ هـەرگیز نـاتوانین وێنـای گرتبوونەوەیـەکی خەڵك بکەین بەبێ ئەوەی تاکـەکانی سیاسـەت بکـەن, چونکە سیاسـەت بـەواتا گریکییـە سـەرەتاییەکەی لـە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەیە... بۆچی؟!

لە هەر کۆمەڵگەیەکدا کۆمـەڵێك دەسـتوور و هێما هەن کە ژیان بە هـەموو ڕەهەنـدە جۆراوجۆرەکانیـەوە (ئـابووری, ڕۆشـنبیری, کۆمەڵایـەتی, دامـەزراوەکان) ڕێکدەخـــەن... هاوکـــات هـــەموو کۆمەڵگەیـــەك بەشـێوەیەکی سروشـتی هەوڵـدەدات ڕەوایەتیـەکی تایبەت بەخۆی بەرهەمبهێنێ, کە جارێك ڕەهەندێکی کەلـەپووری دەبێـت و جـارێکی دیکـەش ڕەهەنـدێکی کاریزمـــــــایی و لـــــــە دەوری "ســـــــەرکردەی خۆشەویســـت"(تاکە ســـەرکردە) کۆدەبێتـــەوە. بـــە بەرهـــەمهێنانی ئـــەم ڕەوایەتیـــەش کۆمەڵگـــە هاوسـەنگییەکی تایبـەت بـەخۆی دێنێتـە ئـاراوە کـە

بەرژەوەندی تاکەکان گرێدەداتەوە بە بەرژەوەندیو ئامانجە گشتیەکانەوە...

### شارستانیی سیاسی

❑ **لە کۆمەڵگەکانی خۆماندا دەسەڵاتی ڕەهای کۆمەڵگەی سیاسی زاڵە بەسەر کۆمەڵگەی شارستانیدا... پێتانوایە ڕێگایەك هەبێت سنوور بۆ ئەم دەسەڵاتە دابنێت تا زەمینە بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی شارستانی خۆشبێت، بەتایبەتی کە ئیمڕۆ دیاردەی خستنەگەڕی سیاسیانەی ئایین لەگۆڕێیە؟!**

❖ فیکری سیاسیی عەرەب بەشێوەیەکی گشتی هاوسەنگیی تایبەتی خۆی لەڕێگەی لەقاڵبدانی ژیانی سیاسیی کۆمەڵگەکانمانە بەدەست نەهێناوە، چونکە ئەم فیکرە هەمیشە لە دۆخی پرسیارکردنەوەی بەردەوامدا بوە سەبارەت بە: مامەڵەکردنی ڕۆژانەی دەسەڵات لەگەڵ تاکەکانو بنیاتنانی ڕەوایەتیەك کە بەردەوامیو چالاکی بۆ مسۆگەردەکات. بۆیە فیکر بەگشتی ڕوویکردۆتە دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە، بۆ ئەمەش جارێك ڕەوایەتی خۆی لە کەلەپووری ئایینیەوە بەدەستهێناوەو کردویەتیە قەڵایەکی "تۆکمە" دژی پلانەکانی ئاقارە ململانێکارە دژ بەیەکەکان، جا بەشێوەی ئاشتیخوازانە بووبێ یان توندوتیژانە، بەو پێیەش ئەم ئایدیۆلوژیا ئایینیە ناتوانێ ناکۆکیو جیاوازی قبوڵبکات. جارێکی دیکەش ڕەوایەتی هەوڵیداوە پشت بە ئێستا ببەستێ، بە ئاڵۆزیی کێشەکانو هەمەڕەنگیی دەرهاویشتەکانیەوە، بۆ ئەوەی بەڕووی داهاتوودا کراوەبێتو بەو پێیەش فیکرێکی پێشکەوتنخوازانە بنیاتبنێ کە پشت بە ئەقڵی زانستیو تەکنیکی دەبەستێ. بەو جۆرە کۆمەڵگەکانمان لەنێوان ئەم دوو ڕەوایەتیەدا لە جووڵدا بوون و فیکری سیاسیی عەرەب هەتاکو ئێستاش نەیتوانیوە ئەو بازە چۆنایەتیە بدات کە بتوانێ بۆ دواجار ڕەوایەتی یەکەم بخاتە لاوەو تەنیا پشت بە ڕەوایەتی دوەم ببەستێ. لێرەدا جیاوازی لەئارادا دەبێ، بەڵام لە تەکنیكو چۆنیەتی ڕەوایەتی دوەمدا.

ئەمە مانای ئەوەیە دیاردەی سیاسی بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا نابێ ڕەوایەتی فیکری شارستانی وەلاوەبنێ. ئەگەر ئەوەی کرد، ئەوا ئەو کۆمەڵگانە دەکەونە ژێر باڵادەستیی توخمە غەیبییەکانەوە کە مرۆڤ هیچ بەرژەوەندییەکی لەوەدا نییە! دەشێ بشبێتە هۆی دامەزرانی فەرمانڕەوایەتیەکی دیکتاتۆریی فاشی کە باڵادەستی تاکەکەسێك یان گروپە کەسێك لەگۆڕێ دەبێو لەژێر ئایدیۆلوژیایەکی کەلەپوورخوازدا خۆی حەشاردەدات بۆ هێنانەدی خواستو بەرژەوەندیی تایبەتی.

### مەترسیی سەرتاپاگیری

❑ **سەرنگونکردنی ئەقڵەکان، زاڵبوونی ڕەقهەڵاتن، دەستڕۆیشتنی ئاسایش ئەو دیاردانەن کە چەندین وڵاتی عەرەبی جۆراوجۆر ڕەنگدەکەن... بەبڕوای تۆ دەرچوون لە بازنەی ئەو ڕەوتە داخراوانە چۆن دەبێ کە مژدەی سەرتاپاگیری دێنن؟!**

❖ دەبێ لەوە بگەین ئیمڕۆ سەرنگونکردنی ئەقڵ لە جیهانی عەرەبی ئیسلامیدا دەکەوێتە چوارچێوەی ئەوەی ناومان نا چەسپاندنی ڕەوایەتی یەکەم، چونکە ئەم ڕەوایەتیە هەرگیز لەگەڵ ئەقڵدا هەڵناکات. تەنانەت ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کۆمەڵگە یۆنانییە سەرەتاییەکانیش، دەبینین بنیاتنانی ئەقڵ (لۆگۆس *Logos*) هاوکات بووە لەگەڵ بنیاتنانی

دیموکراسیداو ئەوە دیموکراسی ئەسیناش بوە دەرفەتی داوەتە بەریەککەوتنی ئەقڵەکان و ئەوەی بەرهەمهێناوە کە پێی دەڵێین فیکری ئازادی رەخنەگرانە (فەلسەفی)، فیکرێك کە دەتوانێ بەکاری شیکردنەوە، روونکردنەوەو دەستنیشانکردن هەڵسێت، بۆ ئەوەی زانا یان پزیشك یاخود سیاسی بتوانێ ریفۆرم یان چارەسەر ئەنجامبدات، چونکە کۆمەڵگە داخراوەکان بڕوایان بە ئەقڵ نییەو بەکاری ناهێنن بۆ گەران بەدوای راستیو ریفۆرمدا، لەبەرئەوەی لەو کۆمەڵگانەدا ئەقڵی زانستی ئاوێتەی ئەقڵی سیاسییەو بیریار سیاسەتمەدارە، واتە جیاوازی نییە لەنێوان فیکر و کارداو دەرفەتی گفتوگۆو هەڵکردن لەئارادا نییە.

## رۆڵی رۆشنبیر

❑ **زۆرجار بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ رۆشنبیر دەکرێ کە رۆڵێکی پێشرەوانەی هەیە لە کۆمەڵگەداو ئەرکی بلاوکردنەوەی هۆشیاریو وەبرەوخستنی رۆحی ئازادیخوازانەی دەکەوێتە سەر شان... سنووری رۆڵی رۆشنبیر لەکوێدایە؟ ئایا بەراستی ئەو رۆڵەی پێسپێردراوە؟!**

❖ من خاوەن میتۆدێکی ئەفلاتۆنیانەم، چونکە پێموایە رۆشنبیر رۆڵێکی بچینەیی هەیە، ئەویش بەر لە هەر شتێك دۆزینەوەی راستیو سەرقاڵبوونە بە کاری فیکرییەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانێ ئەو بەو راستیانە ئاشنابێت، ئەگەر گوێ هەڵنەخات بۆ خەمەکانی خەڵكو نەتوانێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکاتو (دوسانتی) وتەنی نەکارێت خۆراکی مەعریفەو زانستو فیکریان بداتێ، چونکە پرۆسەی هۆشیارکردنەوە بەر لەهەرشتێك ژیانە لەگەڵ مەسەلە کۆمەڵگەییەکانداو ئەوەیە رۆشنبیر بچێتە سەر شەقامەکان بۆ داهێنانو بەشداریکردنی رۆژانە لە خەمو مەسەلەو کێشەکانی خەڵکدا. ئەمە مەسەلەیەکە ئێمە لە کۆمەڵگە عەرەبییە ئیسلامیەکاندا زۆر پێویستیمان پێیەتی، چونکە مانای چەسپاندنی چەمکی بنەرەتیی ئازادیو مەشقکردنە لەسەر کارپێکردنی ئەو چەمکە، لەبەرئەوەی ئازادی لە بیرکردنەوەی مندا لە هەموو شتێکدایە (ئایین، ئەدەب، فەلسەفە، پیشەسازیو سیاسەت)و مەبەستم لە ئازادی مافی ملکەچنەبوونی تاکە لە کۆمەڵگەدا بۆ هیچ شتێك جگە لە یاسا گشتییەکان. ئەم بیرۆکەیەی دوایی هێشتا پەی بە ژیانی گشتی نەبردوەو لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هێشتا تاك رۆڵی یاسا دەبینێو بەداخەوە ملکەچی تاکو ئێستا بۆ تاکەکەسەکانە نەك بۆ یاساکان!

ئازادبوونی تاك لە سەردەمەکەماندا مانای ئەوەیە مافی دەربڕینی ئاشکرای بێ پەردەپۆشکردنی بیروڕا، فەلسەفە، ئایینو بڕوای خۆی هەبێت، هەروەها مانای مافی هەڵبژاردنی شێوازی ژیانو ئازادیی گواستنەوەو تێکەڵبوونە لەگەڵ خێزانەکەو کۆمەڵگەکەی خۆیدا...

## دەوڵەت و ئایین

❑ **هێشتا مەسەلەی پەیوەندیی دەوڵەتو ئایین سەر قافڵەی بابەخێدانەکانی فەلسەفەی سیاسییە... لەروانگەی فەلسەفییەوە چۆن دەروانە ئەم پەیوەندییە؟!**

❖ کاتێك ئایینو دەوڵەت پێك هاوتا دەکەین، لە بناغەدا هەڵەیەکی گەورە دەکەین، چونکە بەو واتایەی ئێمە سەبارەت بە دەوڵەت دواین، ناتوانین ئەو دوانە هاوتابکەین. ئایین لە روانگەیەکی فەلسەفیی رووتەوە، لە بنچینەدا بایەخ دەدات بە بڕوا ناوەکییەکانی تاكو لێکدانەوەکانی بۆ بوونو کۆمەڵگە. لە کاتێکدا دەوڵەت ئەو دامودەزگاو

یاسـایانەیە کـە لـەدەرەوەی تـاکن, ئەگەرچـی لـە ویسـتی ئـەوەوە سەرچـاوەش دەگـرن... شـایانی باسـە, ئـەم هەڵەیـە لـە مێـژوودا ڕۆڵێکـی فرەلایـەنی بینیـوە لـە حـوکمڕانیکردنی گەلانـدا, چـونکە گـەلێك جـار پێکهاتـەی ئایـدیۆلۆژی خوڵقانـدوەو دەوڵـەت هاوشانی پێکهاتە سەربازییەکانو ئاسایش بەکاری هێنـاوە بـۆ بڕواپێهێنـانو سـەرپێدانەواندن. ئەمـە لەکاتێکدا دەوڵـەتی نـوێ لەسـەر بناغـەی فێرکـردنو ڕۆشـنبیری دادەمــەزرێ کـە بـۆ خۆیـان توخمگـەلی بالادەســتیی فیکــریو ئایــدیۆلوژین. بۆیــە دژی ئـەوەم لـە کۆمەڵگـە هاوچـەرخەکانماندا ئـایین بـە دەوڵەتـەوە بنووسـێنرێت, تـا ئـایین هـەڵکردن بێـتو دەوڵەتیش بەزەیی.

## ئایین و کۆمەڵگە

**❑ سـنووری پێکگەیشـتنو نـاکۆکی نێـوان ڕۆڵـی ئایین لە ژیانی دەوڵەتو ڕۆڵی ئایین لـە ژیـانی کۆمەڵگـە لە کوێدایە؟!**

❖ ناکۆکییـەك هەیـە لـەنێوان ئـەرکی ئـایین کـە بریتییــە لـــە هۆشـــیارکردنەوەی ئایدیۆلۆژیانـــە بـــەهۆی ئایینـــەوە (چـــونکە ئـــایین یەکێکـــە لـــە توخمـــە بنچـــینەییەکانی کـــاری ئایـــدیۆلۆژی وەك فێرکــردنو ڕۆشــنبیری)و ئــازادیی بیروبــاوەڕ کــە پێویستی بەوەیـە تـاك لـە بـڕواو تێڕوانینـی خۆیـدا تــەنیا ملکەچــی خــۆی بێــت. لــە ڕاســتیدا ئــەم ناکۆکییە شتێکی چاك دەخوڵقێنێ, چونکە دەرفەت بـۆ گەشـەکردنی قـەوارە ئایینیـەکانو فێرکردنـی ئــایینیو ڕزگــاربوونی ئــایین لــە ڕێکخســتنی کۆمەڵایــەتیو سیاســی دەرەخســێنێو وادەکــات ئــایین ببێتــە پەیوەنــدیی تــاك بــە خوڵقێنــەری خۆیەوەو هیچی تر.

ئەم ناکۆکییە بەشێوەیەکی گشتی ئاینی ئیسلام ناچــاردەکات بــەرگێکی ژێوارییانــە بپۆشــێ کــە پەرسـتکاریو نزیکبوونەوەیـە لـەخوداو هیچـی تـر. واتـە ببێتـە بـڕواو چاکەخوازیو لـە سیاسەتچێتیدا نقووم نەبێت.

## ڕێنسانس

**❑ هەنـدێ بیریـاری عـەرەب ڕۆشـنبیریی عـەرەبو ڕۆشنبیریی خۆرئاوا بەرامبەر یـەکتر ڕادەگـرن... پێیانوایـە ڕێنسانسی عـەرەبی خەیاڵپلاویـە, لەبـەر نـەبوونی هـەردوو مەرجی ئازادیو ئەقلانیەت لە پێکهاتەی فیکریی عەرەبدا... ڕاتان بەرامبەر بەم دادوەرییە بەهاخوازە چییە؟!**

❖ بەشـــێوەیەکی گشـــتی ئـــەم لێکدانـــەوە میکانیکیـــە بـــۆ بیرۆکـــەی ڕێنســـانسو نوێکـــاری ڕەتدەکەمـــەوە, چـــونکە مەحاڵـــە لـــە کۆمەڵگـــە جیاوازەکانـدا هـەمان مەرجگـەلێکت هـەبێ بـۆ ئـەوەی هـەمان کـار و مەسـەلە ڕووبـدەن. هـەر کۆمەڵگەیـەك تایبەتمەنـدی, هەلومـەرجو دەرهاویشـتەی خـۆی هەیـەو نوێکـاریش چـەندین نوێکارییـە نـەك تاقـە نوێکارییـــەك. لەمێشـــکی ئێمـــەدا نوێکردنـــەوە پڕۆسـەیەکە یـان کۆمەڵـە پڕۆسـەیەکە لـەناو خـودی کۆمەڵگـەداو دەبێتـە هـۆی: گەشـەکردنی هێزەکـانی بەرهـــەمهێنان, پەرەســـەندنی هێزەکـــانی کـــار, هـــاودەمکردنی بـــەها, یاســـاو دەســـتوورەکانو سـوودوەرگرتن لـە کۆمەڵگـەکانی دەوروبـەر. بۆیـە ناتوانین بڵێین ڕێنسانس لە ناوەڕۆکدا خۆرئاواییە, چـونکە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا سـوودی لـە زانسـتەکانو مەعریفـەکانی عـەرەبو هیندسـتان وەرگرتـوەو گەڕاوەتـەوە بـۆ فەلسـەفەی گریکـی. هەروەها ئێمە ئێستا لە گۆڕانکارییە ناوەکیەکانماندا سـوود لـە دۆزینـەوە زانسـتیو تەکنۆلۆژییـەکانی

کۆمەڵگەکانی دەوروبەر وەردەگرین... ئەمەش مانای ئەوەیە نوێکاری یان ئازادی یاخود ئەقلانیەت پیوار نییە, هەموو ئەوانە لە کۆمەڵگەکانماندا هەن و بنەچەیان لە مێژوو و ژیوارماندا هەیە, بەڵام هێشتا ئەو پشتگیرییە ڕۆشنبیری و فیکرییە گشتییەیان بەدەست نەهێناوە بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگەکانماندا دەرکەون و باڵادەستبن. ئەمەش ڕۆڵێکی بنچنەییە دەبێ ڕۆشنبیران ئیمڕۆ بیگێڕن, لە ڕێگەی خەباتی ڕۆژانەوە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەك کە پەنا بەئەقڵ و ئاقڵبوون دەبات و چاوپڕیوەتە ئازادی و دیموکراسی.

**تونس/ مارسی** 1993

## سەرچاوە

ئەم بابەتەم لە کتێبی "في الحداثة والتقدم: حوارات فکرية"ی نووسەر ڕەزا ئەلمەلولی وەرگیراوە, کە دار نقوش عربية ساڵی 1996 لە تونس بڵاویکردۆتەوە

# بۆنتشای بێدەنگ

ئای. ئێل. پێرێتز
لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

مردنی بۆنتشا هیچ کاریگەرییەکی نەبوو لێرە, لەسەر زەوی. لە کێ دەپرسیت بپرسە: بۆنتشا کێ بوو؟ چۆن دەژیا؟ چۆن مرد. ئایا بەرە بەرە هێزی لەشی لەناو چوو, ئایا دڵی وەستا, یان مۆخی ئێسقانەکانی لەژێرباری قورسی ژیاندا توایەوە؟ کێ دەزانێت. لەوانەیە هەر لەبەر نەخواردن مردبێت — کە پێی دەوترێت لەبرسا مردن.

ئەسپێك, کە لە شەقامەکاندا عەرەبانە رادەکێشێت, ئەگەر لەپڕ بکەوێت, خەڵك لە کۆڵانەکانەوە رادەکەن بۆ سەیرکردنی. رۆژنامەکان لەبارەی ئەو رووداوە سەرنجراکێشەوە دەنووسن و لەوانەیە لەو شوێنەی کە ئەسپەکەی لێکەوت پەیکەرێك دروستبکرێت. بەڵام ئەگەر ئەم ئەسپە مرۆڤ بوایە, کە ژمارەیان ئێجگار زۆرە, ئەم رێزگرتنەی بۆ نەدەکرا. ئەی چی؟ بۆ چەند ئەسپ لە جیهاندا هەن؟ بەڵام مرۆڤ زۆرن — لەوانەیە لە هەزارەها ملیۆن زیاترین!

بۆنتشا مرۆڤێك بوو بە نەناسراوی ژیا, بە بێدەنگیش مرد. وەکو تارماییەك بەم جیهانەی ئێمەدا تێپەڕی.

کە بۆنتشا لەدایکبوو, کەس بەو بۆنەیەوە نەیخواردەوە و زڕەی لێکدانی پەرداخ نەبیسترا. لە کاتی ناونانیشیدا کەس وتاری نەخوێندەوە. وەکو دانە لمێك بوو لە کەنار ئۆقیانووسێکی فراواندا, لە نێو ملیۆنەها دانە لمی هاوشێوەدا. پاشان کە با هەڵیگرت و فرێیدایە ئەودیوی ئۆقیانووسەکە, کەس تێبینی ئەوەی نەکرد.. کەس. لە سەردەمی ژیانیدا, پێیەکانی هیچ نیشانەیەکیان لەسەر خۆڵی شەقامەکاندا بەجێنەهێشت, کە مردیش, ئەو تەختەیەی کە شوێنی گۆڕەکەی نیشاندەدا, فڕێدراو ژنی گۆڕهەڵکەنەکە رۆژێکیان تەختەکەی دوور لە گۆڕەکە دۆزییەوە و خستییە ناو ئەو ئاگرەی کە پەتاتەی نابووە سەر بۆ کوڵاندن, ئەمەش کارێکی ڕەوا بوو. سێ رۆژ پاش مردنی کەس لەبیری نەما لە کوێ نێژراوە, نە گۆڕهەڵکەنەکە و نە کەسی دیکە.

ئەگەر بۆنتشا کێلێکی بەردی هەبوایە، لەوانەبوو پاش سەد ساڵ یەکێك بەوێدا تێپەڕیبایەو پیتە هەڵکۆڵراوەکانی سەر کێلەکەی بخوێندبایەتەوە، بەمجۆرە ناوی بۆنتشای بێدەنگ لەسەر ئەم زەوییە لەناو نەدەچوو.

بێدەنگییەکەی نە لە یادی کەس و نە لە دڵی کەسدا نەما. تارماییەك بوو! هیچ بوو! فەوتاو نەما!

بە تەنیایی ژیاو بە تەنیایی مرد. ئەگەر ئەو دەنگە دەنگ و هەراو هوریایەی مرۆڤ نەبوایە، دەتوانرا دەنگی قرچەی ئیسکەکانی ببیسترێت لە ژێر ئەو بارە قورسانەی کە هەڵیگرتبوون. لەوانە بوو یەکێك سەرنجی بداتێ و بزانێت کە بۆنتشای بێدەنگیش مرۆڤێکە، لەوانە بوو تێبینی بکرایە کە هەرچەندە لە ڕاستیدا هیچ جۆرە بارێك بەسەر شانییەوە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕۆیشتندا سەری دادەگرت و دەتوت لە ژیانیشدا بۆ گۆڕەکەی خۆی دەگەڕێت. کاتێك کە بۆنتشایان هێنا بۆ نەخۆشخانە، دە کەس چاوەڕوانی ئەوە بوون کە بمرێت و چەرپایە تەسکەکەیان بۆ بەجێبهێڵێت، کاتێك کە لە نەخۆشخانەوە بردیان بۆ مردووخانە بیست کەس چاوەڕێی فەرشی سەر مەیتەکەی بوون، کاتێکیش کە لە مردووخانە دەریانکرد، چل کەس چاوەڕوانی ئەوە بوون کە بۆ هەتاهەتایی لە شوێنێك بینێژن. ئێستاش، کێ دەزانێت چەند کەس چاوەڕێی زەوتکردنی ئەو شوێنە دەکەن؟ بۆنتشا لە بێدەنگیدا لەدایکبوو، لە بێدەنگیدا ژیاو لە بێدەنگیدا مرد و — لە بێدەنگییەکی قووڵتردا نێژرا.

بەڵام، لەو دنیایەی دیکەدا بەو شێوەیە نەبوو! نەخێر! لە بەهەشتدا، مردنی بۆنتشا ڕووداوێکی هەژێنەر بوو. کەڕەنا مەزنەکەی مەسیح لە حەوت ئاسماندا جاڕیدا: بۆنتشای بێدەنگ مرد!

ئیتر فریشتە پایە بەرزەکان و باڵە شکۆدارەکان کەوتنە پەلەکردن بۆ گەیاندنی باسەکە بۆ یەکتری: "دەزانیت کێ مردووە؟ بۆنتشا.. بۆنتشای بێدەنگ!" فریشتە گەنجە چاوگەشەکانیش، بە باڵی زێڕین و پێڵاوی زیوینەوە، بە ڕاکردن چوون بۆ پێشوازیکردنی بۆنتشاو لە خۆشیاندا پێدەکەنین. دەنگی باڵەکانیان و دەنگی پێڵاوە زیوینەکانیان و تریقەی پێکەنینیان بەهەشتی پڕکردبوو لە شادی. خواش پێیزانی کە ئیتر وا بۆنتشای بێدەنگ گەیشت. لە دەروازەی بەهەشتدا، ئیبراهیمی باوکمان باوەشی بۆ کردەوە بۆ پێشوازی لێکردن و پیرۆزکردنی: "سەلامت لێبێت. " بزەیەکی شیرینی قوڵیش بەسەر ڕوخسارە پیرەکەیەوە دیاربوو.

بەڕاستی، لەوێ، لە سەرەوە، لە بەهەشت، چی ڕوویدا؟

لەوێ، لە بەهەشتدا، دوو فریشتە تەختێکی پاشاییان هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی بۆنتشا لەسەری دابنیشێت، بۆ سەریشی تاجێکی زیوینیان هێنا کە گەوهەرەکانی دەبریسکانەوە.

"بەڵام، بۆ هەر لە ئێستاوە تاج و تەختی بدرێتێ؟" دوو پیاوچاکی گرنگ پرسیان،" خۆ هێشتا لەبەردەم دادگای ئاسماندا لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکراوە، کە هەموو هاتوویەکی تازە دەبێت ملکەچی بێت؟ " دەنگیان جۆرە ئیرەییەکی تێدا بوو. " بەهەرحاڵ، لێرەدا چی ڕوودەدات؟ "

دوو فریشتەکە وەڵامی دوو پیاوچاکەکانیان دایەوە کە بەڵێ وایە، بەڵام دادگاییکردنی بۆنتشا بە تەنها ڕووکەشەو دادوەرەکەش ناوێرێت هەر دەمیش بکاتەوە. ئەی چی؟ مەسەلەکە هەمووی پێنج خولەك ناخایەنێت. " ئەوە چیتانە؟ " فریشتەکە پرسی " نازانن باسی کێ دەکەن؟ ئێوە باسی بۆنتشا دەکەن، بۆنتشای بێدەنگ! "

کاتێك کە فریشتەکان بە گۆرانی وتنەوە و بە خۆشەویستییەوە دەوریان دابوو، کاتێك کە ئیبراهیمی باوکمان، وەکو هاوڕێیەکی دێرین، جار لەدوای جار، باوەشی پێدا دەکرد، کاتێك کە بۆنتشا زانی کە تەخت و تاجی بۆ ئامادە کراوە و لە دادگای ئاسماندا کەس ناوێرێت یەك وشەی بەرامبەر بڵێت – کاتێك کە بۆنتشا هەموو ئەمانەی بیست، هەروەکو پیشەی جارانی لەو دنیایەی دیکەدا، بێدەنگ بوو. لە ترسا بێدەنگ بوو. دڵی کەوتە پەلە پەلکردن و دەمارەکانی وەکو سەهۆڵیان لێهات. دەیزانی ئەمە یان دەبێت خەونێك بێت، یان هەڵەیەك.

بە هەردووکیان راهاتبوو، بە خەون و بە هەڵە. چەند جار، لەو دنیایەی دیکەدا، لە خەوندا دەیبینی کە بە خاکەناز لە شەقامەکاندا پارە کۆدەکاتەوە، کە هەرچی سەروەت و سامان هەیە لەژێر دەستیدایە – پاشان، کە بەئاگادەهاتەوە، خۆی بە هەژاری دەبینیەوە، چارە ڕەشتر لە پێش خەونەکە.

چەند جار، لەو دنیایەی دیکەدا، یەکێکی دەبینی کە بزەی بۆ دەکات و قسەیەکی خۆشی پێدەوت. بەڵام کە ئەو کەسە ئاوڕیدەدایەوە و هەڵەکەی بۆ دەردەکەوت، تفی لە بۆنتشا دەکرد.

تۆ بڵێیت بەختم وەها بێت، لە بیری خۆیدا وتی، نەیدەوێرا چاوی بکاتەوە نەبادا خەونەکەی کۆتایی بێت و خۆی لەسەر زەوی لە کونی ماری ژەهراوی قێزەونددا بدۆزێتەوە. لە ترسا دەلەرزی و بچووکترین دەنگی لێوە نەدەهات، برژانگەکانیشی نەدەجوولاند. لە ترسا دەلەرزی و گوێی لە دەنگی سروودی فریشتەکان نەبوو. سەما شکۆدارەکەی لە ترسا نەدەبینی. نەیدەزانی وەڵامی بەخێرهاتنەکەی ئیبراهیمی باوکمان بداتەوە، کە یەك لەسەریەك دەیگوت:" سەلامت لێبێت. " کاتێکیش کە بردیان بۆ خانەی داد، لە بەهەشت، نەیتوانی بڵێت" بەیانیتان باش "، لە ترسا ئیفلیج ببوو. کاتێك کە چاوە گرژبووەکانی بەر زەمینەی ژووری دادگا کەوت، ترسەکەی پەرەیسەند. زەمینەی ژوورەکە لە ئەڵماسی رووت دروستکرابوو و بە ئەڵماسی بریقەدار رازابووەوە. بیری کردەوە: من لەسەر ئەم زەمینەیە وەستاوم، قاچەکانم لەسەر ئەم زەمینەیەن. لە ترسا ئاگای لە خۆی نەمابوو. بۆنتشا لە بیری خۆیدا وتی: ئەم شتە دەبێت بۆ کام پیاوی دەوڵەمەند، یان مالوومی زانا، یان پیاو چاکێك، دروستکرابێت؟ پیاوە دەوڵەمەندەکە هەر ئێستا دێت و هەموو شتێك کۆتایی دێت. چاوەکانی داگرت و پاشان نوقاندنی.

لە ترساندا گوێی لێ نەبوو کاتێك کە بە دەنگێکی فریشتەیی ناویان بانگرد:" بۆنتشای بێدەنگ!" ئاگای لە هیچ وشەیەك نەبوو، تەنها دەنگەکەی دەبیست کە لە دەنگی مۆسیقا دەچوو، دەنگی کەمانچەیەك. بەڵام، ئایا گوێی لە ناوی خۆی نەبوو "بۆنتشای بێدەنگ"؟ پاشان دەنگەکە وتی:"بۆ ئەو، ئەم ناوە وەکو پاڵتۆیەکی فەرو وایە بۆ پیاوێکی دەوڵەمەند." چی چی؟ چی دەڵێت؟ بۆنتشا سەرسام بوو. پاشان گوێی لە دەنگێکی گرنگ بوو کە قسەی فریشتە پارێزەکەی بڕی:" دەوڵەمەند! پاڵتۆی فەرو! تکایە زمانی خوازەی ئەدەبی بەکارمەهێنن – هەروەها زمانی گاڵتەجاڕیش! "

" هەرگیز " فریشتە پارێزەرەکە وتی" گلەیی لە کەس نەدەکرد، نە لە خودا، نە لە مرۆڤ. هەرگیز چاوی بە رقەوە سوور نەدەکردەوە، هەرگیز نارەزاییەکی دژی ئاسمان دەرنەبڕی. بۆنتشا نەیتوانی یەك وشە تێبگات. دەنگی رەقی داواکاری گشتیی دادگاکە جارێکی تر بەرزبووەوە:" تکایە، گوێ مەدەنە رەوانبێژییەکە! "

" ئازارەکانی ئەوەندە زۆر بوون کە لە باسکردن نایەن. فەرموون، ئەوەتا، سەیری ئەو زەلامە بکەن کە ئازارەکانی لە هی ئەیووب زیاتر بوون! "

کێ؟ بۆنتشا بە سەرساممییەوە لە خۆی پرسی.

دادوەرەکــــە قیژانــــدی:" راســــتییەکان! راســتییەکان! تکایــە واز لــە وشــەی رازاوە بهێنــە و باسی راستییەکان بکە! "

" تەمەنی هەشت رۆژ بوو کە خەتەنە کرا...."

" وردە رووداوی وەهـــا بچـــووك پێویســـت ناکات باسبکرێت. "

" چـەقۆکە لـە دەسـتی خەتەنەکەرەکـە تـرازا و هەوڵیشی نەدا خوێن لێچوونەکە رابگرێت. "

" ئـەم شـتانە زۆر قێـزەوەنن. تـۆ باسـی شـتە گرنگەکان بکە. "

" تەنانـەت ئەوسـاش، کـە کۆرپەیـەك بـوو، هـەر بێدەنگ بوو و لەبەر ئازارەکەی نەگریا. "

پارێزەرەکـــەی بۆنتشـــا لەســـەر قســـەکەی بەردەوام بوو" بێدەنگیی خۆی پاراست تەنانەت ئەو کاتـەش دایانـە دەسـتی مـارێکی ژەهراوییـەوە – کـە زڕدایکی بوو! "

بۆنتشـا بـیری کـردەوە: تـۆ بڵێیـت مەبەسـتیان من بێت؟

" زڕدایکـی رقـی لـەو پـارووە نانـە رەقـە بـوو کـە بـۆی فڕێـدەدا، کەچـی خـۆی قـاوەی بـە کرێمـەوە دەخواردەوە. "

" ئەم شتانە پرووپووچ و بێبایەخن. "

" لـە رقـی ئـەو پـارووە نانـەی کـە دەیـدایێ، بـاوەژنی بزمـارژەنی دەکـرد و شـوێنەواری رەش و شـینی بزمارەکـان لـەو جلـە شـڕەوە دیـاربوون کـە لەبـەری دەکرد. زسـتانیش، بـە پێـی پـەتی، دەینـارد بۆئەوەی داری بۆ ببڕێت. زۆر جار سـەهۆڵ دەست و پێـی دەتەزانـدو، ئەوەنـدەش منـداڵ و ناسـك بـوو کـە بـارەدارە قورسـەکەی بـۆ هەڵنـەدەگیرا. بـەڵام هەمیشـە بێدەنگ بوو و گلـەیی لای کـەس نـەدەکرد – تەنانـەت لای باوکیشی..."

" گلـــەیی! لای ئـــەو سەرخۆشـــە! " دەنگـــی فریشتە داواکارە گشتییەکە بەرزبووەوە و بۆنتشا لە ترســـاو بـــە هـــۆی ئـــەو یادەوەرییـــەوە لەشـــی سارد هەڵگەڕا.

" هەرگیز گلەیی نەدەکرد و هەمیشە هەستی بە تـــەنیایی دەکـــرد " فریشـــتە پارێزەرەکـــە لەســـەر قسەکەی بەردەوام بوو " هـەرگیز هاوڕێیـەکی نـەبوو. کاتێـك کـە ناردیـان بـۆ قوتابخانـە دەسـتەیەك جلـی تازەیان بۆ نەکرد. هـەرگیز بۆ چرکەیەکیش هەستی بە ئازادی نەدەکرد. "

" نـاڕەزاییم هەیـە! نـاڕەزاییم هەیـە! " دەنگـی داواکارەکە بە تووڕەییەوە بەرزبووەوە.

" پـارێزەرە کـە بـەم قسـانە دەیـەوێت هەسـتمان بجووڵێنێت. "

" بێدەنگ بوو، تەنانەت لەو کاتەشدا کە باوکە سەرخۆشـــە شـــێت و وێتەکـــەی قـــژی گـــرت و لـــە شـــەوێکی بـــەفری ســـارددا دەریکـــردە دەرەوە. بـــە هێمنی، لەسەر بەفرەکە هەستایەوە و کەوتە رێ.

" بە بێدەنگی بـەو نـاوەدا، وێڵ و سـەرگەردان، دەگەڕا. کاتێك کە برسێتی زۆری بۆ دەهێنا، تەنها بە چـاو سـواڵی دەکـرد. پاشـان، لـە شـەوێکی تـەڕی بەهاردا، با وەکو هەڵیگرت و لایدایە شارێکی گەورە. لە یەکەم شەودا، کە هێشتا بە دەگمەن بینرابوو، بە دەگمـــەن بیســـترا بـــوو، گرتیـــان و خســـتیانە بەندیخانـــەوە. لەوێشـــدا بێـــدەنگی پاراســـت. نـــە ناڕەزایی دەربڕی و نە پرسیاری کرد: بۆ؟ لەبەر چی؟ دەرگای بەندیخانەکە جارێکی دیکە کرایەوە و ئازاد کـرا. بـە شـوێن نـزمترین و پیسـترین کـاردا دەگـەڕا و هەمیشە بێدەنگ بـوو. " لـە کارەکـە ناخۆشـتر، گـەڕان

بە شوێن کاردا بوو. کاتێك کە ئازار و ئەشکەنجە زۆری بۆ دەهێناو دەمارەکانی گەدەی خاڵی ئازاری دەدا, هــەرگیز نــاڕەزایی دەرنــەدەبڕی و هەمیشــە بێدەنگ بوو.

"پــۆخڵی شــارێکی نــامۆ پیســی دەکــرد و خــەڵکانی نــەناس تفیــان لێــدەکرد. لــە کۆڵانەکانــدا دەگەڕاو وەکو ئاژەڵێکی بارهــەڵگر لەسەر کارەکەی بــەردەوام بــوو. وەکــو بارهــەڵگرێك قورســترین بــاری هەڵـــدەگرت و بـــەناو ئەســـپ و عەرەبانەکانـــدا دەســووڕایەوە و هەمیشــە رووبــەڕووی مــەرگ بــوو, کەچی هەر بێدەنگ بوو.

" نەیــدەزانی دەبێــت چــەند کیلــۆ شــتوومەك بەرامبەر بە فلسێك هەڵبگرێت, چەند کەڕەت ساتمە بکات و بکەوێت هەتا ئەو فلسەی دەستدەکەوێت. نەیدەزانی چەند جار گیانی دەبێت دەربچێت هەتا فلسێکی دەستدەکەوێت. نەیدەزانی بۆ ئەو دەبێت بەدبەخت و خــەڵکانی دیکــە بەختــەوەربن. هــەرگیز داوای مافی خۆی نەدەکرد, بەڵکو وەکو سواڵکەرێك چاوەڕوانی دەکــرد. بــەڵام لــە قــووڵایی چاوەکانیدا پەرۆشــییەکی نــەدرکاو هــەبوو. پێیانــدەوت: دوایــی وەرەوە! ئــەویش وەکو تارماییــەك ونــدەبوو و پاشان وەکــو تارماییــەك دەگەڕایــەوە و چاوەڕوانی دەکــرد. چاوەکانی دەپاڕانەوە بۆ ئەو شتەی کە مافی خۆی بــوو. تەنانــەت کاتێــك کــە گزیشــیان لێــدەکرد هــەر بێدەنگ بوو. کاتێك کە بۆ کرێکەی پارەی قەڵبیان پێــدەدا, لــە دوورەوە دەوەســتا و جۆرەهــا بەهانــەی دەهێناوە. هــەرگیز نــاڕەزایی دەرنەدەبڕی و هەمیشە بێدەنگ بوو.

"جارێکیان " فریشتە پارێزەرەکە بەردەوام بوو لەسەر قسەکەی "بۆنتشا لە جادەیەك دەپەڕییەوە بۆ ئــاو خواردنــەوە. لــەو کاتــەدا هــەموو ژیــانی بــە شێوەیەکی سەیر گۆڕا. چ موعجیزەیەك روویدا کەوا ژیــانی گــۆڕی؟ عەرەبانەیــەکی نایــاب, کــە تایــەکانی لاســتیك بــوون, تێپــەڕی. ئەســپەکانی عەرەبانەکــە بەلەســە ببــوون و عەرەبانچییەکە کەوتــە خــوارەوە بــۆ سەر شــەقامەکە و ســەری قڵیشــا. ئەسپە ترســاوەکان کــەفیان لــەدەم دەردەهــات و چــاوە تووڕەکانیــان لــەو شـــەوە تاریکـــەدا ئاگریـــان لێـــدەباری. لـــەناو عەرەبانەکەشدا زەلامێك کەوتبوو, نیوە مردوو و نیوە زینــدوو. بۆنتشــا پــەلاماری جڵــەوی ئەســپەکانی داو عەرەبانەکـــەی راگـــرت. زەلامـــی نـــاو عەرەبانەکـــە جوولەکەیـــەکی خێرخـــواز بـــوو و ئـــەم چـــاکەیەی بۆنتشــای لەبــەر چــاو بــوو. قامچــی عەرەبانچــییە مردووەکەی دایە دەستی بۆنتشا و لەو رۆژەوە بوو بــە عەرەبانچــی و وازی لــە حــەماڵی هێنــا. لــەوەش چــاکتر, ئــەم پیاوچــاکە ژنیشــی بــۆ هێنــا. هێشــتا لەوەش زیاتر ئەم خێرخوازە منداڵێکیشی پێبەخشی بۆ ئەوەی گەورەی بکات.

" بۆنتشــا هێشــتا هــەر بێــدەنگ بــوو و هــیچ گلەیی نەکرد. "

مەبەســتیان منــە, لامولیــە مەبەســتیان منــە. بۆنتشا ئازایەتیی نایە بەرخۆی, بەڵام هێشتا زاتی ئـــەوەی نـــەدەکرد کـــە ســـەرهەڵبڕێت و ســـەیری دادوەرەکە بکات.

" هــەرگیز نــاڕەزایی دەرنــەدەبڕی. تەنانــەت کاتێك کە پیاوە خێرخوازەکە پاش ماوەیەکی کورت نابووت بوو و دەریکرد, بێ ئەوەی فلسێکی بداتێ, هەر لەسەر بێدەنگی بەردەوام بوو. " بێدەنگ بوو, تەنانــەت ئــەو کاتــەش کــە ژنەکــەی رایکــرد و کوڕیــە داماوەکەی بەسەردا بەجێهێشێت. پانزە ساڵ دوای ئــەوە ئــەو کوڕیــە دامــاوە گــەورە و بــەهێز بــوو و بۆنتشای لەماڵ دەرکرد."

بۆنتشا دڵشاد بوو. مەبەستیان منە, بەڕاستی مەبەستیان منە.

فریشــتە پارێزەرەکــە بــەردەوام بــوو لەســەر قســەکەی: " لەســەر بێدەنگییەکــەی بــەردەوام بــوو تەنانــەت ئــەو کاتــەش کــە پیاوچاکە خێرخوازەکــە خۆی گرتەوە و لە نابووتی رزگاری بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر کرێکەی نەدایێ. لەوەش زیاتر، ئێستا ئەم زەلامە خێرخوازە، کە ماوەیەك نابووت ببوو، جارێکی دیکە سواری عەرەبانەیەکی نایاب دەبێت کە تایەکانی لاستیکن و عەرەبانچییەکی نوێی هەیە. بۆنتشاش گەڕایەوە بۆ حەماڵی سەر شەقامەکان و رۆژێکیان ئەو عەرەبانەیە لێیدا و ئەسپ و عەرەبانە و عەرەبانچییەکە بەسەریدا رەتبوون. کە بۆنتشا لەو رووداوە هەستایەوە، هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد، بەڵام هاواری نەکرد و هەر بێدەنگ بوو. تەنانەت لە نەخۆشخانەشدا، کە هەموو کەسێك بواری پێدەدرێت کە بقیژێنێت، ئەو هەر بێدەنگ بوو. لەسەر چەرپایە تەســکەکەی بــە بێــدەنگی راکشــابوو. پزیشــك و پەرستارەکان بە تەواوی پشتگوێیان خستبوو و ئەو پارەیەشی پێنەبوو کە بیانداتێ — لەگەڵ ئەوەشدا دەنگــی بۆڵەیــەکی لێــوە نــەهات. لــەو چــرکە ترسناکەی پــێش مردنیدا بێدەنگ بوو و لەکاتی مردنیشیدا بێدەنگ بوو. هەرگیز هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی، نە لە دژی مرۆڤ، نە لەدژی ئاسمان." بۆنتشا هەموو لەشی کەوتە لەرزین. دەیزانی پاش ئــەوەی کــە پارێزەرەکــەی لــە قســەکانی دەبێتــەوە، داواکاری گشتی هەڵدەستێت و لە دژی ئەو قسە دەکات. خودا دەزانێت بە چی تاوانبار دەکرێت؟ لە ژیانی سەر زەویدا، هەر شتێك کە تێدەپەڕی و دەبــوو بــە رابــوردوو، بۆنتشا خێــرا لــە بــیری دەچـــووەوە. ئێســـتا، فریشـــتە پارێزەرەکـــەی هەموو شتێکی هێنایەوە یاد — بەڵام، کێ دەزانێت داواکـــارە گشـــتییەکە چ گونـــاهێکی لەبیرچـــوو دەهێنێتەوە یاد؟

داواکـــارە گشـــتییەکە هەســـتایە ســـەرپێ. " بــەڕێزان.." بــە دەنگێکــی غــەمبار و بــەرزەوە وتــی، پاشان وەستا. " بەڕێزان.. " جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە دەنگێکی نەرمترەوە، جارێکی دیکەش وەستایەوە. پاشان، هەمان داواکار زۆر بــە نەرمییــەوە وتــی: " بــەڕێزان، وایــە. بۆنتشا هەمیشە بوو — ئێستا، منیش بێدەنگ دەبم. "

دادگا مەزنەکــە زۆر بێــدەنگ بــوو. پاشــان لــە کورسی دادوەرەوە دەنگێکی بەسۆز و نەرم و نیان بــەرز بــووەوە: " بۆنتشــا، ڕۆڵــە گیــان، بۆنتشــا — " دەنگەکـــە وەکـــو دەنگـــی کەمانچـــەیەکی مـــەزن بەرزبووەوە: "ڕۆڵە خۆشەویستەکەم..." لەناخەوە، هــەموو گیــانی بۆنتشــا دەســتی کــرد بــە گریــان. دەیویســت ســەربەرزبکاتەوە و چــاوەکانی بکاتــەوە، بــەڵام فرمێســك بەرچــاوی گرتبــوو. گریــان چــەند خۆشە! هەرگیز نەیدەزانی کە گریان ئەوەندە خۆشە.

" بۆنتشا، ڕۆڵە گیان.. "

لــەو رۆژەوەی کــە دایکــی مــرد قســـەی وای نەبیســـتبوو و کــەس بــەم دەنگــە نەیدوانــدبوو. " رۆڵەکەم " دادوەرەکە جارێکی دیکە دەستیپێکردەوە " تۆ هەمیشە هەر ئازارت چەشتووە و هەر بێدەنگ بوویت. هیچ شوێنێکی جەستەت نییە برینی نەبێت، هــیچ شــوێنێکی نهێنــی گیانــت نییــە ئازار و برینــی نەدیبێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەر بێدەنگ بوویت و هیچ ناڕەزاییەکت دەرنەبڕی.

" لـــەوێ، لـــەو دنیایـــەی دیکـــەدا مـــرۆڤ لێتدەگەیشت، بەڵام تۆ هەرگیز لە خۆت نەگەیشتی. هــەرگیز تێنەگەیشــتیت کــە پێویسـت ناکات بێدەنگ بیت، کە قیژە و هاوار کردنت دنیا نارووخێنێت. تۆ هەرگیز لە هێزە متبووەکەی خۆت ئاگادار نــەبوویت. لــەوێ، لــەو دنیایــەی دیکــەدا، دنیــای درۆ، بێدەنگی پاداشتی نەبوو. بەڵام، لێرە، لە بەهەشتدا، کە دنیای

راستییە, پاداشتت دەدرێتەوە. دادوەر ناتوانێت حوکم بەسەر تۆدا بدات, یان تاوانبارت بکات, تۆ بەتەنها بەشێك, بەشێکی بچووکی بەهەشتت نادرێتێ. تۆ هەموو شتێکت دەدرێتێ. هەرچییەکت بوێت, هەموو شتێکی بەهەشت هی تۆیە! "

ئینجا, بۆ یەکەم جار, بۆنتشا چاوی هەڵبڕی. ڕووناکییەکە کوێری کردبوو, ڕووناکی لەلایەکەوە دەدرەوشایەوە, لەسەر دیوارەکان, لە بنمیچە پان و پۆڕەکەوە. فریشتە و دادوەرەکە دەبریسکانەوە لە ڕووناکیدا. چاوە ماندووەکانی داگرتەوە.

" بەڕاستیتە؟ " دادوەرەکە وەڵامیدایەوە" بەڕاستی! پێت دەڵێم, هەموو شتێك هی خۆتە, هەموو شتێك لە بەهەشتدا. هەڵبژێرە! بیبە! هەرچییەکت دەوێت, ئەو شتەی کە دەیبەیت هی خۆتە! "

" بەڕاست؟ " بۆنتشا جارێکی تر پرسییەوە, ئەمجارەیان دەنگی زوڵاڵتر و دڵنیاتر بوو. دادوەر و هەموو خانە خوێیەکانی پێکەوە وەڵامیان دایەوە:

"بەڕاستی, بەڕاستی, بەڕاستی!" "باشە, کەواتە..." بۆنتشا بۆ یەکەمین جار بزەیەکی کرد, " کەواتە, گەورەم, حەزدەکەم هەموو بەیانییەك بۆ بەرچایی نانێکی گەرم و کەرەی تازەم هەبێت. " بێدەنگییەکی قووڵ باڵی کێشا بەسەر هۆڵە مەزنەکەدا, قووڵتر لەو بێدەنگییەی کە بۆنتشا پێی ڕاهاتبوو. دادوەر و فریشتەکان سەریان نا بەیەکەوە لە شەرمی ئەو نەرمی گوێڕایەڵییەی کە لەسەر زەوی دروستیانکردبوو.

پاشان بێدەنگییەکە شکاو قاقای داواکارەکە بەرزبووەوە لە پێکەنینێکی تاڵ و غەمناکدا.

### سەرچاوە

***lilerature, V.1***

***by laurence perrine 1974.***

# من ئاوێنەی دەروونی ئافرەتانم

**منیر و ڕەوانی پور**

**لە فارسییەوە: سەلاح نیساری**

ژنە نووسەری فارس خاتوو منیر و رەوانی پور لەدایکبووی (1955)ە لەو ژنە چیرۆکنووسانەی ئەمڕۆی ئێرانە کە هەتا ئێستا توانیویەتی بە نووسینی کۆمەڵە چیرۆکی سیریا سیریا, کینزو, زن فرودگاه فرانکفوت و چەند ڕۆمان و چیرۆکی دیکەش بە سەرکەوتویی بێتە نێو مەیدانی ئەدەبیاتەوە.

رەوانی پور لە نێو چیرۆکەکانیدا بە تەواوی ئاوڕی لە ئافرەتان داوەتەوە و باسی ئازار و مەینەتیەکانی چینی ئافرەتی کردووە و لە زمان ئەوانەوە وەهاوار کەوتووە. لەم کتێبەی دواییدا لە باسی مەینەت بەشی ژنان لە سووچی ماڵدا هاتۆتە دەرێ و ئەو جار لە ئاوارەیی و دەربەدەریدا سفرەی دڵی دەکاتەوە...

## "چەندین هەزار و یەك شەو"

(1)

**لە سەرمانا هەڵدەلەرزی, چۆقەی ددانی دەهات و وڕێنەی دەکرد, دەستی رادەوەشاند, جارجاریش لەسەرو چاوی خۆی دەسرەواند, دەتگوت هیچ کەس و هیچ شتێ نابینێ, وەك ئەوەی شتێك, بەلایەك ئەوی لە خۆی و خەڵكی دەوروبەری دوورخستبێتەوە, ئەو ڕێبوارانەی لە قەراخ شەقامەکە راوەستابوون, بە پەرۆشەوە سەیریان دەکرد و ژنەش لەسەرخۆ دەینالاند: "خودایە کۆڵەکەی ماڵەکەم... مێردەکەم..."**

**کە بە پەشۆکاوییەوە چووە بەردەم ماشێنێك, شۆفێرەکە گورجێك پێی نا بە تورمزەکەدا, شیشەکەی داداوەو هات قسەبکات, بەڵام ژنە بەتاڵۆکەوە دەستگیرەکەی گرت و پیاوێك لە قەراخ شەقامەکە راوەستابوو, گووتی: "کاکە, پێ دەچێت دەردێکی هەبێ."**

**شۆفێرەکە چەند جارێك سەری بۆ لەقاند, ژنە خۆی خستە نێو ماشینەکەوە دەرگای لەسەر خۆی پێوەدا. ژنێك کە لە پێشەوە دانیشتبوو وەك ئەوەی گورگی دیتبێ کەوتە قوتە قوت: "خودا رووحمی پێ کردن"**

ژنــە کوشمـــەی کردبـــوو، لەبـــەر خۆیـــەوە ئـــاخێکی هەڵکێشـــا: "رزگـــار دەبـــووم." کـــاکی شـــۆفێر هێشـــتا ئـــاوڕی رقەکـــەی دانـــەمرکابوو، جغارەیـەکی داگیرساند و لـە ئاوێنەکـە راما: "هـەتا کوێ دەچن؟"

ژنـــە قـــامکی قیـــت ڕاگرتبـــوو، ئەوســـەری شـەقامەکەی دەستنیشـان کـرد: "لـە ئـاخری ئـەو شەقامە دادەبەزم کاکی برا"

"ئێمە لە سێیەم چوار ڕێیان بە دەستە راستدا لادەدەین."

ژنـە گـەرووی خـۆی ڕێك گووشـی، دەنگـی گـڕ بوو، وەك ئەوەی شتێکی لە ئەوك گیرابێ:

"هەتا هەر کوێ برۆی سوپاست دەکەم."

ژنەکـــەی پێشـــەوە خـــۆی بـــەلای دەرگاکـــەدا وەرسووڕاند، رووی لە ژنەکە کرد کە:"رەنگبێ بەرەو ماڵ ببنەوە؟"

"خوشـــکێ گیـــان، مـــاڵ و حـــاڵی چـــی و مێردی چی."

ژنەکەی پێشەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"دا خۆم چ ڕۆژ رەشێکە."

ماشێنەکە لـە پشت چرای سوورەوە راوەستا. ژنـــەی هەناســـە ســـارد ســـەری نـــا بـــە قـــەراخی سـەندەڵییەکەوە و چـاوە پـڕ لـە فرمێسـکەکانی لـە ژنەکەی پێشەوە بڕی: "هەقیەتی، هەقیەتی.." ریزێك فرمێسـك بەسـەر رووومەتیـدا خـزین گەیشـتە سـەر لێـوی، سـەری کـردە سـەر سـەندەڵیەکەی دوواوە، چـاوی قووچـاند، وەك ئـەوەی لەگـەڵ خـۆی بـێ بـە دەنگـی بـەرز دەسـتی بـە قسـە کـرد: "دوو حـەوتوو دەبێ لـە تورکییەوە هاتووینـەوە، یـانی بە دزییەوە، شـەرم دەمـانگرێ خۆمـان پیشـان کـەس و کارمـان بدەین. ساڵێك لەمەوبەر ماڵ و حاڵمان هەرزان فرۆش کـــرد، وتم: هـــەراج.. هـــەراج.. قیمـــەتم بەســـەر شتەکانەوەدا، جل و بـەرگی مێردەکەم و ماڵەکـەش! ئـەویش چ ماڵێـك، دوو ژووری خـەو لەگـەڵ هـۆڵێکی باش، ماڵم لە گای تۆڕنا، من هەڕاجم کردن. من بووم وتم لـە سـەرەتای ژیانـدا دەبـێ بـڕۆین، دەنـا هـەتا ئاخری تەمـەنمان لێرە دەمێنینـەوە. ئـەمن بـووم وتم ڕووبکەینـــە شـــوێنێك خەڵکەکـــەی دڵ خۆشـــن، پێدەکەنن.. ئاخریش دەلاڵێکمان لـێ وەژوور کـەوت، ڕوومان کردە تورکییە بۆئـەوەی پاسپۆرت وەربگرین و لەوێ! دەلاڵەکـەش ماوەی ساڵێك دەسـتی دەسـتێ پێ کردین، بە هەزاران شێرو ڕێـوی هێنانـەوە پـووڵی لە دەست دەرهێناین، لەسـەر ساجی عـەلی داینـاین و بـۆی دەربـاز بـوو، مێردەکـەم هەمیشـە دەیگـوت: با بگەڕێینـەوە، بابگەڕێینـەوە مـن هـەر ئـەورۆ سبەینێم دەکـرد، هـەتا ئـەو ڕۆژەی لـە رووی ناچـاری ئەڵقـەی پەنجـەی خۆمـانم فرۆشـت. ئیتر لـەو ڕۆژە بـە دوواوە ئەو ڕووەی جارانی لەگەڵ من نـەما. وای دەزانـی مـن بـووم بـە بایسـی ئـەو نەدامەتییـە. هـەتا هەڵقـەی پەنجەی پێ بفرۆشم. ئیتر متەقی نەکرد، تـەنیا لێم رادەمـا، وردە وردە چـاوەکانی وەك دوو شووشـەی کاتژمێر گـەورە و بچووك دەبوونـەوە. دوکتـورم گێڕا فایـدەی نـەبوو، هـەتا ڕۆژێـك بـۆم دەرکـەوت لـە مـن دەترسـێ، هـەر ئەوەنـدەی دەمبینـێ خـۆی گرمۆڵـە دەکـا و مـات دەبـێ، بـە ترسـەوە بـۆم دەڕوانـێ، ئێســتاش هـــەروا لـــە سووچـــی خانوویـــەکی کـــرێ گرتـــەدا کـــەوتووەو چـــاوی بـــە مۆلـــەق وەســـتاوە. ناخەوێ، بە چاوی زیتەوە شەو و ڕۆژ کارو پیشەی بۆتە ڕوانین..

لـە سێیەم چوار ڕێیـان نزیـك بوونـەوە. شـۆفێر وتی: "عالەم بێ ماڵ و حاڵ بوون.."

ژنـــە، بـــە نیگەرانیـــەوە چـــاوی لـــە چـــوار ڕێیانەکـە بـڕی، قایشـی جانتاکـەی لەسـەر شـانی ڕێکوپێك کرد:

"هەر تەنیا بێ ماڵ و حاڵی نییە.. زۆرتان سوپاس دەکەم.. ئێوە لێرەوە لادەدەن.." ژنەی پێشەوە لەسەرەخۆ وتی: "مەهدی بیگەیەنە"

شۆفێر لە چوار ڕێیان تێپەڕی، جگەرەیەکی داگیرساند و لە ئاوێنەکەوە لە ژنە راما: "خوشکی کاکی، ئێرە سەرەڕای قوڕبەسەریەکانیشی لە هەموو لایەك خۆشترە." ژنە دیسان پاڵی بە سەندەڵیەکەوە داو هەناسەیەکی هەڵکێشا: "دوای هەموو شت پەنام بردە بەر سەفارەت. دەست و داوێنی پیاوێك بووم، وتم: هەر چۆنێك بێ بمانگەیەنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆمان. مێردەکەشم نیشان دا، کە وا چاوی بە مۆلەق وەستاوە.. وتم ئەگەر وەگەڕیین لەوە دەچێ پێڵووی چاوی لێك بنێ.. بەم جۆرە بوو گەڕاینەوە، بە دزییەوە، بێ ئەوەی خۆمان بمانبینن.. بەڵام ئەو هەمیشە دەیڕوانی.. زیت زیت، زۆر جار لە ماڵ وەدەردەکەوم، وەکو ئەمڕۆ، هەتا ئێوارێ وێڵ و سەرگەردان دەسووڕێمەوە.. بەڵام دیسان شەوانە منم و دوو شووشەی سەعاتەکە..."

گەیشتنە کۆتایی شەقامەکە. ژنە قامکی بۆ سووچێك راداشت. شۆفێرەکە وتی: "ئەگەر دەزانی دووره..." ژنە وتی: "نا، هەر لەو کۆڵانەدایە" بە نیگەرانییەوە لە ماشێنەکە دابەزی و خۆی کرد بە کۆڵانەکەدا. لە دوورەوە چاوی کەوت بە تابلۆی ئارایشتگایەك، دەرگای جانتاکەی کردەوە و دەستی کرد بە ژماردنی پووڵەکانی. ژوورەکە پڕ بوو لە مشتەری. ژنێك بە دەنگێکی حەزینەوە گۆرانی دەگوت: (ئەو ڕۆژەی لە تۆ دادەبڕێم، ڕۆژی مەرگی پێکەنینمە...[1]) دەنگی "سشوارەکان[2]" گۆرانییەکەی خنکاند. ژنەی جانتا لەشان بە دوودڵییەوە لە ژوورەکە راما، ئارایشتگەرەکە سەرو پرچی ژنێکی جوان دەکرد بزەیەکی هات و بۆ چەند چرکە دەستی لە کار کێشاوە: "ئەمرێکتان هەبوو؟"

"وەڵڵاهی.. دەمویست دەم و چاوم هەڵبگرم.. بەڵام لەوە ناچێ.."

"ئاوای مەبینە، نیو سەعات نابا"

ژنە هەرچەند پەرێشان بوو بەڵام دانیشت. چاوی دەتگوت ریشۆڵەی بە شەوارە کەوتووە بە نێو مشتەریەکاندا، ئارایشگەر چاوی لێ خافڵ نەدەکرد، ئامازەی کردە کچۆڵەیەك، چایەکی بۆ هێنا. ژنە بە شڵەژاوی چایەکەی هەڵقوڕاند. سەیرێکی سەعاتە دیوارییەکەی کرد و هەستا سەرپێ، قایشی جانتاکەی لەسەر شانی راستەو پاستەکرد.. ئارایشتگەر بزەیەك گرتی: "بۆ کوێ؟"

ژنە لە بن لێوەوە گوتی: "دەڕۆم، درەنگ دەکەوم"

"دانیشە کچی باش، چارەکێکی دیکە کاری تۆش تەواو دەکەم"

ژنە بەبێ وازییەوە دانیشتەوە. کات بوو بە کیسەڵێکی شەل. سەعاتەکە بە ئاستەم چرتەی دەکرد، مشتەرییەکان بەسەر کورسیەکانەوە بێ جووڵە بوون. ئارایشگەر خەریکی جوان کردنی سەروچاوی ژنێك بوو بەڵام کارەکەی هەروا لە جێی خۆی بوو، هەتا لایەکی رێك و پێك دەکرد لایەکەی دیکەی وەك خۆی لێدەهاتەوە.

ژنە خۆی بە قامکە شووش و باریکەکانییەوە خافلاند بوو، نینۆکەکانی بە ددانی دەجوو، بسکی مشتەریەکە درێژ دەبۆوە، ئەوەندە درێژ هەتا گەییە بەر پێی، ژنە حەجمینی لێ هەڵگیرا بوو، سەرنجی بزەی ئارایشگەرەکەی دا. دیاربوو بسکە درێژەکانی ژنەکەی نەدەدی. بەڵاڵە لاڵ گوتی:

"دە.. دەبێ بڕۆم، ئاوا نابێ.. بەڵکوو ئارایشگایەکی چۆڵ وەدۆزم". وەك بڵێی لە پڕ کاری سەر و چاوی ژنە تەواو بوو ئارایشگەر وردە تووکی پشت ملی مشتەریەکەی بە فڵچەیەك خاوێن کردەوە:

"جا بۆ چ خەراپییەکت لە ئێمە دیوە؟"

ژنە سەر گۆناکانی سوور هەڵگەڕا:

"ئەمشەو... خۆ... خوازبێنیکەرم دێت"

روخساری ئارایشگەر گوڵی کرد. قاقایەکی بۆ کێشا. ژنەکان تێکرا سەریان وەرسووڕاند و بە چاوی ڕێزەوە سەیریان کرد. ژنە لە ژێر روانینی ئەو هەموو چاوە جوانانەدا سەری لێ شێوا. ئارایشگەر بە پێکەنینەوە چوو بۆ لای: "خوازبێنیت دێت و ئێستا دێی بۆ خۆ جوان کردن؟"

ژنە کەوتە لێوە لەرە, دڵۆپێک ئەسرین لە چاوی بەربۆوە:

"ئێستاش بە بیانووی شیر کڕینی منداڵەوە دەرکەوتووم. وەك دەست بەسەر وام." مشتەرییەکان هەر چاوێکیان لێ ببوو بە چوار چاو, سەیریان دەکرد. سشوارەکە بێدەنگ بوو, گوڵبزەکان هێور هێور پووکانەوە: "حەوت ساڵان بووم دایکم مرد. بابم ژنی دیکەی هێنا. ژنێك هەمیشە منداڵی دەبوو. ساڵی منداڵێك, بە حەوت مانگ و جاری واش بوو لفەو دووانە.. کاتێك زانیم دەرو ژوور پڕ بوو لە منداڵ هەر منداڵەو بە دەرو دیواردا هەڵدەگەڕێ. زڕ دایکم بەردەوام زگی پڕو, هەر منداڵەی شتێك دەڵێ و شتێکی دەوێ و جۆرێك بیانوو دەگرێ, شەو و ڕۆژ دەچەوسامەوە ئاو و خوێنم بوونە یەك هەتاکو یەکەم و دووهەمی و... دەیەم پێگەیاند... ئەوەندە سەرقاڵ بووم هەر نەمزانی کەی گەورە بووم.. هیچم لە منالی خۆم لە بیر نییە, بێجگە لە منداڵ راژاندن و پەڕۆ شۆردن و بۆڵە بۆڵ و نقە نقی منداڵ بوونی زڕ دایکم.. وەختێك یەکەم داواکارم هات چواردە ساڵانە بووم بابم و زڕ دایکم نەیاندەزانی خوازبێنی کامەمان هاتووە, لە بیریان نەمابوو منیش هەم, یان باشتر بڵێم ناویشیان لەبیر کردبووم. کاتێك وتیان داوای سۆغرا دەکەین ئەوان

لە جێی خۆیان وشك بوون نەیاندەزانی چی بڵێن. بە چاو بۆ سۆغرا دەگەڕان, هەتا ئەوەی لەبەردەمیاندا هەستامە سەرپێ, وتم: منم! داوای من دەکەن. ئەو وەختە بوو منیان دیت و هاتمەوە بیریان, باوەژنم دووگیان بوو چەپۆکێکی دا بەسەر خۆیدا و گوتی: خودایا من چی بکەم لەو هەموو سەر و پێچکەیە؟ ئیتر ئەوە بوو لەگەڵ بابم بەشەڕ هات, بابم میوانەکانی جواب کرد. لەو دەمەدا بە من و منداڵەکان کە بە دەورمدا هەڵدەخولانی گووت: جارێ با ئەو منداڵەش لەدایك ببێ و پێ هەڵبگرێ ئەو کات.. بەم جۆرە بوو هەموو داواکارەکانی منیان جواب کردو ئەویش هەموو ساڵێ منداڵێکی دەبوو دایمەش بۆڵە و نقەی بوو.. ئێستاش سی ساڵە.. منداڵی هەرە چکۆلەی دوو ساڵیەتی.. ئەمرۆ نا سبەی دیسان زگی دەبێت. دەستی لەسەر زگی دادەنێت و بەیانی زوو نقەی دێ... ئیتر جارز بووم, ئەگەر ئەمشەو ئەو خوازبێنییەم لە دەست دەرچێ, زۆر سەیر نییە سبەینێ بنقێنێ و یەکی دیکەی ببێ, سەرلەنوێ دەبێ دانەیەکی دیکە گەورە بکەم".

ساڵۆنەکە کپ و بێدەنگ بوو. ژنەکان تێکڕا هەناسەیەکیان هەڵکێشا, ئارایشگەر تەماشایەکی دانیشتووانی کرد و کورسیەکی بۆ دانا: "دادە گیان ئەتۆ دانیشە, ئەو ژنانە پەلەشیان بێ نۆرە بڕیت بۆ دەکەم" ژنەکە لەو کاتەدا کە فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارێ لەسەر کورسیەکە دانیشت. ئارایشگەر بە توندی دەستی لەسەر هەردوو شانی دانا: "ئێستا دەتکەمە شای پەریان"

ئارایشگەر زۆر وەستایانە قامکەکانی خستە کار, ئەو شریتەی دەنگی گۆرانی ژنەکەی لێوە دەهات و ستەی نەما. ئەو ژنانەی لە نۆرەدا بوون شاگرد و وەستاکەش گوێ بیستی قسەکانی ژنە بوون:

"کە منداڵ بووم، دایکم لە جێگادا کەوتبوو، دەستەو ئەژنۆ بەلایەوە دەگریام، دەیگوت: خەم مەخۆ، چاك دەبمەوە، گەورەت دەکەم، شەوی بووکێنیت سەما دەکەم، چەپڵە لێ دەدەم.. زاوا لە بووکێ مەدە"

ژنە بە نێو هەلهەلە و چەپڵە ڕێزانی مشتەریەکاندا هەستا سەر پێ. ئاڕایشتگەر ئەسرینەکانی خۆی سڕیەوە پووڵەکەشی لێ وەرنەگرت، (پوولی بۆ ڕاگرتبوو: "وا بزانە دایکت ماوە... ئەوەش لە لایەن منەوە دیاری شووکردنەکەتە".

–2–

لە کۆڵانێ بوو. هەوا سارد و ناخۆش، ئەسرینەکانی بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوارێ. شوێنی تووکە هەڵکشاوەکانی دەکزانەوە. نەیدەتوانی پێش بە گریانەکەی بگرێ. دوو ژن شان بە شانی دەهاتن ژنە لە ترسی دوو چاو هەڵدەهات منداڵ گەلی ورد و درشت ژیانی کچێکی سی ساڵەیان هەڵدەلووشی، خۆ ئەگەر سێیەم ژنی نەدیبا ئاوا پەرێشان بەرەو ڕووی دەهات، فرمێسکەکانی هەتا هەتایە بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوارێ، ناچار بوو گوێ هەڵخا بۆ قسەی ئەو دوو ژنەی لە بن گوێیدا سرت و خورتیان بوو: "خەم مەخۆ، دوورت دەخەمەوە، وا بێ کەس دەستی پێت نەگا" رووی کردە سێیەم ژن و زریکاندی دوو ژنەکەش باوەشیان پێدا کرد. یەکیان وتی: "چاوی ببەستەو برۆ..."

دەنگی گریانی دووهەم ژن خۆی کرد بە گەرووی کۆڵانەکەدا:

"منداڵان دەمیان لە جەرگی ناوە..."

ژنە پاڵی بە هەردووکیانەوە ناو دووری خستنەوە، گورجێك خۆی گەیاندە سێیەم ژن کە لە سووچی پیادە ڕێیەکە ڕاوەستا بوو: "خەم مەخۆ، سواری ماشێنێکی دەربەست دەبین و هەڵدێین"

بە هەناسەبڕکێ خۆی گەیاندە شەقامەکە، ڕاوەستا. دەبوو هەڵێ، گوێی لە دەنگی پێی چەند پیاوێکی نامۆ بوو، جار لەگەڵ جار دەنگەکە نزیك دەبۆوە، پەشۆکا بوو نیگەران چاوی بە تاکسییەکاندا دەگێڕا ئەوانیش بە ڕێگای خۆیاندا ڕادەبووردن. ماشێنەکان سیکناڵیان لێدەدا، چراکانیان هەڵدەکرد و دەیان کوژاندەوە و تێدەپەڕین. ژنە سەیری دەکردن، چاوەڕێی ئەوە بوو کەسێك ئاوڕی لێ بداتەوەو یارمەتی بدا. جار جارەش ئاوڕێکی دەداوە. دەتگوت یەکێك وەدووی کەوتووە... هەر لەو دەمەدا پەیکانێکی سپی گەیشتە نزیکیو ژنە تێی ڕاما، شۆفێر کوڕێکی چوار شانەی بە دەماخ. هەتا نیوەڕاستی شەقامەکە ڕۆیشتە پێشێ، خێرا خێرا دەستی ڕاوەشاند، کوڕەکە بە سەرسامیەوە لاقی لەسەر تورمز دانا.

ژنە دەستگیرەی دەرگاکەی گرت، دەرگا نەدەکراوە. پەشۆکا بوو، لە شیشەکەی دا، کوڕە لاوەکە شووشەکەی داداوە: "کاکە، بیکە بۆ خاتری خوا یارمەتیم بدە"

کوڕەکە قفڵی دەرگای ماشینەکەی هەڵگرت. ژنە خۆی خستە ژوورێ دەرگاکەی داخست: "لێ.. لێخوڕە کاکە..."

دەگێڕاو دەیڕوانی. "خوشکێ چی بووە؟" "مەردی خوا بە برۆ ڕامەوەستە."

کوڕە سمێڵێکی شۆڕی هەبوو، تیسکەکانی سەریشی درێژ، نێو چاوانی تێك نا. سەری ڕاوەشاند، گێری گۆڕی و پێی پێوەنا. ژنە لە نێو ماشێنەکەدا کوشمەی کرد "پێت نەگوتم بۆ کوێ دەچی خوشکی کاکی؟"

ژنە پەشۆکابوو، گورگە ئاوڕێکی داوە و گوتی: "کاکە تۆ بڕۆ.. لە ڕێی..."

تووڕەبوونەکە قسەکەی سەربڕی. چاوی پڕ بوو لە ئاو، زیت زیت لە کوڕەکە راما. کوڕەکە بە قەڵس بوونەوە گوتی: "ئاخەر من نابێ بزانم چ باسە؟"

ژنە بە پاڕانەوە گوتی: "تۆ، تۆ تەنیا پێی پێوە بنێ و بڕۆ، لێخوڕە و بڕۆ."

"ئەرێ کەسێك بە شوێنتەوەیە؟"

"بەڵێ، بەڵێ.. مێردەکەم."

پیاوەکە توند لاقی لەسەر تورمز دانا: "وەڵا بابە تەواوم کرد."

ژنە بە قینەوە پڕی بە سوکانەکەدا کرد، حەولی دا هەڵیسووڕێنێ: "لێخوڕە کاکە... لێخوڕە، ناپیاوە قومارکەرەکە منی دۆڕاندووە، مانگێکە زەماوەندم کردووە.. دوێنێ شەوێ پێی گوتم میوانمان دێ. منیش ڕۆیشتم بۆ ئارایشگا.. ئەوە نییە دەموچاوم سوور هەڵگەڕاوە، ئاخریش... ئەمڕۆ هاتن، سێ پیاو، ئەو جار لێخوڕە کاکی من.. بەڵێ، قوماریان کردووە، لەسەر من مەرجیان کردووە، دۆڕاندوومی کاکی خۆم...

لە نێو قسەکانیاندا حاڵی بووم ئەوە کاریەتی، کاری هەمیشەیەتی، زوو زوو ژن دەهێنێ و لە پاش مانگێك دەیدۆڕێنێ.. هەتا ئێستاش پێنج ژنی دۆڕاندووە"

پەیکانە سپی تەواو گاز بە شەقامەکەدا دەڕۆیشت، ژنە ملی نا بوو لە دەردە دڵی کردن، پیاوەکەش خێرا خێرا دندەی دەگۆڕی و بە ڕقەوە مستی لە فەرمانەکە دەسرەواند: "مەگەر دایك و بابت چاویان نەیدەدیت دایانی بە قومارکەرێك؟"

"کێ دەیزانی وایە کاکە گیان!"

"ئاخەر پرسێك، بیرو ڕایەك.."

"لە هەرکەسمان دەپرسی دەیگوت باشە، کەس بە خراپی نەدەزانی..."

کوڕە سمێڵە شۆڕەکەی خۆی دەکرۆشت، ئەوەندە تووڕە بوو چاوی عەرزی نەدەدی: "ئەی ئێستا بەم حاڵەوە بۆ کوێ دەچی؟" "دەچمە ماڵی خوشکم"

"بچۆ شارەوانی خوشکی من، بۆ خۆم لەگەڵت دێم."

ژنە بە شڵەژاوی دەستی بەسەر فەرمانەکەدا گرت: "نا، نا برای من، ماڵی خوشکم"

تاریك داهاتبوو. زۆریان نەمابوو بگەنە مەنزڵ، ژنە دەرگای جانتاکەی کردەوە و پووڵی دەرهێناو بۆ شۆفێرەکەی ڕاگرت.

"بڕۆ، بڕۆ خوشکێ پووڵم ناوێ.."

ژنە پووڵەکەی خستەوە نێو جانتاکەی، دەستی برد بۆ دەستگیرەی ماشێنەکە: "زۆرتان سوپاس دەکەم، عەزیەتم کردن"

"نا، عەزیەتی چی... دەڵێم تاریکە، با هەتا بەر دەرگات بەرمەوە"

"نا.. نا، بزانن پێیان ناخۆش دەبێ".

*-3-*

هێشتا لە کۆڵانێ دابوو، پەیکانە سپی لەسەری کۆڵان لە قەراخی شەقامەکە ڕاوەستا بوو، سێیەم ژن دووا بە دووای دەهاتە پێشێ. ژنە بۆ خۆشارۆکێ خۆی کرد بە کۆڵانێکداو سێیەم ژن دەستبەرداری نەبوو: "ئەتۆ بۆ وەدووم کەوتووی؟"

"دەمەوێ لەگەڵ تۆ بم" "لەگەڵ من؟ لەو ڕۆژگارە خاوێنەدا، بەم خەرج گرانییە" سێیەم ژن زەردە گرتی:

"ئەو ژیانەی تۆی تێدای خەرجێکی نییە"

ژنە هاتەوە سەر راستە کۆڵانەکە، پەیکانە سپی رۆیبوو. سێیەم ژن توند قۆڵی گرت.. "من کە حەشیای خودا شك نابەم، با لەگەڵت بێم، تۆ نازانی چوار پیاو وەدووم کەوتوون" "تۆیان بۆ نابیندرێتەوە، بەڵێنت پێ دەدەم، هەتا هەتایە ناتبیننەوە، ئەوەش بزانە کە من بە تەنیا نیم، یانی بە تەنێ ناژیم"

سێیەم ژن باسکی ژنەی بەردا، بەسەرسوورمانەوە لە جێی خۆی وشك بوو: "لەگەڵ پیاوێك دەژی؟"

"نا، لەگەڵ ژنێك بە ناوی شەهرزاد"

"چ کارەیە؟"

"هیچ کارە، سەری لە ژێر سێدارەدایە. ژنی پیاوێکە عادەتی وایە هەرکات دەستی بووکی گرت، لە پاشان دەیکوژێ، بەڵام شەهرزاد هەموو شەوێ بە گێرانەوەی حەقایەت پیاوەکە دەخافڵێنێ هەتا بانگی بەیانی.. رۆژێك ئەوم بینی کە هەقایەتەکەی لێ تەواو ببوو.. " "ئەتۆش هەموو رۆژێ روو دەکەیە شەقامەکە؟"

"بەڵێ، هەموو رۆژێ، ئێستاش بڕۆ.. تاریك داهاتووە هاکا ئەمیر هاتەوە بۆ ژووری خەوتنەکەی".

*-4-*

ژنە قفڵەکەی هەڵگرت و دەرگاکەی کردەوەو لەسەر پاژنەی سووڕا، گڵۆپی برقەکەی هەڵنەکرد. تا پیرەژنەکان کە لە چاوەڕوانی دارەمەیتی شەهرەزاددا بوون لە هاتنی بەئاگانەیەن. پێڵاوەکانی لە پێی داکەند، هێواش هێواش بە پلیکانەکاندا سەرکەوت. دەنگی سرت و خورتی پیرەژنەکانی لە نهۆمی سەرێ گوێ لێبوو: "ئەمشەو دەیکوژێ" "ناتوانێ" "چۆن" "حیکایەت! حیکایەتەکانی لە مردن رزگاری دەکا.."

"نابێ بهێڵین لە ماڵ وەدەرکەوێ..."

"بەڵێ راستە، تەنیایی ئینسان دەکوژێ.."

"گوێم لە دەنگێك بوو" "نا، خۆ چرایەك هەڵنەکراوە"

"لەوە دەچێ پیاوێکی لەگەڵ بێ..." وستەی لە خۆی بڕی، پەنجەرەیەکی بچووك بەرەو رووی پلیکانەکان کرایەوە، ژنە پاڵی بە دیوارەکەوە دا، دوو پیرەژن بوون بە دڕووی مەم و زین، چەند چرکە دواتر پەنجەرەکە پێوەدرا و ژنە دەستی بە (نەردە)ی پلیکانەکان گرت و وەسەرکەوت.

ئاخری خۆی گەیاندە نهۆمی چوارەم. بە هەناسەبڕکێ لە دەرگای دا، سی کەڕەت لەسەر یەك.. ئەوە رەمزی خۆی بوو. شەهرەزاد دەرگای لێ کردەوە، لە چاوەڕوانیدا زمانی لە گۆ چوو. نیگەرانی و دڵەڕاوکێی بۆ نەشاردراوە. ئەوەندەی بێ خەوی کێشابوو چاوی سوور ببوو. ژنە ماندوو هیلاك چووە دیوی ژوورێ، ئاوێنەیەکی گەورە روو بە رووی دانرابوو، شەهرەزاد دەستی لەسەر دڵی دانا: "وەی، ترپەی پێت چەندە لە ترپەی پێی ئەمیر دەچێ.."

ئەو جار باوەشی پێدا کرد:

"خێرا پێم بڵێ.. هەتا چەند چرکەی دیکە ئەمیر دەگاتە ژووری نووستن.."

ژنە بە دەم پێکەنینەوە سەیری ئاوێنەکەی کرد و گوتی:

"ئەی فریشتەی بەختەوەری..."

## پەراوێزەکان

1-ژنە گۆرانی بێژی فارس، خاتوو ئەفسەر شەهیدی.

2-سشوار: ئامێری سەر وشککردنەوە.

## سەرچاوە

کتێبی سیریا، سیریا.

انتشارات نیلوفر

چاپ دوم: تابستان 1378.

# فایلێکی تایبەت بە بۆرخیس



# وتەیەک بۆ بۆرخیس

خــورخی لــویس بــۆرخیس لەســەر ئاســتی ئــەدەبیات و کــەلتووری جیهــان دیــارترین نووســەر و وەرگێــر و چــیرۆکنووس و وتاربێــژ و رەخنــەگرە. ئەگەرچی لەدایکبووی ئەرجەنتینــە و لــە نووســینیا گــەلێك لــە دیــاردە و ســیمای ئــەمریکای لاتــین و بــە تایبــەت بــوینس ئایرســی پایتــەختی ئــەو وڵاتــە دەردەکــەون. بــەڵام هــەر لــە مێــرد منداڵیــەوە بــەرەو زوربەی وڵاتانی ئەوروپا رۆیشتوەو خوێندنیشی هەر لــەو شــوێنانە تــەواو کــردوە (لــە وتــارێکی تــری ئــەم فایلــــەدا بــــە درێــــژی ئامــــاژە بــــەو ســــەفەرانە دراوە)کاریگەری بورخیس لەسەر ئەدەبی ئەمریکا و تەنانەت لەسەر ئاستی ئەوروپاییش لەبەرچاوە. ئەم نووســەرە نــاودارە ســاڵی (1899) واتــا لــە دوا ســاڵی سەدەی نۆزدەهەمدا لە بوینس ئایرس لەدایك بوە. لەگــەڵ خانەوادەکەیــدا لــە تەمــەنی پــانزە ســاڵیەوە چوونەتە ئەوروپا. سەرەتا لە سویسرا و ئیسپانیا نزیکــەی حــەوت ســاڵ ماونەتــەوە. پاشــان روویــان لــە ئیتالیــــا و فەرەنســــا کــــردووە. دوای تــــەواوکردنی خوێنــدن گەڕاوەتــەوە ئەرجــەنتین و چــالاکی ئــەدەبی دەست پێکردوە (ئەگەرچی هەر لە کاتی خوێندندا لە سویسرا هەندێك چالاکی وەرگێڕانی هەبووە). ساڵی (1923) چــــەند دیوانــــە شــــیعر و پەخشــــانی بڵاوکــــردەوە. نــــاوەڕۆکی بابەتــــەکانی زیــــاتر خۆشەویســــتی ئەرجەنتینــــە. وەك بیــــەوێت دەردی دووری و ئــازاری ئــاوارەیی خــۆی بــەو بەرهەمانــە برەوێنێتــەوە. بــورخیس بێجگــە لــە زمــانی ئیســپانی، فەرەنسی و ئیتالی و ئینگلیزی و ئەڵمانی زانیوە، بە هەنــدێکیان بەرهــەمی نووســیوە و بــە هەموویشــیان خوێندویەتیــەوە. هــەر لــەو ســەرەتایەوە ســەرگەرمی خوێندنــەوەی زانســتی لۆژیــك و فەلســەفە و مێــژوی ئاینــەکان و نووســەرە دیارەکــانی وەك کافکــا و ئــالان پۆ و گونگورا (شاعیرێکی ئیسپانیە) بوە.

پــــۆرخیس دیــــدێکی دنیــــابینی هــــەبوەو، بەردەوامیش پەیڕەوی لە "گومان کردن" کردوە نەك لە حەقیقەتی رەها، بەڵام لەسەر چەند مەسەلەیەك دڵنیا بوە:

1- حەقیقەت پەیوەندی بە نەتەوەو خەڵکێکی دیاریکراوەوە نیە.

2- کاتێك فەلسەفە نرخی هەیە کە نکولی لە هەستەکان نەکات بەرانبەر بە جوانی.

3- نووسین بەڵگەی بە مەزنی ژیانە و کتێب لە هەر شتێکی دی بەنرخ و گەورەترە.

بــــورخیس لــــە ســــەردەمی فــــەرمانڕەوایی (پیرۆن)[1]دا لێپرسراوی کتێبخانە بوو. بەڵام لەسەر بەرهەڵستی کردن و مل نەدانی بۆ دەسەڵات لەسەر کار لابرا. دوای کەوتنی دیکتاتۆریەت ساڵی 1955

کرایــە ســەرۆکی کتێبخانــەی گشــتی و مامۆســتای زانکۆ لـە بـوینس ئـایرس. ئـەوە ئـەو کاتـە بـوو کـە بورخیس بە تەواوی کوێر ببـوو (ئەم نەخۆشیە هـەر بە میراتی لە بنەماڵەکەیاندا هەبووە) هەر ئەو ساڵە کرایـە ئەنـدامی ئـەکادیمیای ئەرجـەنتینی و خـەڵاتی کۆنگرەی نێونەتەوەیی لەگەڵ نووسـەری بەناوبانگی ئیرلەنــدی ســەموئیل بیکیــت (1906-1989) بــە هاوبەشی وەرگرت. پاشان بەردەوام بۆ وانە وتنـەوەو وتاربێـژی لـە ئـەمریکا و ئـەوروپاوە داوەت دەکـرا و گـەلێك خـەڵاتی تـری درایـە. چـەند جـارێکیش بـۆ خەڵاتی نۆبڵ دەستنیشان کرا.

بـورخیس لـە بـواری وتاربێژیـدا یەکێکـە لـە دیـارترین کەسـی سـەردەمی خـۆی, وتارەکـانی وەك داهێنانـەکانی تـری لـە بـواری ئـەدەب و ڕوناکبیریـدا بەشێك بوون لە کەسایەتی و پەیوەندیە چڕەکانی بە ڕەهەندە جیاوازەکانی فیکرەوە. کە ساڵی 1946 لە بەڕێوەبەرایـەتی کتێبخانـە دەسـتیان پێکێشـایەوە, ئیدی وتاربێژی کردە سەرچاوەی بژێوی خـۆی. ئـەم کـارە هەنـدێك کێشـەی بـۆ ئـەو هـەبوو. لەبەرئـەوەی بـەهۆی کوێریەتیەکەیـەوە نەیـدەتوانی بخوێنێتـەوە, ناچـار بـوو لــە ســەرەتادا بــە یارمــەتی دایکــی مەبەستەکانی ئەنجام بدات, پاشان ئەوەی بە یاد و لەبــەرکردن سـپارد. ئـەم خـۆ ناچـارکردنە لەسـەر لەبـەرکردنی مەبەسـتەکان خزمـەتێکی گـەورەی بـە بۆرخیس کرد, چونکە پێ بە پێی کوێریەتیەکەی, کتێبخانەیــەکی تایبــەتی سەرنجڕاکێشــی لــە سەرچـاوەو وتـەزاکانی لـە یـادی خۆیـدا تۆمـارکرد, بەڕادەیـەك ئەگـەر پرسـیارێکت لـێ بکردایـە, زۆری نەدەبرد دەرگای کتێبخانەکەی دەکرایەوەو وەڵامێکی ڕاســت و دروســتی دەدایــەوە. لــە ســاڵانی حـەفتا بـەدواوە, هـەر بـۆ وتاربێـژی, سـەفەری هـەموو ئەوروپا و ئەمریکای باشور و وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکای کردووە.

هۆی ناوبانگی زۆری پۆرخیس لەمانەدا پوخت دەکرێـت: پوخـت و ڕەوانـی دەربڕینـەکانی, خـەیاڵی دەگمـەنی, دوورکەوتنـەوە لـە مۆدێلی ئـەدەبی, هەمـە جۆری نووسینەکانی, خۆنەبەستنەوەی بە لایـەنێکی سیاسـی و ئایدۆلۆژیــەکی دیــاریکراوەوە, بایــەخی زۆری بە فەلسەفەو ئەدەب, بە کورتی دەتوانین بڵێین بورخیس تەنیا بۆ ئەدەب دروست ببوو. لە بەرهـەمی چــاپکراوی بیســت دیــوانی شــیعر, دوانــزە کۆمەڵـە چـیرۆك, کتێـب و وتـار و ڕەخنـە لـە بـارەی ئەدەبیات و فەلسەفەوە.

بـورخیس لــە چـواردەی حـوزەیرانی سـاڵی 1986دا لە سویسرا کۆچی دوایی کرد.

-سەردەم-

## پەراوێز

(1)سەرۆك کۆماری دیکتاتۆری ئەرجەنتین 1946-1955و 1973-1974.

# بیوگرافی منداڵی و قوتابخانە و شیعر

خۆرخی لویس بورخیس
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

من هیچ چێژێك لە یادەوەری ساڵانی بەرایی قوتابخانە ناکەم. یەکەمیان لەبەرئەوەی لە تەمەنی نۆ ساڵیدا چوومەتە قوتابخانە. چونکە باوکم کە مەیلێکی ئانارشیستی توندی هەبوو، خۆشیی لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت نەدەهات. دووەمیان لەبەرئەوەی من چاویلکەم لە چاو دەکرد و یەخەی خوازراوو بۆینباخم دەبەست، ئیتر زۆربەی قوتابییەکان کە پەروەردەیەکی نادروست کرابوون بە درێژایی وەخت گاڵتەو شۆخیان پێ دەکردم، بۆیە ئێستا ناوی قوتابخانەکەم لە بیر نییە. وەلێ ئەوەی لە بیرم ماوە قوتابخانەکە دەکەوتە شەقامی ئەلتامیز (باوکم هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە مێژووی ئەرجەنتین وەك فێربوونی ئایینی وایە) بۆیە دەبوو هەر کەس ئەرجەنتینی بێت ئێمە خۆشمان بوێت. بۆ نموونە مێژووی ئەرجەنتینیان فێر دەکردین بێ ئەوەی باس لەو وڵات و سەردەمانە بکەن کە ئەرجەنتینیان پێك هێناوە. بەڵام لەوانەی دارشتندا بە ئیسپانی نووسینیان بە شێوازێکی شێواو فێر دەکردم:

(ئەوانەی لە پێناوی سەربەستی وڵات، ئازادی، شکۆمەندیدا خەباتیان کرد) پاشان لە جنێف فێری ئەوەیان کردم کە ئەم شێوازە هیچ مانایەکی نییە و دەبێت خۆم بە چاوی خۆم شتەکان ببینم. وەلێ نورای خوشکم کە لەدایکبووی ساڵی (1901)ە ئاسایی چوە قوتابخانەی کچانەوە.

بەدرێژایی ئەو ساڵانە وەرزی هاوینمان لە "ئادروگیە" بەسەر ئەبرد " کە بیست کیلۆمەتر لە باشووری بوینس ئایرسەوە دوور بوو" لەوێ موڵکداربووین، خانوویەکی گەورەی یەك قاتی و باخێکی فراوان بە دەوریدا، دوو ساباتی هاوینە و ئاشێکی هەوایی، بێجگە لە سەگێکی شوانیی تووك بۆرو لوول.

ئەوسا "ئادروگیە" شارۆچکەیەکی دووری هێور بوو، ماڵەکانی گوندیانەو پەنجەرەکانی ئاسن و لە پاڵ دەرگاکانیدا ستوونی بەردین و گوڵجاڕ بوو،

لە دەوروبەریدا باخ و شەقامی روونـاك و درەختـی یوكالیپتوس هەبوو, لە ماوەی دە ساڵدا گەلێك لە هاوینەكانمان لەوێ بەسەربرد.

یەكەمین دیدەنیم لە ناوچەی ئەلبامبا ساڵی 1909 بوو, بە هۆی سەردانمان لە هەندێك لە خزمەكانی شارۆچكەی سان نیكولاس كە دەكەوێتە باكووری خۆراوای بوینس ئایرسەوە. لە بیرمە نزیكترین ماڵ لە ئێمەوە وەك نووختەیەكی نادیار لە ئاسۆدا دەردەكەوت, بەو ناوچە بەرفراوانەیان دەوت ئەلبامبا. كە پێیان وتم كرێكارەكانی كشتوكاڵ سەر بە (توشو)ن وەك كەسایەتیەكانی ئەدوارد و جوسیرت, جێگایەكی تایبەتیان لای من پەیدا كرد, جارێكیان بەیانیەكی زوو بۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن لەگەڵ خۆیاندا بە سواری بردمیان بۆ سەر ڕووبار, پیاوە كورتە باڵا و گەنم ڕەنگەكان, بەرگی بومبا چاسیان پۆشی بوو (جۆرە پۆشاكێكە) كە لێم پرسین ئاخۆ مەلە دەزانن یان نا, وەڵامیان دایەوە: "ئاو بۆ ئاژەڵە" دایكم بووكەڵەیەكی لەناو كارتۆنێكی گەورەدا پێشكەش بە كچی سەركارەكەیان كرد. كە ساڵی ئایندە گەڕاینەوەو هەواڵی كیژۆڵەكەمان پرسی بە دایكمیان وت: "بەو بووكەڵەیە چەند بەختەوەرت كردووە" ئاماژەیان بۆ بووكەڵەكە كرد كە لە كارتۆنەكەدا وەك تابلۆ بە دیوارەكەوە هەڵواسرابوو. دیار بوو نەیان هێشتبوو كیژۆڵەكە دەستی لێوە بدات نەك پیس بێت یان بشكێت و دەبێت هەر لە دوورەوە تەماشای كردبێت. بووكەڵەكەیەك كە لە سەرەوە دانرابێت و كەس نەیتوانیبێت دەستی تێوە بدات, دەشێت لە پاشەڕۆژدا بیپەرستن. ڕۆژێك لوگونیس نووسی كە لە قورتوبەدا پێش ئەوەی شوێنە بازرگانیەكان بكرێنەوە, وا باو بوە وەرەقەیەك لە كاغەزەكانی یاریان وەك تابلۆ هەڵواسیوە. وەرەقەكەیان بە بزمار لەسەر دیواری كوختەكانی (ئالگوشو) داكوتاوە, باشترین وەرەقەیش لایان ئەوە بوە كە وێنەی شێر و دوو قەڵای لەسەر بوە. وەك لە بیرم بێت پێش چوونم بۆ جنێف, هەوڵی نووسینی قەسیدەیەكم لەسەر (ئالگوشو) دابێت كە وابزانم ئیلهامەكەیم لە دۆخی شیعرێكی ئیسكاسوبی وەرگرتبێت. وەك لە بیرم بێت بە پێی توانا هەوڵم دابوو هەندێك لە تەعبیرەكانی ئالگوشوی تیا بێت. بەڵام ڕووبەڕووی گیروگرفتێكی زۆر تەكنیكی بوومەوە. دیارە دوای دووسێ بڕگە وازم لە هەوڵەكەم هێنا.

## ئەوروپا

ساڵی 1914 بەنیازی ئەوەی بە تەواوی جێگیر بین چووین بۆ ئەوروپا, تا دەهات چاوی باوكم كزتر دەبوو, لە بیرمە جارێكیان وتی: "چۆن بتوانم ئیمزای كۆمەڵێك بەڵگەنامەی ڕەسمی بكەم كە نەتوانم بیانخوێنمەوە؟" كە لە تەمەنێكی زوودا ناچار كرا بە خانەنشینی, بۆ بڕیار لەسەردان و ڕێك خستنی ئەم گەشتە زیاد لە دە ڕۆژی نەخایاند, چونكە لەو سەردەمەدا دنیا وەك ئەمڕۆ ئەمەندە زۆر بەترس و پارێز نەبوو كە ئەم هەموو بەڵگەنامەی ئیداری و پێویستی تری بوێت. لە پێشا چەند هەفتەیەك لە پاریس ماینەوە, ئەو شارەی نە ئەوسا و نە ئێستایش بە شێوەیەكی تایبەتی ڕامناكێشێت. تا ڕادەیەك بە پێچەوانەی هەموو ئەرجەنتینییەكانەوە. ڕەنگە بێ ئەوەی خۆیشم پێی بزانم, لەبەر ئەوە بێت كە من مەیلێكی بەریتانیم هەیە, لە ڕاستیشدا من زۆر جار ڕووداوەكەی (واتەر لوو)م بەسەركەوتن لە قەڵەمداوە. مەبەستی ئەو سەفەرەمان بۆ ئەوە بوو كە من و خوشكەكەم لە جنێف بەردەوامیی بە خوێندن بدەین. وا بڕیار بوو لەوێ لای نەنكم –دایكی دایكم– بمێنینەوە كە بە درێژایی سەفەرەكەمان لەگەڵماندا

بوو هەر لەو شارەیشدا کۆچی دوایی کرد. لە کاتێکدا کە باوك و دایکم بە ئەوروپادا دەگەڕان، باوکم لای پزیشکێکی پسپۆڕی سویسری بەناوبانگ لە چارەسەرکردنی چاویدا بوو، ئەوسا ژیان لەو کیشوەرەدا لە بۆینس ئایرس ئاسانتر بوو، لەو کاتەدا بیزۆی ئەرجەنتینی دراوێکی بەهێز بوو، ئێمە ئاگامان لە ڕووداوەکان نەبوو، هیچ نەمانەدەزانی شەڕی یەکەمی جیهانی لەبەرپابووندایە و لە مانگی ئابدا دەست پێدەکات. بە ڕێکەوت لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕدا باوکم و دایکم لە ئەڵمانیابوون، وەلێ ئەوان تەگبیری گەڕانەوەی خۆیان بۆ جنێف کرد. دوای ساڵێك کە شەڕ لە لووتکەیدا بوو، ئێمە توانیمان لە ڕێگای چیاکانی ئەڵپەوە گەشتێك بە سەرووی ئیتاڵیادا بکەین، تا ئێستایش یادەوەرییەکی ورد و ڕوونم لەسەر ڤیرونا و ڤینیسیا هەیە، لە مەدرەجی ڤیرونیای چۆڵدا وەستام و بوێرانە چەند بڕگەیەکی درێژی شیعریی ئیسکاسویم خوێندەوە کە لەسەر ئالگوشیو نووسیبووی.

لە یەکەمین پاییزی جەنگدا -1914- لە کۆلێژی دوجنیف کە جان کالفان دروستی کردبوو دەستم بە خوێندن کرد، قوتابخانەیەکی ئەهلی بوو، پۆلەکەم نزیکی چل قوتابی تیا بوو کە نیوەی بێگانە بوون. مادەی سەرەکیمان لاتینی بوو، زوو لەوە گەیشتم ئەوەی بیەوێت لاتینی فێر بێت دەتوانێت بە ئاسانی گوێ بە مادەکانی تر نەدات. وانەکانی - جەبر و کیمیا و فیزیا و زانستی کانزاکان و زانستی ڕووەك و بایالۆژی - بە فەرەنسی دەخوێنران. ئەو ساڵە هەموو تاقیکردنەوەکانم بەسەرکەوتوویی بڕی، بێجگە لە تاقیکردنەوەی زمانی فەرەنسی. هاوپۆلەکانم، بێ ئەوەی خۆم بیزانم یان پێم بڵێن، داواکاریەکیان دابوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانە و هەموو ئیمزایان لەسەر کردبوو، لە داواکاریەکەدا ئاماژەیان بەوە دابوو کە من ناچار کرابووم هەموو وانەکانم بە زمانی فەرەنسی بخوێنم کە زمانێکە باش نایزانم و پێویستیم بە فێربوونی هەیە، داوایان لە بەڕێوەبەر کردبوو ئەوە ڕەچاو بکات و ئەویش زۆر بە خۆشییەوە قبووڵی کرد. لە سەرەتادا تەنانەت نەمدەزانی مامۆستا کەی پرسیارم لێ دەکات، چونکە ناوەکەمی بەشێوەی فەرەنسی دەوت، تەنیا بڕگە دەنگیەکەی دەوت (وەك چۆن وشەی "بورج" دەوترێت، لە کاتێکدا کە ئێمە بە دوو بڕگەی دەنگی دەیڵێین، لەو کاتەدا پیتی -ج- دەبێتە -خ-ێکی سووکەڵە. بۆیە کاتێك دەمزانی پرسیارەکە بۆ منە کە هاوڕێیەکم بە ئەنیشکی تێوەی دەژەندم.

ئێمە لە بەشێکی کۆنی ئاپارتمانێکدا دەژیاین کە دەکەوتە باشووری شارەوە، تا ئێستایش گەڕەکەکانی جنیف لە بۆینس ئایرس زیاتر شارەزام، بۆ ئەمە لێکدانەوەیەکی ئاسان هەیە، ئەگەر بزانین دوو شوێنی بەرز لە جنێفا نییە کە لە یەکتری بچن و ئەمەیش وا دەکات بە ئاسانی لە یەکتریان جیا بکەیتەوە.

هەموو ڕۆژێك بە کەنار ڕووبارە سەوزە بەستووەکەدا دەڕۆیشتم، ڕووباری ڕوون، کە بە ناوەڕاستی شاردا دەڕوات و حەوت پردی لە یەکتر جیاوازی لەسەرە. سویسریەکان ئاسایی خەڵکانێکی پارێزکارن، دوو هاوڕێی نزیکم هەبوون جوولەکەی بە ئەسڵ پۆلۆنی بوون -سیمون پشلنسکی و موریس ئیبراموفتیش- یەکێکیان بوو بە پارێزەر و ئەوی دی بە پزیشك. هەردووکیانم فێری یاری (تروکو) کرد، هێندە شارەزای بوون لە یەکەم یاریدا هەموو پارەکانیان لێ بردمەوە. ئەگەرچی لە ماڵدا هەر بە ئینگلیزی دەمخوێندەوە بەڵام لاتینیش فێر بووم. لە ماڵەوە بە ئیسپانی قسەمان دەکرد، بەڵام

خوشــکم لــە زمــانی فەرەنســیدا زۆر پێشــکەوت, تەنانــەت هەنــدێك جــار هــەر بــەو زمانــەوە خــەونی دەبینــی. لــە بیرمــە ڕۆژێــك کــە گەڕامــەوە بــۆ ماڵــەوە, نــورام لــە پشــت پــەردە سوورەکەوە بینــی کــە لەبــەر خۆیەوە هــەر دەیــوت: "مێش, مێش" بۆم دەرکــەوت ئەویش گەیشتۆتە ئەو باوەڕە فەرەنسیەی کە مێش جۆرە مێروویەکی ترسناکە. دایکم هاواری لــێ کرد: "وەرە دەرێ" شــتێکی تریشــی پــێ وت کــە بــۆ وڵاتەکەی جوان نەبوو وتی: "تۆ لە ناو مێشدا لەدایك بوویت و پێگەیشتیت".

بــەهۆی شــەڕەوە, بێجگــە لــەو گەشــتە کورتــەی ئیتالیا و هەنــدێکی تــری نــاو سویســرا, نــەمانتوانی ســەفەری تــر بکــەین. دوای ماوەیــەکی کــەم, نەنکــە ئینگلیزەکــەم, تــوانی لەگــەڵ چــوار پێــنج گەشــتیاری تردا, لە ئابلووقەی پاپۆڕەکانی ئەڵمانیا خۆی ڕزگار بکات و لە جنێف بگاتە لامان.

بە دەستپێشخەری خۆم, لە دەرەوەی قوتابخانە دەســتم بــە فێربــوونی زمــانی ئــەڵمانی کــرد, ئــەم بیرۆکەیــەم ئــەو کاتــە لەســەر گــەڕا کــە ( *Sortor Resartus*)ی کارا لایلم خوێندەوە. ئەو نووسەرەی لە لایەکەوە سەرسامی کردم و لەلایەکی ترەوە هەرەسی پــێ هێنــام. پاڵــەوان دیــوجینیس –پیســایی–ی شەیتان ئەڵمانیە و مامۆستای ئاقاری ئایدیالستیە. مــن لــە ئــەدەبی ئەڵمانیــدا بــە دوای ســیمایەکی جەرمەنیدا دەگەڕام کە شێوەیەکی تاسیتی تیا بێت. بــەڵام پاشــان ئــەوەم لــە زمــانی ئینگلیــزی کــۆن و ئەسکەندەناڤی کۆندا دۆزیــەوە. من ئــەدەبی ئــەڵمانی بــە ئــەدەبێکی ڕۆمانســی و ناتــەواو دەزانم. لــە سەرەتادا دەستم دایە کتێبی (ڕەخنەی عەقڵی پەتی) کانت, بــەڵام زۆری نــەبرد کــە ئــەو کتێبــە نــا ئومێدی کردم وەك چۆن زۆربەی خوێنەرانی نائومێد دەکات, تەنانەت زۆربەی خودی خوێنەرە ئەڵمانیەکانیش. بە خــۆم وت شــیعر زووتــر بــە دەســتەوە دێــت چــونکە کورتە, بۆیە کەوتمە هــەڵوەدای دەستخستنی شیعرە بەراییــەکانی هــانریش هاینــە (*Lurisches intermezzo*) هــەروەها فەرهــەنگی ئــەڵمانی – ئینگلیــزی. پاشــان وردە وردە ئــەوەم بــۆ ڕون بــوەوە بــە هــۆی فەرهــەنگی ئــەو شــاعیرەوە واز لــە فەرهــەنگی تــر بهێــنم. زۆری نــەبرد کــە تــوانیم چێــژ لــە جــوانی زمانەکــەی هاینــە ببینم و ڕۆمانی مایرنك *Der Gotem* بخوێنمەوە.

ساڵی 1969 کە سەری ئیسرائیلم دا, چەند و چــونێك لــە نێــوان مــن و گرشــوم شــولیمدا لەســەر ئەفسانەیی مەجەری گولیم ڕوویــدا. گرشوم پسپۆڕە لە کلتوری یەهودیدا, من دوو جار لەبەر پێویستیی کێش لە دوو شیعری خۆمدا ناوی گولشیمم هێناوە, هــەروەها هەوڵمــداوە خــۆم خــەریکی –جــان بــول ریختەر– بکەم لەبەر کارلایل و توماس دوکونیسی – ئەمە لە دەوروبەری ساڵی 1917دا بوو, بەڵام زۆری نەبرد کە زانیم ئەو خوێندنەوەیە بێزارکەرە, لەگەڵ ئەوەیشــدا کــە بەریتانیــەکان سەرســامن بــە ریختــەر بـــەڵام بـــۆم دەرکـــەوت نووســـەرێکی قـــووڵ نیـــە و خوێندنــەوەی خــۆش نیــە, لەگــەڵ ئەوەیشــدا ڕێبــازی تەعبیریــەتی ئــەڵمانی زۆری ســەرنج ڕاکێشــام و تــا ئێســتایش لــەو بــاوەڕەدام کــە تەعبیریــەت بــاڵاترین قوتابخانــەی هونــەری ســەردەمی وەك ئینتباعیــەت و کـــوبیزم و فیوچـــەریزم و ســـوریالیەتە و.. دوای چەند ساڵێك لە مەدرید کەوتمە وەرگێڕانــی هەندێك لــە شــاعیرە تەعبیریــەکان, وەك بــزانم ئــەوە هــەوەڵ و دوا وەرگێڕانـــی ئـــەو شـــیعرانە بـــوو بـــۆ ســـەر زمانی ئیسپانی.

ئــەو ماوەیــەی لــە سویســرا بــووم, کەوتمــە خوێندنـــەوەی شـــوپنهاوەر, تـــا ئێســـتایش ئەگـــەر پێویست بێت تاقە فەیلەسوفێك بخوێنمەوە هــەر ئەو هەڵدەبــژێرم, ئەگــەر بمانــەوێت بــە وشــە تــەعبیر لــە

گــەردوون بکــەین ئــەو وشــانە لــە بەرهەمــەکانی شـوپنهاوەردا دەبینینـەوە، چـەند جارێـك بـە زمـانی ئـەڵمانی خوێندومنەتـەوە، بـە زمـانی ئیسـپانییش لەگــەڵ بــاوکم و هــاورێ گەورەکەیــدا ماســیدونیو خوناندیســـدا خوێندومەتـــەوە. مـــن ئـــەڵمانی بـــە زمـانێکی زۆر جـوان دەزانم، ڕەنگـە لـەو ئەدەبـەی بەرهــەمی هێنــاوە جـوانتر بێـت. لـە کاتێکـدا کـە فەرەنسـی، موفارەقەکـە لێرەدایـە، ئـەدەبێکی جوانی بەرهەم هێناوە لەگەڵ ئەوەیشدا کە خۆی وابەستەی قوتابخانە و بزاوتە ئەدەبییەکانە، بەڵام زمانەکە خۆی لە خۆیدا بەڕای من ناجۆرە، چونکە شتەکان کە بە فەرەنسی دەوترێن گران دەکەونە سەر زمان. من لـەو بـاوەڕەدام تەنانـەت زمـانی ئیسـپانی لـە فەرەنسـی چـاکترە، ئەگەرچـی رسـتەی ئیسـپانی درێـژتر و کـاراترە. هەرچـەندە مـن نووسـەرێکی ئەرجـەنتینیم دەبینیـت ناچارم بـەوەی بـە ئیسـپانی تـەعبیر بکـەم، بۆیە ناتەواوییەکانی ئەم زمانە دەزانم. لە بیرمـە گۆتـە لە بارەی زمانی ئەڵمانیـەوە جارێك نووسیویەتی بە زمانێـك دەنووسـێت خـراپترین زمـانی دنیایـە —واتـا زمانی ئەڵمانی— وا دەزانم زۆربەی نووسـەران هـەمان ئـەو ڕایـەی گۆتـەیان هەیـە لەسـەر ئـەو زمانانـەی کـە ناچارن پێی بنوسن. وەلێ لە بارەی زمانی ئیتالیەوە گـەلێك جـار "کۆمیـدیای ئیلاهـی"م خوێندۆتـەوە، بـە دوانزە چاپی جیاواز، هـەروەها ئاریوست و تاسـە و کروتشــە و جنتیلــەم خوێندۆتــەوە. بــەڵام مــن لــە قسەکردن بە زمانی ئیتالی یان بینینی شانۆنامە یان فیلیمێك بە ئیتالی دەستم کورتە. بۆ یەکەمین جار لـە جنیفیش والـت ویتمـانم لـە ڕێگـای قەسیدەیەکە وە ناســی کـــە یوهـــانس شـــەلاف لـــە ئەڵمانیـــەوە وەریگێڕابـوو (ڕۆژێـك لـە ئەلـەبامادا کـە گەشـتی بــەیانیانم دەکــرد) مــن بەلامــەوە بێهــودەیی بــوو شــاعیرێکی ئەمــەریکی بــە ئــەڵمانی بخوێنمــەوە، ڕامسپارد دانەیەك لە دیوانەکەی (***Leans of Gras***)م لە لەندەنەوە بۆ بنێرن. تا ئێستایش بە چاکی لـە بیرمـە بـەرگێکی سـەوزی تێگیرا بـوو. بـۆ ماوەیـەك بـڕوام وا بوو کە والت ویتمان نەك تـەنیا شـاعیرێکی گەورەیـە، بەڵکو تاقانە شاعیرە. جەختم لەسـەر ئـەوە دەکـرد کـە هەموو شاعیرانی دنیا تا ساڵی 1855 بێجگـە لـە ڕێ خۆشکردن بۆ هاتنی ویتمان هیچیان نەکردوە. ئەو کەســـــەیش کـــــە ڕێچـــــکەی ئـــــەو هەڵنـــــەگرێت نەخوێندەوارە. من هـەمان حەماسـەتم بـۆ کارلایلیش هــەبوو، بــەڵام ئێســتا خوێندنــەوەیم لا خــۆش نیــە، هەروەها شیعری سویبرینش. ئەمە ئەو قۆناغانەن کە پیایاندا تێپەڕیوم، پاشانیش زۆر جار هەمان هەستم بەســـەر کردۆتـــەوە کـــە مـــن لـــە ژێـــر کاریگــەریی نووسەرێکی دیاریکراودا بوم.

تـا سـاڵی 1919 لـە سویسـرادا ماینـەوە، دوای ئـەوەی سـێ چـوار سـاڵ لـە جنیـف بـووین چـووینە لوجـانو، مـن بڕوانامـەی بەکالوریوسـم وەرگرتبـوو، ئەوەیش بەلادا کەوتبوو کە من بـەرەو دنیـای ئـەدەب دەچم. دەمویست باوکم نووسینەکانم ببینێت، بەڵام ئـەو زیـاد لـە جارێـك پێـی ڕاگەیانـدم کـە بـڕوای بـە ئامۆژگاری کردنم نیـە و دەبێـت خـۆم بـە تـەنیا ڕێگـا لەبـــەر بگـــرم بـــە هـــەموو ئەنجامێکـــەوە. چـــەند ســـونێتایەکم بـــە ئینگلیـــزی و فەرەنســـی دانـــابوو، ســــوناتا ئینگلیزیــــەکان لاســــایی کردنــــەوەی (دورسورس) بوو، بەڵام فەرەنسیەکە، بە پێـی گـرێ و گۆڵیەکەی لاسایی کردنەوەی شیعری ڕەمزی بوو. تا ئێسـتایش تاقـە بـەیتێکی هەوڵـە فەرەنسـیەکەم لـە یـادە: "ئـەی کارتۆنـە ڕەشـەکەی کـەمانی شکاو" کـە ناونیشانی قەسیدەکە بوو: قەسیدەیەك بە شەقڵێکی ڕووســـی بوترێـــت، لەبەرئـــەوەی کـــە دەمزانـــی مـــن فەرەنسـی وەك بێگانەیـەك دەنووسـم، وای بـۆ چـووم ڕەنگە شەقڵی ڕووسی چاکتر بێت لە ئەرجەنتینی، لە

هەوڵەکانی زمانی ئینگلیزیدا دەمویست پەنا بەرمە بەر هەندێك لەو مۆرکە ئەسلوبییەی کە لە سەدەی هەژدەوە ماوەتەوە. بۆ نموونە بنووسم (*ger*) لە باتی (*over*) یان لەبەر پێویستی کێش بنووسم (*doth sing*) لە باتی (*sings*) بەڵام زوو زانیم کە بە ناچاری هەر دەبێت بە ئیسپانی بنووسم.

بڕیاری گەڕانەوەمان بۆ وڵاتی خۆماندا، دوای ئەوەی ساڵێك لە ئیسپانیا ماینەوە، ئەرجەنتینیەکان تەنیا لەوساوە هەوڵی ناسینی ئیسپانیایاندا، چونکە پێش ئەو کاتە تەنانەت گەورە نووسەرانی وەك ڕیکاردو جویرالدس و لیوبولد و لوجونس، کە دەیانویست بۆ ماوەیەك لە ئەوروپادا بژین هەر بە دەستی ئانقەست بە ئیسپانیادا تێنەدەپەڕین. ئەمەیش هەر لە خۆوە دروست نەبوە، چونکە لە بوینس ئایرس، زۆر جار ئیسپانیەکان لە ڕووی پلە و پایەیانەوە کاری زۆر نزمیان دەکرد — وەك خزمەتچی و بۆی و کرێکاری– یان لە بازرگانە بچووکەکان بوون. هەروەها ئێمەی ئەرجەنتینیش ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆمان بە ئیسپانی نەزانیوە، لە ڕاستیدا ساڵی 1816 کە جاڕی سەربەخۆیی خۆماندا دەستبەرداری ئەوان بووین. کە بە منداڵی کتێبی (*The corquest of poru*)ی برسکوتم خوێندەوە سەرم سوڕما کە وێنای داگیرکەرانی لە شێوەیەکی ڕۆمانسیدا کردبوو، چونکە من ئەگەر چی بە ڕەچەڵەك دەچوومەوە سەر هەندێك لەو ناودارانەی کە ئەو باسی کردبوون، بەڵام وام دەبینی کە ئەوان لە ڕوویەکی ترەوە هیچ وپووچن. کەچی ئەمەریکاییە لاتینیەکان کە لە چاوی فەرەنسیەکانەوە لێیان دەڕوانین، بە کاریگەریان لە قەڵەم دەدان، تازە لە تۆمەتەکانی گارسیالۆرکا — قەرەج، شەڕەگا، ئەندازەی مورسکیە دەرچوون. لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئیسپانی زمانمانە و خوێنمان ئیسپانی و پورتوگالیە، بەڵام خێزانەکەم بۆ چرکەیەکیش بیری لەوە نەکردەوە کە ئەو گەشتەی ئیسپانیامان گەڕانەوە بێت بۆ وڵاتی دایك دوای ئەوەی سێ سەدەی بەسەردا تێپەڕیبوو.

رووومان لە (مایورکا) کرد چونکە بێ لەوەی زۆر هەرزان بوو شارێکی جوانیش بوو، بێجگە لە ئێمەیش گەشتیاری زۆر کەم لێ بوو. نزیکەی ساڵێکی تەواو لە بالمای بالدیموس دابووین کە تاقە گوندێکی ناوزورگەکان بوو، لەوێ بەردەوام بووم لەسەر وانە لاتینیەکانم، بەڵام ئەمجارەیان لەسەر دەستی ڕاهیبێکدا کە تێی گەیاندم لەبەرئەوەی دنیا ڕەنگاڵەییەکەی هەموو پێویستیەکانی دابین دەکات، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئارەزووی خوێندنەوەی ڕۆمانی نەکردوە، لەگەڵ ئەو ڕاهیبەیەدا زۆر زوو ڤیرجیلم دیراسە کرد کە تا ئێستایش پێی سەرسامم. لە بیرمە کە خەڵکی شارۆچکەکە چەندە بە مەلەوانیەکەم سەرسام بوون. لە ڕووبارە خوڕەکانی وەك ڕووباری ئوروگوای و رواندا تەواو پڕ کار بووم. لە کاتێکدا کە مایورکییەکان ڕۆژێك لە ڕۆژان بێجگە لە ئاوی پەنگ خواردووی بێ شەپۆل زیاتر مەلەیان لە ئاوی تردا نەکردبوو.

باوکم سەرقاڵی نووسینی ڕۆمانێك بوو کە دەیویست یادەوەری ڕۆژانی ڕابوردوی خۆی لە ماوەی شەڕی ناوخۆی حەفتاکانی ئەو سەدەیەدا و لە ئەنتری یوسی زایگایدا روویاندا بوو تیا کۆبکاتەوە "لە بیرمە من پێشنیازی هەندێك کینایەی ناقولاّم بۆ کرد کە ئیلهامی تەعبیریە ئەڵمانیەکان بوون و ئەویش بە ناچاری وەری گرتن" پاشان پێنج سەد دانەی لە ڕۆمانەکەی چاپ کرد و بردی بۆ بوینس ئایرس و بە دیاری پێشکەشی هاوڕێکانی کرد. وشەی (بارانا) کە شاری لەدایکبوون و ژیانی بوو لە دەقەکەدا زۆر دووبارە دەبووەوە، بەڵام

تایپکەرەکان هەر بە دەستی ئانقەست لە هەر شوێنێکدا ئەو وشەیەیان دیبوو کردبوویان بە (باناما) باوکیشم بۆ ئەوەی ماندوویان نەکات و لەبەرئەوەیش کە ڕەنگە هەڵەکە لە راستەکە خۆشتر بێت وەك خۆی هێشتیەوە. دوای ئەوە بە حەڤدە ساڵ، کەمێك پێش مردنی، ئاگاداری کردم کە دەیەویت ڕۆمانەکە بە زمانێکی سادەتر بنووسرێتەوە دوور لە شێوازی زۆر لە خۆ کردن و بە باق و بریق، وەك من بۆ خۆم لەو ماوەیەدا چیرۆکێکم لە بارەی غۆڵێکی گورگیەوە نووسی. دەقەکەم بۆ گۆڤارێکی میللی نارد بۆ مەدرید کە ناوی (*La Espua*) بوو، بەڵام بڵاوکەرەوەکان، هەر بە حوکمی شارەزای و لێزانینیان بڵاویان نەکردەوە.

زستانی ساڵی 1919–1920 مان لە ئیشبیلیە بەسەر برد، لەوێ بۆ یەکەمین جار، شیعرێکی خۆمم بە چاپکراوی بینی، ناونیشانی شیعرەکە "سروودی دەریا" بوو "لە گۆڤاری جریتیا، ژمارە 13ی کانوونی یەکەمی 1919دا" لەو شیعرەدا هەوڵی زۆرمدا بوو لاسایی شێوازی والت ویتمان بکەمەوە:

"دەریا! ئەی ئەفسانە! ئەی خۆر! ئەی بۆشاییەکی ئاسوودە! تۆ بزانە کە ئێمە دوو پیریین، سەدەهایە یەکمان ناسیوە، ئەی بریتوس، من بە گیان قەرزداری تۆم، هەردووك پێ لە کۆتاین، وێڵین، تینووی ئەستێرەکانی ئاسمانین، دەپارێینەوەو داڕماوین..."

ئێستا زۆرم بەلاوە گرانە وێنای دەریا بکەم، یان ئەوەی کە تینووی ئەستێرە بم.

گەلێك ساڵانی ویست پێش ئەوەی ڕستەکەی ئارنولد بینیسی ببینم کە باس لە "ڕەوانبێژی نەسەقی سێ" دەکات، زۆر زوویش لە ماناکەی گەیشتم، لەگەڵ ئەوەشدا، دوای چەند مانگێك لە بڵاوکردنەوەی لە ناو هەموو شیعرەکانمدا ئەو پەسەند کرا، وەك ئەوەی من شاعیری دەریا بم.

لە ئیشبیلیە، چووومە ناو کۆمەڵەیەکی ئەدەبییەوە کە سەر بە گۆڤاری "جریتیا" بوون، ناویان لە خۆیان نا بوو پەڕگیرەکان "المتطرفون" ئامانجی کۆمەڵەکە نوێ کردنەوەی ئەدەب بوو، کە لقێك بوو لە هونەر و ئەوان هیچیان لێ نەدەزانی، ڕۆژێك یەکێکیان پێی وتم ئەو تەنیا "کتێبی پیرۆز"ی خوێندۆتەوە لەگەڵ سیرڤانتس و روبن داریو یەك دوو بەرهەمی مامۆستا روفاییل کانینوس ئسینس، لەبەر ئەوەی من ئەرجەنتینیم هەستم بە شەرمێك کرد کاتێك زانیم یەکێك لەوانە فەرەنسی نازانێت، هەموویشیان لە ئەدەبی ئینگلیزی بێ ئاگان، تەنانەت کە یەکێك لەوانەیان پێ ناساندم کە خاوەن پلە و پایەن و پێیان دەوت: "ئینسانی" زانیم لاتینی زانینەکەی هەرگیز ناگات بەوەی کە من فێری بووم. لە بارەی گۆڤاری (جریتیا)یشەوە بڵاوکەرەوەکەی ناوی ئیسحاق دلبانەدو بیلار بوو، یارمەتیدەرەکانی هەڵنابوو شیعرەکانی بە ئیمزای خۆیەوە بۆ بڵاو بکەنەوە، لەبیرمە ڕۆژێك یەکێکیان پێی وتم: "من زۆر سەرقاڵم، ئیسحاق خەریکی شیعردانانە"

پاشان چووین بۆ مەدرید و لەوێ نیشتەجێ بووین، ئەوەی لەوێ رویدا و من مەبەستم بێت بیڵێم دۆستایەتیم بوو لەگەڵ روفاییل کانسینوس ئسینسدا، تا ئەمڕۆیش خۆم بە قوتابی ئەو ئەزانم، لە ئیشبیلیەوە هاتبوو، دوای ئەوەی وانەی کیریکی خوێندبوو بەو نیازەی ببێتە ڕاهیب، بەڵام لە ئارشیفەکانی دادگای پشکنینە ئاینیەکاندا ناوی کانسینوسی دۆزیوەو بڕیاریدا کە جوولەکەیە، ئەمە هانیدا فێری زمانی عیبری بێت، تەنانەت لە دواییدا بە ناچاری خۆی خەتەنە کرد، ئەو هاوڕێیانەی لە

ناوەنــدی ئــەدەبیی ئەندەلووســدا دیبــوومن پێیــان ناسـاندم، بـە شـەرمەوە تـاریفم لـە شـیعرێکی کـرد، ئەویش هەر دەربارەی دەریا بوو.

کانســـینوس پیـــاوێکی بـــاڵا بـــەرز بـــوو، وەك ئەندەلوسیەك گاڵتـەی بـە هـەموو قشـتالیەك دەکـرد. ئـەوەی کەسـایەتی کانسیوسـی لـە خـەڵکی دی جیـا دەکـردەوە ئـەوە بـوو کـە ئـەو بـۆ ئـەدەب دەژیـا، بـێ ئـەوەی هـیچ حسـابێك بـۆ سـامان و ناوبـانگ بکـات. شاعیرێکی چاك بوو، کۆمەڵێك مەزامیری نووسیبوو. ئیرۆسیەتێکی ئاشکرایان پێوە دیار بوو — ناوی لـێ نـابوون (مۆمدانـە حـەوت چـڵەکە) و سـاڵی 1915 بڵاویکردنـەوە، هـەروەها ڕۆمـان و کورتـە چـیرۆك و وتـاری رەخنــەیی دەنووســی، ئــەو کاتــەی ناســیم سەرۆکی ئەڵقەیەکی ئەدەبی بوو.

هـــەموو ڕۆژانێکـــی شـــەممە دەچـــووم بـــۆ (*café colonial*) لە نیوە شـەودا پێك دەگەیشـتین و تـا بەرەبـەیان چـەند و چـوونمان دەکـرد، هەنـدێك جـار ژمارەمــان دەگەیشــتە ســی تــا چــل کــەس. ئــەم کۆمەڵەیـە هەرشـتێك پەیوەنـدی بـە داب و نـەریتی میللـی ئەسـپانیەوە هەبوایـە وەك شـەرگا خۆشـیان لێ نەدەهات.

ئەندامـەکانی ئـەم کۆمەڵەیـە عاشـقی مۆسـیقای جاز بوون کە لە ئەمریکاوە هـاتبوو، پێیـان خۆشـبوو ئـەوروپایی بـن نـەك تـەنیا ئیسـپانی. کانسـینوس پێشـنیازی بابـەتێکی بـۆ لەسـەر دووان دەکـرد — خـوازە— شـیعری ئـازاد، شـێوازە کلاسـیکیەکانی شیعر، شیعری پەخشـان، ئاوەڵنـاو، کـردار. ئەگـەر چـی کانسـینووس سـیمایەکی هێـور و لەسـەرخۆی هــەبوو بــەڵام بــە دکتاتۆرێــك دەچــوو کــە ڕێگــای هـــیچ ئامـــاژە و هێمایـــەکی بـــە نووســـەرە ئامادەبوەکان نەدەدا، هـەوڵی دەدا گفتوگۆکـە هـەر لـە شکۆمەندیدا ڕابگرێت.

کانسـینوس بـەردەوام سـەری لـە خوێندنـەوەدا بـوو، کتێبـی (دان پێـدانانی تلیاکیـەك)ی تۆمـاس دوکوینیســـــی و (یادەوەریـــــەکانی) مـــــارکوس ئۆدیلیوســی لــە یۆنانیــەوە وەرگێرابــوو، هــەروەها ڕۆمانی هنری باربوس و (زیندەوەرە خەیاڵییەکان)ی شــوب. پاشــان دەســتی کــرد بــە وەرگێڕانــی بەرهەمەکانی گۆتە و دیستۆفسکی، هەر ئەویش بۆ یەکەمین جار (هەزار و یەك شـەوە)ی وەرگێڕایـە سـەر زمـانی ئیسـپانی، ئـەم وەرگێڕانـە کـەمتر خـۆی بـە دەقەکەوە بەسـتۆتەوە وەك لـە وەرگێڕانەکەی برسـون یــان لاینــی، وەلــێ بــەڕای مــن، وەرگێڕانەکــەی کانسینوس بۆ خوێنەر بە تام و چێژترە.

ڕۆژێك دیدەنیم کرد و بردمی بۆ کتێبخانەکەی، یان باشتری بڵێم هەموو ماڵەکەی کتێبخانـە بـوو، بـە ناو کتێبە کەڵەکە کراوەکانـدا دەڕۆیشـتم وەك بـە نـاو دارستانێکدا تێپەڕم. ئەوەنـدە هـەژار و دەسـت کـورت بوو نەیـدەتوانی ڕەفە بـۆ کتێبـەکانی دروسـت بکـات، بۆیـە هـەمووی لەسـەر یـەك کەڵەکـە کردبـوو، لەسـەر زەویەوە تا بنمیچ، دەبوو ئەوەی بچوایەتە ماڵەکەی بـە ناچـاری بـە نـاو سـتوونی کتێبـدا تێپـەڕێت. مـن کانسینوسم وا دەبینی کە بە تـەنیا نوێنـەری هـەموو ڕابووردووی منە، ئەوە ئەو ئەوروپایەیە کـە لـە دوای خۆمەوە جێی دەهێڵم، جۆرێك بوو لە ڕەمز بۆ هـەموو کلتورەکان. کلتووری لێدان وەك لە خۆرهـەڵات هەیـە، بــەڵام جۆرێــك لــە ئاوارتــەیی زەینیــی ڕێگــای لــێ دەگرێت کە نەتوانێت لەگەڵ دیـارترین هاوسـەردەمی خۆیدا پێك بێت. ئەمـە وای لـێ کردبـوو کـە هەنـدێك کتێب پۆلێن بکـات لـە پیاهەڵدانی نووسـەرانێکدا کـە لــە پلــەی دوو ســێدان. لــەو کاتــەدا —ئۆرتیفـا ئــەی جاســیت— لــە لووتکــەی شــکۆمەندیا بــوو، بــەڵام کانسینوس وەك فەیلەسوفێکی خراپ و نووسەرێکی خراپ لێی دەڕوانی. ئەوەی کە زۆرم حەز پـێ دەکـرد

لـەودا وتوویـژە بەتامـە ئەدەبیـەکان بـوو. هـەروەها هەڵینام هەندێك كتێب بخوێنمەوە ئەگەر ئەو نەبوایە هـەرگیز نەمدەخوێندنـەوە. کـە خۆیشـم بـۆ نووسـین تـەرخان کـرد هەسـتم کـرد بەشـێوەیەکی پێکـەنین هێنـەر لاسـایی ئـەو دەکەمـەوە. شـێوازی نووسـینی کانســینوس لەســەر ڕســتەی درێــژی بــە شــەپۆل دەوەستێت کـە زیـاتر سیمایەکی عیبری تیایـە زیـاد لەوەی کە ئیسپانی بێت..

## سەرچاوە

گۆڤاری (نزوی) ژمارە 30 ساڵی 2002.

# شەمەندەفەری (باتا کۆنیا)

**پۆل سیرۆ**

له عەرەبییەوە: عەتا محەمەد

"بورخیس" ماندووبوونی نەدەزانی, زۆر جار داوای لێ دەکردم سەردانی بکەم. تا کاتێکی درەنگ بێدار دەبوو. پەرۆشی قسەکردن بوو, پەرۆشی ئەوەبوو بۆی بخوێنمەوە. ئەو هاورێیەکی زۆر باش بوو. پله به پله کردمی به بوزویل[1]. هەموو بەیانیەك کە هەڵدەستام, دادەنیشتم و ئەو قسە و باسانەم دەنوسیەوە کە شەوی رابردوو لە نێوانماندا رووی دابوو" پاشان به شارەکەدا پیاسەم دەکرد, کاتێکیش شەو دادەهات رووم دەکردە وێستگەی میترۆ, پۆرخیس پێی ووتم ئەو زۆر دەگمەن دەچێتە دەرەوە. "ناچم بۆ باڵیۆزخانەکان, ناچم بۆ ئاهەنگەکان, من رقم لە وەستان و خواردنەوەیە". من لەوە ئاگادار کرابوومەوە کە لەوانەیە دڵرەق و بێ میزاج بێت, بەڵام هەر کە بینیم وا هەستم کرد ئەم نزیك بێت لە میزاجی فریشتەکانەوە. ئەو شتێکی لە دەجالی تیا بوو, رێگای خۆشی هەبوو لە وتاربێژیدا, من دەمزانی ئەو شتێك دووبارە دەکاتەوە کە پێشتر سەدان جار وتبونی. ئەو لە پێشەوە دەمی تەتەڵەی دەکرد بەڵام بە دەستەکانی خۆی هێور دەکردەوە. ئەو هەندێك جار شکۆدار دەبوو بەڵام هەندێك جاری تر بە پێچەوانەی ئەوەوە بوو, تەنها قوتابیەك بوو. سیمای مەفتون بوو بە وریایی و پەنجەکانی تێك ئاڵاو بوون.. کە بێدەنگ دەبوو سیمای ئەرستۆکراتیانە دەبوو. کاتێکیش لە پێکەنیندا ددانە زەردەکانی بەدەردەخست (ئەو بە دەنگی بەرز بە گاڵتەکانی خۆی پێدەکەنێت) سیمای پەشۆکاو دەبوو, بە ئەکتەرێکی فەرەنسی دەچوو کە دەزانێ لە دزینی کامێرا بۆ خۆی سەرکەوتوو بووە. (بورخیس دەڵێت: "دزینی کامێرا" تۆ ناتوانیت ئەمە بە ئیسپانی بڵێیت, هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەدەبی ئیسپانی جارسکەرە). سیمای ئەو سیمای حەکیمێکە, لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە وەك لیبۆك بێت, کاتێك دەموچاوی بەشێوازێکی تایبەت دەجوڵێنێت بەڵام هەرگیز وەك گێل بەدەرناکەوێت.

ئـەو زۆر خانـەدان بـوو, توندوتیـژی لـە قسـەکانیدا نەبوو هەرچۆن لە سیماشیدا بوونی نەبوو. ئەو وتی:

+مـن لـە تۆڵـە تێناگـەم و هـەرگیز هەستیشـم پێنەکردووە. لەبارەشیەوە نانوسم.

**-ئەی لەبارەی (ئیمازونز[2])ەوە؟**

+بـەڵێ ئەمـە تـەنیا چیرۆکە.. بـەڵام چیرۆکەکەم پێدرا, لەو باوەڕەشدا نیم زۆر باش بێت..

**-کەواتە تۆ لـە تۆڵەسـەندنەوەیەکیش رازی نیـت کـە دژت کراوە؟**

+تۆڵـە لـەوە ناگۆڕێـت کـە دژت کـراوە هەرچۆن لێبوردنیش وایە. تۆڵە و لێبوردن هیچ پەیوەست نین بە بابەتەکەوە.

**-چی دەکەیت؟**

+بۆرخیس وتـی: لـە بیری دەکـەم, ئەمـە هـەموو ئـەو شـتەیە کـە دەتوانیـت بیکـەیت. کاتێـك شـتێکی خـراپ لـە دژت دەکرێـت وای دابنـێ کـە ئـەوە لـە زەمـــانێکی دووردا رویـــداوەو دژ بـــە کەســـێکی تر کراوە.

**-ئەمە سودی تیایە؟**

+تا ڕادەیەك.. (ددانە زەردەکانی بەدەرخست).

ئـەو قسـەی لـە بـێ هـودەیی تۆڵـە دەکرد. هاتـە پێشەوەو دەستەکانی بە بابەتێکی نوێوە دەلـەرزین, بـەڵام پەیوەنـدیان لەگـەڵ ئـەوەی پێشـوودا هـەبوو, جـەنگی جیهـانی یەکـەم. "بـۆرخیس" وتـی: کاتێـك راسـتەوخۆ دوای جـەنگ لـە ئـەڵمانیا بـووم هـەرگیز گـوێم لـە وشـەیەك نـەبوو دژی هتلـەر. لـە بـەرلین ئەڵمانیـەکان پرسـیاریان لـێ دەکـردم (بـورخس بـە ئـەڵمانی کەوتـە قسـەکردن) باشـە.. ڕات چـیە بـە وێرانـەکانمان؟ ئەڵمانـەکان دەیانـەوێت بـەزەییمان پێیانـدا بێتـەوە.. ئایـا ئەمـە ترسـناك نییـە. وایـان لێکـردم وێرانـەکانیان ببیـنم و دەیانویسـت بـەزەیم پێیاندا بێتەوە, بەڵام بۆچی لەسەرمە ئەو ئارەزوەیـان تێرکـەم, وتم (ئـەم رستەیەشـی بـە ئـەڵمانی وت) مـن لەندەنم بینی..

لەبارەی ئەوروپاوە درێژەمان بە قسـەکانمان دا, پاشان قسە چووە سـەر هەرێمـەکانی ئەسکەندەنافیا و خـەڵاتی نـۆبڵ. ئـەو شـتەم نـەوت کـە زانـراوە ئـەویش ئـەوە بـوو کـە "بـورخیس" بـۆ خـۆی ئامـاژەی پێـدا کـە ئـەو پـاڵێوراوی پێشـبینیکراوی ئـەو خەڵاتەیـە. بـە هێمنـی وتـی: ئەگـەر خەڵاتەکـەم پێببەخشـرایە ئـەوا رام دەکـرد و بـە هـەردوو دەسـت دەمگـرت. بـەڵام کـام لـە نوسـەرە ئەمریکیەکان وەریگرتووە؟

**وتم: "شتاینبك"..**

+نا باوەڕ بەمە ناکـەم. باوەڕ ناکـەم "شـتاینبك" وەریگرتبێــت کەچــی تــاغور وەریــدەگرێت کــە نوسـەرێکی زۆر خراپـە و شـیعری هـیچ و پوچـی دەنوسی - مانگ, باخچەکان.

**-لەوانەیە لـە کـاتی وەرگێڕانـدا (لـە بەنغالیـەوە بـۆ ئینگلیزی) هەندێ شتی لەدەست دابێت؟**

"بورخیس" پێکـەنی و دەموچاوی گەشایەوە, لەوانەیـە لەبـەر کوێریەتیەکـەی بووبێـت. ئەمـەش هەنـدێ جـار بـەم شـێوەیە روی دەدا: دەتـوانم چـاودێری بکـەم کاتێـك ئـەو یـادەوەری دەپشـکنێ. وتـی: لەوانەیـە پاسـاوی ئـەوە تـەنها بەمـە بکرێـت: تاغور هات بۆ بوینس ئایرس.

**-ئەمە دوای وەرگرتنی خەڵاتی نوبڵ رویدا؟**

+دەبـێ وابـوو بێـت. چـونکە مـن نـاتوانم وێنـای ئـەوە بکـەم کـە فیتوریـا ئوکـامبو بانگهێشـتی ئـەوی کردبێـت ئەگـەر ئـەو خەڵاتـەی وەرنەگرتبێت.

بە پچرپچڕی پێکەنی و وتی:

+من و تاغور بەشەڕ هاتین.

**-لەبەر چ هۆیەك لەگەڵی بەشەڕ هاتن؟**

"بۆرخیس" دەنگێکی گاڵتەجاڕی هەیە, تا جەخت لە را رەفزکەرەکەی بکات, پارێزگاری لەو دەنگە دەکات.

سەری بۆ دواوە وەرچەرخاند و بەو دەنگەوە وتی: ئەم ئێوارەیە من و "بورخیس" یەکترمان بینی تا چیرۆکی "کبلنغ" بخوێنینەوە "سپێدەیەك کە خراپ مامەڵەی لەگەڵ کرا" بەلام هەرگیز ئەوەمان نەکرد. کات درەنگ بوو, وادەی نانی ئێوارە نزیك بووەوە. لە بارەی چیرۆکی "کبلنغ"ەوە دواین و پاشان بەگشتی لە بارەی "چیرۆکی ترس"ەوە دواین.

چیرۆکی (هم[3]) زۆر جوانە. من چیرۆکی ترسم خۆش دەوێت کە "لفکرافت" دەینوسێن. گرێی چیرۆکەکانی زۆر جوانە بەلام شێوازی زۆر خراپە. جارێك چیرۆکێکم پێشکەش کرد, بەلام لە ئاستی چیرۆکی (هم)دا نەبوو. ئەمە مایەی خەمە.

+پێم وایە "کبلنغ" لەبارەی منداڵە مردوەکانیەوە دەینوسی. کچەکەی لە نیوٚرك مرد, کوڕەکەشی لە شەڕدا کوژراو هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ ولاتە یەکگرتووەکان.

"بورخیس" وتی: باشە, ئەو شەڕی لە دژی برای ژنەکەی کرد, بەلام لە دەرەوەی دادگا پێی پێکەنین[4].

"لە دەرەوەی دادگا پێی پێکەنین" تۆ ناتوانیت ئەمە بە ئیسپانی بڵێیت.

"بورخیس" دڵخۆش بوو پاشان دڵتەنگ بەدەرکەوت "ناتوانیت هیچ شتێك بە ئیسپانی بڵێیت".

بۆ نان خواردن چوینە دەرەوە. پرسیاری ئەوەی لێ کردم کە لە ئەمریکای باشوور چیم کردووە؟ منیش پێم وت هەندێك وانەم لەبارەی ئەدەبی ئەمریکیەوە وتۆتەوە و پێم وت لەبارەی "مارك توین, فوکنر و ئادگار ئالان پوو هەمەنگوایەوە" دواوم.

**لێی پرسیم: ئەی دەربارەی هەمەنگوای؟**

وتم: ئەو هەڵەی گەورەی هەبوو کە پێی وابوو جدیە. ئەو سەرسام بوو بەوانەی خۆیان بە پڵنگ دەزانن.

"بۆرخیس" وتی: ناتوانم زیاتر تەئیدت بکەم.

**ژەمە نانێکی خۆش بوو. دوای ئەوە بە پێ رووەو ماڵەکەی گەڕاینەوە. وتی: بەڵێ پێم وایە, من و تۆ, لەسەر زۆر شت کۆکین.. وا نیە.. ها..؟**

وتم: لەوانەیە, بەلام دەبێت لەم ڕۆژانەدا بچم بۆ باتاکونیا.

"بورخیس" وتی: ئێمە نالێین باتاکونیا, بەڵکو دەڵێین جیوبت یاخود سانتاکروز, هەرگیز نالێین باتاکونیا.

**-"هـ. هدسون" وتی باتاکونیا.**

+ئەو چی دەزانی "ڕۆژانی تەمبەڵی لە باتاکونیا" کتێبێکی خراپ نەبوو, بەلام ئاگات لەوە بێت کە باتاکونیا هیچ کەسێکی تێدا نییە, بەڵکو تەنها ئەوەیە کە باڵندەو گوڵی لێیە, ئەوە حاڵی باتاکونیایە. مرۆڤ لەوێدا نییە, گرفت لەگەڵ "هدسون" ئەوەیە کە ئەو بە درێژایی کات درۆ دەکات و ئەو کتێبەش پڕە لە درۆ بەلام باوەڕ بە درۆکانی دەکات و زۆر زوو بێتوانا دەبێت لە جیاوازی کردن لە نێوان ئەوەی راستەقینەیە و ئەوەی ساختەیە.

"بورخیس" بۆ چەند ساتێك بیری کردەوە پاشان وتی: هیچ شتێك لە باتاکونیادا نییە. ئەوێ بیابان نییە, بەلام شتێك لە باتاکونیا نییە.

بیرم کردەوە, ئەگەر وابێت – ئەگەر شتێك لەوێ نەبێت – ئەوا باشترین شوێنە بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبە[5].

## پەراوێز

1-جیمس بوزویل (1740-1795) نوسەر و پارێزەری ئسکتلەندیە لە کاتێکدا هاوڕێیەتی لەگەڵ دکتور "جونسن" دەست پێ دەکات کە دەیویست لە لەندەن بژێوی خۆی بەدەست بخات. بە مردنی جونسن هاوڕێیەتیەکە تەواو بوو. کاری بەناوبانگی هەیە لەوانە "ژیانی دکتور جونسن" کە یاداشتنامەیەکی کلاسیکیانەیە لەبارەی هاوڕێکەیەوە.

2-ئیمازونز: چیرۆکێکی بورخیسە.

3-من چیرۆکی (هەم)م نەبینیوە لەبەرئەوە بۆم ساغ نەبۆتەوە کە ئەو ناونیشانە مەبەستی لە (ئەوان) یاخود (غەم)ە چونکە ئەو وشەیە سەرو بۆری بۆ نەکراوە.

4-لە دەرەوەی دادگا پێی پێکەنین: دەستەواژەیەکی ئینگلیزیە مەبەست لێی ئەوەیە کە: لە ڕێگای گاڵتەجاڕیەوە ئەو کەسە شایەنی ڕێز نییە.

5-کتێبی "شەمەندەفەری باتاکونیا"ی بول شیرویە کە ئەم بەشەی لێ وەرگێردراوە بۆ عەرەبی.

## سەرچاوە

لە ئەنتەرنێتەوە.

# چاوپێکەوتنێکی بڵاونەکراوە لەگەڵ "خورخی لویس بورخس" دا

سازدانی: ڕامۆن شاو
وەرگێڕانی: عەتا محەمەد

## بیرۆکەی سنوور و نەتەوە زۆر بێمانایە

"بۆرخیس" بە یەکێك لە نوسەرە گەورەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێت. ئەو لە ساڵی 1986دا لە تەمەنی 87 ساڵیدا مرد. ئەم پیاوە بەوە جیا دەکرایەوە کە خاوەنی رۆشنبیریەکی فراوان بوو. "بۆرخیس" تووشی کوێری هات و هەرگیز رۆمانی نەنوسی، بەڵکو تەنها حیکایەت و کورتە چیرۆکی نوسی کە لەو بوارەدا بە مامۆستای یەکەم دادەنرێت. ئەو هەندێك لە ئەفسانە ئەدەبییە هەرە مەزنەکانی ئەم سەردەمەی خوڵقاند، وەك (کتێبخانەی بابل). "بۆرخیس" لە ڕێگای گەمەی سەیری ئاوێنەکان و تەلیسمە سەرسوڕهێنەرەکان و سەفەرە ئەندێشەییەکانیەوە لە ناو پێچ پەناکانی یادەوەری و ئەو زەمەنەی مایەی دڵەڕاوکێیە، نوسینە گێڕانەوە سیحر ئامێزەکانی پەلی بۆ زۆر لایەنی تێڕامانە مرۆڤایەتیەکان دەهاویشت. ئەم ڕێبوارە گەورەیە لەگەڵ ئەوەی بینینی لەدەست دابوو، زۆر جار سەردانی باریسی دەکرد و هەردەم حەزی دەکرد لەگەڵ "ماریا کوداما"ی هاوڕێی بمێنێتەوە لە ئوتێلێکی بەناوبانگ کە لە شەقامی هونەرەجوانەکان بوو، جێگای (*Dandysme*)ەکان بوو. هەروەها "بیارلوتی و ئوسکار وایلد" بۆ ماوەی زۆر تێیدا ماونەتەوەو "ئوسکار وایلد"یش بە هەژاری و نەداری تێیدا مردووە. لە ژورێکی ئەو ئوتێلە ئەفسانەییەدا ئەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ (ئەبوالهولی) پیر، ئەرجەنتینی جیهانی، "خورخی لویس بورخیس" لە نیسانی 1978 رویدا.

–ڕامون شاو–

**• بەڕێز "بۆرخیس" بەیانیت باش، سوپاست دەکەم بۆ پێشوازی کردنت لێم.**

-تەمەنم 84 ساڵەو هەموو هاوڕێکانم مردن، کاتێک بیریان لێ دەکەمەوە وەك تارمایی ئەندێشەیان دەکەم، وا نییە؟ لە ساڵی 1955 بینایم لەدەستداو لەو کاتەوە ڕۆژنامە ناخوێنمەوە، هەرچۆن زۆر بوارم نادات قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەم. هەر بۆیە کاتێك چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکرێت، لە سوپاس کردنی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکات دەستپێشخەری دەکەم، بەڵام هەردەم لەوەش ئاگاداری دەکەمەوە کە من هەندێك جار (تا ڕادەی بێزار بوون) زیادەڕۆیی لە بیروڕا ڕەتنەکراوەکانمدا دەکەم. لەوانەیە ئەمە پەرچەکردار بێت دەرهەق بە شەرمنیم، چونکە من هەرگیز دڵنیا نیم لەوەی کە دەیڵێم. کاتێك باس لە مەسەلەیەك دەکەم، ئەو کاتە من لەبەردەم پێشنیارێکی تەنها گریمان کراودام، هەر بۆیە پێش ئەوەی دەست پێبکەین پێشنیاری ئەوە دەکەم هەندێك دەستەواژەی گومانکردن دابنێین، وەك (لەوانەیە) و (پێدەچێت) و (مەحاڵ نییە کە..)، تاوەکو خوێنەر لەو شوێنەدا داییبنێت کە بە گونجاوی دەزانێت.

**• ئایا دەتوانیت سیمایەك بکەیتە بەر ئەو دەنگەی کە دەیبیستی؟**

نەخێر پێویستم بەوە نییە، بیریارێکی ئینگلیزی دەڵێت: (لە توانادایە بە هۆی قسەوە گوزارش لە هەموو بیرو سۆزێك بکرێت). هیواخواز بووم توانای بینینم بمایە، بەڵام دەنگ بە پلەیەك گوزارشت لە کەسایەتی دەکات کە نەبینینی تۆ کێشەیەکی گەورە نییە. لێکچونێك لە نێو کەسەکاندا هەیە و ڕاڤەکردنی گرانە، من پەیوەندیم بە شتەکانەوە زۆر سەختترە، چونکە شتەکان قسەناکەن، بەڵکو دەست لێدانیان بەسە بۆم. دەبوو من ببمە پەیکەرتاش. ڕاستە باشترە بتبینم، بەڵام پێویستم بە بەهانەیە تا بەرگەی کوێرێتی بگرم. وا نییە؟ ئەگینا بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە. کە ئەم کارەش قێزەونە. "بێرناردشۆ" دەیوت: (بەزەیی دەبێتە هۆی داڕزان بۆ بەزەییکەر و بەزەیی پێداهاتووەوە).

**• ئەم ڕەقییە دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی خۆت یاخود بۆ میراتی باپیرانت؟ ئەڵبەتە تۆ لە خێزانێکی عەسکەریت کە زۆر قارەمانن.**

-ژەنەراڵ "بۆرخیس"ی باپیرەم لە ساڵی 1874دا لە شەڕێك دژ بە هندیە سوورەکان کوژرا، پێشەنگی هێزەکەی باپیرم تیاچوو، ئیتر خۆی بە تەنیا بەسەر ئەسپە سپییەکەیەوە مایەوە. ئەو بە خێرایی بەرەو دوژمن ڕۆشت کە ئەوانیش گوللە ئاژنیان کرد، ئەمە گریمانەی ئەوە ناکات کە هەموو عەسکەرییەك ئازابێت. ئەو کەسەی تەمەنی لە هاتووچۆی نێوان سەربازگاکاندا دەباتەسەر لە نەخشەکان دەکۆڵێتەوە تا پلەی بەرزتری سەربازی بەدەست بهێنێت، پێویست بەوە ناکات ئازا بێت، بەو پێیەش ئەو لێوەشاوە نییە بۆ مومارەسەکردنی فەرمانڕەوایی. بیرۆکەی فەرمان و ملکەچ کردن لە عەقڵێکی منداڵانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەمەش تەفسیری فەرمانڕەوا سەرکوتکەرەکان دەکات بەوەی خەڵکانێکی پێنەگەشتوون.

**• سەیرە، هەرچەندە تۆ لەوەی شەڕ و توندوتیژیەوە دێیت، کەچی خۆت کەسێکی بێوەیت و ڕقت لە توندوتیژیە و ئامرازی شەڕت دەخەیتە قسەکانتەوە. ئایا لەبەر ئەم هۆیەیە کە چەپێندراوەکانی خۆت ئاخنیتە ناو ئەو نوسینانەتەوە کە لێوان لێون لە تاوان و زۆرانبازی و خیانەت؟**

-هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە. لەوانەیە بەجۆرێك لە جۆرەکان من یادەوەری پێشینەکانم بم،

لەوانەیە ئەوان هەوڵ بدەن لە ڕێگای منەوە ژیانی شەڕ و توندوتیژی بسڕنەوە کە تێیدا ژیان.

• **کەی بڕیارت دا ببیتە نوسەر؟**

—هەر لە سەرەتاوە. لە تەمەنی سێ ساڵ یاخود چوار ساڵیدا بوو کە دەستم بە نوسین کرد، باوکم (دەروونناســـی – ئەنارشیســـت) بـــەهای شـــیعری نیشاندام بەوەی وشەکان تەنها ئامرازی پەیوەندی کردن نین، بەڵکو دەنگی مۆسیقین و ئەفسوناوی ئالۆزیشن. کاتێك گەشتمە تەمەنی 24 ساڵی باوکم ئامۆژگاری کردم کە لە خوێندنەوە بەردەوام بم و دەست بە نوسین نەکەم، تا ئەو کاتەی بەڕاستی هەســت بــە پێویســتی نوســین دەکــەم، پەلــە لــە بڵاوکردنەوە نەکەم. باوکم بۆ خۆی ڕۆمانێکی نوسی کە هەرگیز بڵاوی نەکردەوە. من لە قوڵاییدا بووم بە نوسەر، چونکە ئەوە ئارەزوی باوکم بوو کە تیایدا ســــەرکەوتوو نــــەبوو. منـــــیش دوای هـــــەموو ئامۆژگاریەکانی کەوتم. ئەمە بە حەنینەوە دەڵێم، چـــونکە کـــوێرێتی لـــە ســـاڵی (1955)ەوە لـــە خوێندنـــەوەی کـــردووم. لـــەو ســـاڵەدا دوو ڕوداوی سەرەکی لە ژیانمدا ڕویدا: لە بوینس ئایرس بە بەڕێوەبـەری کتێبخانـەی نیشـتمانی دامـەزرام، لـە هەمان کاتدا تەقریبەن کوێربووم. (200) هـــەزار کتێـــب لەبەردەســـتمدا بـــوو بێئەوەی بتوانم بیانخوێنمەوە.

• **تۆ ئارەزوی باوکت جێبەجێ کرد بەڵام بە تەواوەتی نا. باوکــت هەڵــە بــوو، تــۆ بــۆ خــۆت لــە پێشــەکی Fictions (چیرۆکی ئەندێشەیی)دا دان بەمەدا دەنێیت و دەنوسیت: (بێهودەیــە 500 لاپــەڕە تــەرخان بکــەین بــۆ شــتێك کــە دەتوانرێت بۆ 20 یاخود 30 لاپەڕە کورت بکرێتەوە).**

—لـــە ڕاســـتیدا ڕۆمـــانم زۆر نەخوێندۆتـــەوە.. "کـــونراو، دیکنـــز، دیستویفســـکی، ملڤیـــل و دونکیشـوت"م وەك هــەموو خــەڵکی خوێندۆتــەوە، لۆژیکیش نییە هەوڵی نوسینی ڕۆمان بدەم ئەگەر خوێنەری نەبم.

• **ژیــان پــڕە لــە جیــاوازی (مفارقــات). تــۆ خــەڵاتی "سـێرڤانتس"ت پێبەخشـراوە، کەچـی زمانەکـەیت خـۆش ناوێت کە ئیسپانیە؟**

—هـــەرگیز وام نـــەوتووە! لەوانەیـــە وتبێـــتم فەرەنسی زمانێکی زۆر جوانە و دەستەواژەی وای تێدایە کە لە زمانی تردا نییە وەك *y* لە ( - *Jysuis* *jyreste*) یاخود *Nous en reparlerons*، بەڵام لە ئیسپانیدا فرمانی وەك (*Ser* و *estar*)مان هەیە کە لە هیچ زمانێکی تردا نییە، ئەو فرمانەش جیاوازی لە نێـوان میتـافیزیکی و ئـەو شـتەدا دەکـات کـە موحتەمەلە. ئێمەش جوڵەیەکمان هەیە لە (نعت) و بیناکردنی ئەوپەڕی نەرمی لە ڕستەدا کە بەخیلی پێدەبرێت. ئیسپانیەکانیش لە زمانیاندا ئەوەیان هەیە کە فەخری پێوە بکەن، بەڵام نازانن قسەی پێبکەن. وا گۆی دەکەن هەر دەڵێی زمانێکی بیانیە.

• **کەواتە ئەو بیرۆکە بەربڵاوە لە کوێوە هاتووە کە تـۆ بـە ئیسپانی ئاسودەنیت؟**

—پێم خۆشە لەسەر ئەوە لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکرێت کە دەینوسم نەوەك لەسەر ئەوەی کە لەوانەیە وتبێتم یاخود خرابێتە پاڵم، چونکە من لەبەر شەرمنیم ناتوانم دژایەتی ئەو کەسە بکەم کە قسەم لەگەڵ دەکات. لە بەرامبەر ئەمەدا کاتێك دەنوسین دەتوانین نوسینەکانمان بێکۆتا ڕاست بکەینەوە. لە ڕاستیدا ئەم ڕایە لەو گفتوگۆیەوە دەرهێنراوە کە لەو تەنها بینینەدا بوو کە لەگەڵ "نێرۆدا"دا بوو. بە درێـژایی دوو کاتـژمێر بە گەمەی سەرسام کردنی یەکتر رامانبوارد. پێی وتم: (ناتوانرێ بە ئیسپانی بنوسـرێت)، منـیش وەڵامـم دایـەوە: (تـۆ ڕاسـت دەکەیت هەر لەبەرئەوەیە هەرگیز کەس بەم زمانە نەینوسیوە). ئەو کاتە وا پێشنیاری کرد: (ئەی

بۆچی بـه ئینگلیـزی یـاخود فەرەنسـی نەنوسـین؟)؛ باشە، بەڵام ئایا ئێمە دڵنیاین کە شایەنی ئەوەین بەو زمانانـە بنوسـین). ئـەو کاتـە بڕیارمـان دا کـە دەبێـت ملکەچی بەردەوام بوون بین بە ئیسپانی نوسین.

• **سـەیرە ئـەم گفتوگۆیـە لـە نێـوان دووکەسـدا بـووە کە هاوڕانەبوون..**

–"نێرۆدا" شیعرێکی دژ بە دەسەڵاتدارە خوێن ڕێژەکانی ئەمریکای لاتین نوسی و چەند بڕگەیەکی بۆ وڵاتـە یـەکگرتووەکان تـەرخان کـرد، بـەڵام نەهاتـە سـەر باسـکردنی "بـیرون". پـێم وایـە ئـەو پـڕە لـە گاڵتـەی پیـاوێکی بەجـەرگ، بـەڵام لـە راسـتیدا ئـەو سەرقاڵ بوو بە دەعوایەکی قەزاییەوە لە ئەرجەنتین و نەیدەویسـت حکومـەتی وڵاتەکـەم تـووڕە بکـات. "نیرودا" ئەرجەنتینیـەك هاوسـەری بـوو، هەربۆیـە بـە تـەواوی دەیزانـی چـی لـەوێ روو دەدات.. وا نییـە؟ بـەڵام ئـەو نەیدەویسـت شـیعرەکە رووبـەڕووی نارەحەتی و خراپەی بکاتەوە. کاتێك چووم بۆ شیلی ئـەو خـۆی لـێ دەشـاردمەوە تـا یـەکتر نـەبینین، ئەوەش کارێکی باش بوو کـردی. خەڵکی دەیویست بمـانبینن چـۆن نـاکۆك دەبـین. ئـەو شـاعیرێکی کۆمۆنیسـتی شـیلی بـوو، منـیش شـاعیرێکی موحافیزەکـاری ئەرجـەنتینی بـووم. مـن دژی کۆمۆنیستەکان بووم.

• **ڕەخنەت لە کۆمۆنیستەکان چییە؟**

–ناتوانم بە تیۆرەیەك رازی بم کە بانگەشە بۆ هـەژمونی دەوڵـەت دەکـات بەسـەر تاکـدا، بـەڵام ئـەو شـتانەی پـێم وتیـت پەیوەنـدیان بـە بـەهای شـیعری "نـیرۆدا"وە نییـە. کاتێـك خـەڵاتی نـۆبڵ لـە سـاڵی 1967 بەخشـرایە "ئەسـتوریاس"، مـن خێـرا وتم "نێرۆدا" شایەنیەتی. بەهەرحاڵ ئەویش دواجار لە ساڵی 1971 ئەو خەڵاتەی بەدەست هێنا. پێم وانیە لێپرسینەوەی نوسەر لەسەر بیروباوەڕە سیاسیەکانی کـارێکی عادلانـە بێـت. ئەگـەر راسـت بێـت "رودیـاد کیبلینـغ" بـەرگری لـە ئیمپراتۆریـەتی بـەریتانی کردبێت، ئـەوا دەبێـت دان بـەوەدا بنـێین کـە ئـەویش نوسەرێکی گەورە بووە.

• **تۆش بۆ ماوەیەك تاوانی عەسکەریەکانت لە وڵاتەکەتدا پشتگوێ خست؟**

–تەفسـیری ئەمـە سـانا نییـە، ئەگەرچـی مـن پێشـتر رونم کردۆتـەوە. کاتێـك کەسـێکی وەك مـن هەشتا ساڵی تێدەپـەڕێنێت، ئـەوا ئـەو تاڕادەیـەك بە تەنیا دەژی. وەك دەشزانیت من ڕۆژنامە ناخوێنمەوە و لەگـەڵ کەسـانێکی کەمیشـدا تێکـەڵاویم هەیـە. مـن لـەبارەی کەسـانێکەوە بیسـتبووم کـە (ون بـوون)، هاوڕێکانیشم بـە نیـەتێکی پاکەوە (وەك بۆی دەچم) جـەختیان لـەوە دەکـرد کـە مەبەسـت ئەوەیـە ئەوانـە تـەنها گەشـتیارێکن و جێگـای نیشـتەجێیان گۆڕیـوە، بەڵام کەس تووشی (دیارنەمان) نەبووە. منیش بڕوام پێکـردن تـا وەفـدێك لـە دایکـانی (گۆڕەپـانی مـایو) سەردانیان کردم، لە نێویاندا کچی مامی یەکێك لە خاوەنـانی لابرنـزا هـەبوو کـە دیـارترین ڕۆژنامـەی ئەرجەنتینـە. زوو دەرکـم بـەوە کـرد کـە ئـەو ژنـە تەمسیل ناکات و پێی وتم کچەکەی لە شەش ساڵ لەوەوبەرەوە دیارنەماوە. ئەو ژنە دەیویست راستی بزانێـت، ئەگـەر کچـەکەی مـردبێتیش. رووم کـردە وەزیرەکـان، بەڕێوەبـەری پـۆلیس، فاتیکـان، هـەموو جارێکیش یەك وەڵامم دەست دەکەوت: (دوای شەش مـانگ دەگەڕێتـەوە لات)، بـەڵام هـەرگیز نەگەڕانـەوەو نـەمان بینینـەوە. عەسـکەریە ئەرجەنتینیـەکان شێت بوون.

• **وەك دەستەواژەی (دیارنەمان)!**

–لە راستیدا زۆر لەوە ناشرینتر، چونکە ئەوانە دەستبەسـەرکران و ئەشکەنجەدران و کـوژران، ئـەوە فیلمێکە کۆتاییەکەی زۆر خراپە.

• **پێش ئەوەی بینایت لەدەست بدەیت تۆ رەخنەگرێکی سینەمایی بوویت، ئایا غەم بۆ ئەو کاتە دەخۆیت؟**

—زۆر نا، چونکە ئێستا سینەماش بێدەنگ نییە.

• **ئەو کاتە باشتر بوو؟**

—بێگومان! پاشان سینەمای رەنگاو رەنگ هات ئەوەش کارەساتێکی تر بوو.

• **چ فیلمێکت دێتەوە یاد؟**

—فیلمێک لە دەرهێنانی "جوزیف فۆن سترنبرگ" بوو کە دەربارەی چەتەکانی شیکاگۆ بوو[2]، ئەوە فیلمێکی داستان ئامێز بوو. دوای چەند رۆژێکی کەم "کارلۆس غاردل" ئاهەنگێکی گۆرانی لە سالۆنی هەمان سینەما پێشکەش کردو من نەچووم بۆ سەیری، چونکە ترسام ئەو سەرنجەم لەکیس بچێت کە ئەو فیلمە لام بەجێیهێشت. بەو شێوەیە گوێگرتن لە "کارلۆس غاردلم" لەکیس چوو.

• **ئایا لە دیدی ئێوەدا "کارلوس غاردل" رۆحی ئەرجەنتینی بەرجەستە دەکات؟**

—زۆرجار رۆحی ئەرجەنتینی تووشی گەندەڵی بووە، بەتایبەت لەسەر دەستی دیکتاتۆریەتە تۆقێنەرەکەی جەنەراڵ "بیرون"دا. هیچ رۆژێک خولیام "بیرون"ی نەبووە. ولات زۆر گۆڕاوە، ئێستا ئێمە لە ماوەی خۆ پاکردنەوەدا دەژین و بە لەیادکردنی ئەو سالانە هەڵدەستین کە دنیا بە سەخیفی دادەنێت و بەلای ئێمەوە زۆر ترسناک و دۆزەخی بوو[3].

• **بەهەرحاڵ "غاردیل" هێشتا یەکێکە لە رەمزەکانی ئەرجەنتین. ئایا لەو باوەڕەدا نیت کە گۆرانیەکانی باش بوو بێت؟**

—لە منداڵیمدا ژنان نا بەڵکو پیاوەکان لە نێوان خۆیاندا سەمای تانگۆیان دەکرد، چونکە وشەکانی نەشیاو بوون. ئەوان بە مەبەست بە دەنگی نزم گۆرانیان دەوت کە لێی تێنەدەگەشتی، بەتایبەت ئەگەر تاوانی خوێناوی بگێڕایەتەوە، ئەوان بە حەیایەکی تایبەت بە ئەرجەنتینیەکانەوە جیاواز بوون. تا بەدەرکەوتنی "کارلوس غاردل"ی فەرەنسی. دۆزینەوە گەورەکەشی لە پاڵ دەنگە گرکەیدا ئەوە بوو کە شێوەیەکی تراژیدی دا بە تانگۆ، لە یادمە من لەگەڵ دایکم لە ولاتە یەکگرتووەکان بووین و گوێمان لە گۆرانی تانگۆ دەگرت، ئێمە ئەو تانگۆیە سەرسامی نەکردین کەچی پاش کەمێک فرمێسکمان دەڕشت.

• **تۆ ئەگەر کەر بوبتایە نە چێژت لە تانگۆ دەبینی نە لە میلونگاش؟**

—من حەزم دەکرد ببمە مۆسیقار، بەلام جگە لە ئەدیب هیچی تر نیم، لەوانەیە سەرنەکەوتنیشم بگەڕێتەوە بۆ کەڕیی مۆسیقیم. من هیچ لە مۆسیقا تێناگەم جگە لە گیتار کە خۆشم دەوێت. بەشێوەیەکی گشتی شوانەکان گیتار بە باشی ناژەنن، بەلام دەتوانن چەندین سەعات لە کردنی بەرنەسەر کە ئەمەش جۆرێک لە مۆسیقای سەرەتاییانە دەبەخشێت.

• **لە بەرامبەر ئەمەدا تۆ سەرقاڵی زانستی رەچەڵەک ناسیت وا نییە؟**

—ئەو زانستە بەلای منەوە جۆرێکە لە ئەدەب. لای ئینگلیزەکان قسەیەکی جوان هەیە کە دەڵێت: (کوڕی زانا ئەوەیە کە دەزانێت کێ باوکیەتی)، ئەوەش کە زانیاری زیاترە ئەوەیە بنچینەی پێشینەکانی دەزانێت.. وا نییە؟

• **لەبارەی باوکتەوە قسەت بۆ کردم، ئەی لەبارەی دایکتەوە؟**

—دایکم ئینگلیز بوو منیش بە ئینگلیزی لەگەڵی دەدوام. منداڵ بووم کە بردمیان بۆ سویسرا و من بە فەرەنسی لەگەڵ مامۆستا دەدوام و

لاتینـیش لەسـەر دەسـتی مامۆسـتایەك فێربـووم. لەگەڵ باوکم بە ئیسپانی دەدوام و بەویش نوسیم. ئاوا تا ماوەیەك لەو باوەڕەدا بووم کە هەرکەسێك زمانی خۆی هەیە. سەیرە سەدەها ملیۆن زمان هەیە، بەڵام لەوانەیە ئەوە راست بێت هەربۆیە لەگەڵ یەکتر لێك حاڵی نابین.

• **ئایا تۆ وەك باوکت دەتنوسی یاخود ئەو وەك تۆ دەینوسی؟**

—شێوازی نوسینم وەك ئەو (باروکی) بوو. لە سەرەتادا لە خاکێتیەوە بێت یان بۆ خۆ پێگەیاندن بێت لاسایی مامۆستاکان دەکەینەوە. پێم وایە نوسەر دوای تێپەڕینی سالانێك شێوازی خۆی دەدۆزێتەوە. لە منداڵیمدا لاسایی باوکمم دەکردەوە و بە دوای وشەی کۆندا دەگەڕام، وشەی چاوەڕوان نەکراو، بەڵام ئێستا خۆم لە خوازە و وشەی دەگمەن و ئەو وشانەش بەدوور دەگرم کە پێویستیان بە فەرهەنگە. هەوڵ ئەدەم بگەمە کرۆکی هاوبەشی زمان، کە سنوری زەمان و جوگرافیا دەبەزێنێت.

• **ئایا لەو باوەڕەدایت گەشتبیتە ئەوەی ببیتە "بۆرخیس"، دوای ئەوەی (بەرهەمت) هەیە؟**

—ئەوەی دەیڵێیت زۆر کاریگەرە، بەڵام تکات لێدەکەم وشەی (بەرهەم) بخەیتە نێوان دوو کەوانەوە. من بەرهەمم نییە، بەڵکو هەندێ نوسینی پەرش و بڵاوم هەیە. نازانم بۆچی ناوبانگم پێکا. لە سەرەتادا باوەڕم وا بوو کە هەرگیز هیچ بڵاو ناکەمەوە، پاشان من خورافەیەکی ئەرجەنتینیم، بەڵام ئێستا لەسەرمە کە رازی بم بەوەی من جادوبازنیم: مەدالیای شەرەفم لە فەرەنسا و بڕوانامەی دکتورای فەخریم لە زۆر زانکۆ پێبەخشرا، بەڵام ئەوەی "بۆرخیس" بە باشتری دەزانی ئەوە بوو کە بە هۆی ئەو نوسینانەوە ستایش بکرێت کە نەینوسیون وەك لەوانەی نوسیونی یاخود ئەوانەی سریونیەتیەوەو هێشتا لە نێوان دێڕەکاندا هەن. دەتوانین لە ڕێی "سێرڤانتس" و ئەدەبی فەرەنسی و ئینگلیزییەوە بەم کارە هەستین، چونکە ئیسپانی زۆر قورسە. هێشتا رستەیەکم لەیادە کە "بوالو" وتی: (بەزەحمەت مۆلێرم فێری هونەری داڕشتنی دێڕە شیعری سانا کرد). لە دیدی مندا ئەو نوسەرانە کەمن کە گەشتنە کەماڵ، جگە لە "کیبلینغ" لە چیرۆکە کورتەکانیدا.. وشەیەکی زیادی تێدا نییە. هەوڵ ئەدەم بەوپەڕی نەوازشەوە لێوەی فێربم. سانایی و ئاڵۆزی پێکەوە. راستە هەندێك بابەت رۆمان دەخوازێت وەك داگیرکردنی روسیا لە لایەن "ناپلیون"ەوە، بەڵام من بیر لە نوسینی ڕۆمان ناکەمەوە.

• **بەتایبەت کە تۆ دەست بە خوێندنەوەی "تۆلستۆی" ناکەیت؟**

—من دەستم بە خوێندنەوەی (شەڕ و ئاشتی) کرد، بەڵام کاتێك کەسایەتیەکانی دەستیان بە ون بوون کرد (لەبەر زۆری و چڕی)، وەستام. "جۆرج مور" دەڵێ: (تۆلستوی بە ڕادەیەك وەسفێکی ورد بۆ دەستەی سوێندخۆران پێشکەش دەکات کە بە گەشتن بە ئەندامی چوارەمیان سیفاتەکانی ئەوەی یەکەمی بیرنامێنێت). لە پێش نیو سەدەوە نابینم و کەسێك بۆم دەخوێنێتەوە و من خوێندنەوەی دووبارە بوەوەم حەز لێیە. لە کاتی نوسیندا بەوەندە رازی دەبم کە دەینوسم. لە هەشتاو چوارساڵیدا هێشتا زۆر پڕۆژەم هەیە.

• **دوایەمین جار لەگەڵ "ئیغناسیو رامونە" هاتم بۆ سەردانت، ئەو کاتە تۆ سەرقاڵ بوویت بە زانستی ئیشتقاقەوە.**

—تا ئێستاش. ئەسڵی وشەکان زیاد لە ئەسڵی ئەوەکان دەڕوات. تۆ تێبینی وشەی (*Bleich*)ی ساکسونی بکە کە مانای (بێدەنگ) دەدات، چۆن بە دوو ئاڕاستەی جیاوازدا گەشەی کردووە، لە لایەك

بەرەو سپی *Blanco* لە ئیسپانیدا هەروەها بەرەو رەش *Black* لە ئینگلیزیدا. ئایا دەزانیت وشەی (جان) لە کوێوە دێت؟ لە ئینگلیزی تێکەڵ و دوو رەگ (فلاسی) لە ئورلیانی نویێ کە فەرمانی *To Jazz* بە واتای مومارەسەکردنی خۆشەویستی دێت, بەڵام بە خێرایی و تەشەنوجەوە هەروەك دەنگی وشەکە دەیبەخشێت. ئێستا زانیومە وشەی *Cosmetique* (کەرەستەی ئارایشت و خۆ جوانکردن) لە یۆنانیەوە هاتووە: ڕێکخستنی جیهان. جوانکردنی دەموچاو وەك ئەوەی گەردون بێت. سەیرە, وا نییە؟

• **ئێستا پرۆفیسۆر "باسکوالی" پێی ڕاگەیاندم کە ناوی (کاناری) بۆ دورگەکان مانای ئەوە نییە کە ئەو دورگانە پڕ بوون لە چۆلەکە و باڵندە, بەڵکو لە سەدەی یەکەمدا یەکێك لە پاشاکانی مۆریتانیا ناوی ناوە, چونکە ئەو زۆر سەگی گەورە (Canes) ی تێدا بینی.**

–ئای کەمایەتی بێ ئومێدیە! بەڵام تۆ شتێکی تازەت فێرکردم. (ڕامونە)ی هاوڕێت ئەو ڕۆژەی هاتن ئەسڵی وشەی (غابون)ی بۆ شەرح کردم کە لە (*gabao*)ی پورتوگالییەوە هاتووە مانای (پاڵتۆ) دەگەیەنێت.

• **یادەوەریت زۆر بەهێزە "بۆرخیس", هەروەك یادەوەری "فۆنس" کە یەکێکە لە پاڵەوانی کورتە چیرۆکەکانت؟**

–نا, نا "فونس" لە ژێر باری یادەوەریدا مرد. ئەو چیرۆکە خوازەیەکە سەبارەت بە بێ خەوی.

• **لەبەرئەوە ئەو هەموو نیگەرانیەمان تێدا دەوروژێنیت؟**

–بەڵێ نەخەوتن ترسناکە. بە درێژایی ساڵێك لە بوینس ئایرس بە دەستیەوە ناڵاندم. ئەو کاتە لە هاویندا بوین و شەو درێژ و مێشولەش دەیگیزاند. وەك ئەوە بوو دوژمنێکی ئیبلیسی سزام بدات.

• **خودانا.. وا دیارە تۆ.. نازانم ئەگەر نەڵێم هەردوکیان (خودا و ئیبلیس). ئایا ئەمەش لە کاریگەری باوکتەوەیە یاخود تۆ هیچ پەروەردەیەکی ئاینیت وەرگرتووە؟**

–پەروەردەی ئاینی وەك هەمووان, بەڵام بۆ ماوەی درێژ نا. کاتێك یۆنانیە کۆنەکانم دەخوێندەوە زۆر بە خێرایی ئەوەم کەشف کرد کە زۆر خواوەند هەیە. بۆچی تەنها یەك خودا؟ چۆن دڵنیابین کە ئەو باشترە؟ ئەگەر ئەو بەرپرس بێت لە ژیانم ئەوا لێینابوورم. ئەمە چ ئاینێکە خاوەنی بانق و پۆلیس و دەزگای نهێنیە؟ "یوحنا پۆلسی دووهەم" پیاوێکی سیاسیە وەك ئەوانی تر. ئەو لەسەر ماچکردنی زەوی ڕاهاتبوو. باشە کارەکە ئەوەندە ترسناك نییە, بەڵام "مەسیح" وتی: (مەملەکەتی من لەم جیهانەدا نییە): پاپاش لەگەڵ بەرپرسە گەورەکانی تری دنیادا ئاڵوگۆڕ دەکات. باوکم دەیوت هەموو شتێك لەم جیهانەدا دەشێ, تەنانەت (الثالوث الأقدس)یش. چۆن باوەڕ بەم مەسخە خواوەندیە دەکرێ. تیۆلۆژیا بە بڕشتترە لە ئەدەبی غەرائبی. سێ بوونەوەر هەیە لە نێوانیاندا کۆترێك لەیەك خوادا. ئەمەش کابوسەکانی "هـ.ج ویلز و کافکا" تێدەپەڕێنێت. لەبەرامبەر ئەمەدا من سەرسامم بە تەورات. چ بیرۆکەیەکە لەیەك کتێبدا چوار دەق کۆبکەیتەوە کە هی چوار نوسەری جیاوازن و بشیانگێڕیتەوە بۆ (روح القدس)! لە دواجاردا لەوانەبوو ببمە لایەنگری میتۆدیەت وەك هەندێك لە پێشینەکانم نەوەك کاسولیکی. کاسۆلیکیەکانی وڵاتەکەم سەر بە جۆرێکن کە بێزارم دەکەن, ئەوانە لەو باوەڕەدان کە ئەرجەنتین وڵاتێکی سەرەکیە لە کاتێکدا هەموو دەزانین کە ئەو وڵاتێکی تازەیە و ناتوانین لە مێژوەکەی تێبگەین بێ گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا.

• **ئایا هێشتا بایەخ بە جیاوازییە لاهوتیەکان دەدەیت؟ هەر لە سەردەمی باوکانی کەنیسەوە شتێکی تازە ڕوینەداوە.**

–ئەمڕۆ لاهوت پشتگوێ خراوە بەڵام لەبن نایەت, وەك ڕۆمانە ڕەشەکان, هەر پێشێلکردنی

موحـەڕەماتێك ئـەو گەڕانەیـە بـە دوای خـوادا وەك ئـەوەی ئـەو تـەنها بکوژێـت. دەڵـێن خـوا پڕهێـز و چاکەیە، بەڵام بیستنی دەنگی مێشولەیەك بەسە بۆ ئەوەی گومان بمانگرێت لەو. خەڵکی تەنها باس لە سیاسـەت و وەرزش دەکـەن، ئەمانـەش دوو بابـەتی پڕوپوچـن و هەسـتی نەتـەوەیی دەخـولقێنن. پـێش ماوەیـەك کـە دوور نییـە حکومـەتی ئەرجـەنتینی خـولێکی بـۆ تـۆپی پـێ کـردەوە. ئەمـە مـاقوڵ نییـە حکومـەت کـاری وا بکـات وا نییـە؟ سـەرۆك دەوڵـەت هەسـتایە سـەرپێ و هـاواری کـرد (گـۆۆۆڵ)، چـۆن دەتـوانرێ تـا ئـەم رادەیـە لـە سـەخافەت بگـەین؟ رۆژنامـەکان، خـەڵکی هـەموویان هـاوار دەکـەن (هۆڵەنـدامان بەزانـد)، ئایـا کـە گـەنجی ئەرجـەنتینی بـە جـل و بـەرگی وەرزشـیەوە بەسـەر گـەنجی هۆڵەندیـدا سـەرکەوت، بەسـە بـۆ ئـەوەی هۆڵەندا ببەزێنین.

- **لەم ماوەیەی دواییدا زۆر سەفەرت کردووە؟**

—لە لاویێتیمدا حەزم لە سەفەر نەبوو. ئێستا کە پیر و کوێر بووم لە سەفەرکردن ناوەستم. دەمەوێت رۆژهەڵات بناسم کە لە میسر و ئەندەلوسدا کورتی دەکەمەوە پاشان هندستان کە بە هۆی "کیبلینغ"ەوە دەیناسـم. بانگهێشـتێکم لـە یابانـەوە پێگەیشـتووە منیش حەز دەکەم بچم بە دەنگ ئەو بانگهێشتەوە. تۆ دەڵێی من ناتوانم حوکم بەسەر ئەو وڵاتەدا بدەم لەبەرئەوەی کوێرم، بەڵام من لەو باوەڕەدا نیم و تەنها ئەوەندە بەسە بڵـێم (ئا ئـەوەتا مـن لـە یابـانم)، ئـەوە بەلای منەوە زۆرە. من ناتوانم وڵاتەکان ببینم، بەڵام لـە ڕێگـای ئاماژەگەلێکـەوە دەرکیـان پـێ دەکـەم کـە خۆشـم نـایزانم. ئەمـە شـتێکی سـەیر نییـە، چـونکە رۆژانـە روودەدات. ئێسـتا هەسـت بـە هاوڕێیـەتیت دەکـەم ئـەویش لـە ڕێگـای ئـەوەوە نـا کـە پـێم دەڵـێی، ئەوە شتێکە ناتوانرێت گوزارشتی لێ بکرێت. بۆچی ئینسـان دەکەوێتـە داوی خۆشەویسـتیەوە؟ ئـەم پرۆسەیە بەهۆی ئەوەی دەیبینـێ یاخود دەیبیستێ روونادات، بەڵکو بەهۆی ئاماژەی نادیارەوە کە لـەوی تـرەوە دێـت. باشـە کاتێـك لەگـەڵ کەسـێکی تـر دەدوێـین، ئەگـەر ئـەو خۆشـی بـوێین یـاخود گوێمـان پێنـەدات ئێمـە هەسـتی پـێ دەکـەین، هەسـت بـەوە دەکـەین ئـەویش لـە پـەراوێزی ئـەو وشـانەی کـە هەردەم سەخیفن.

- **تۆ دەتوانیت هەست بـە دیمەنـەکان بکـەیت، ئایـا لـە ڕێگای شەپۆلی دەنگەوە دەرکی پێ دەکەیت؟**

—ئـەوەی ئەندێشـەی دەکـەم لەوانەیـە هەڵـە لـە زەمەنـدا لـە خـۆی بگرێـت، چـونکە مـن دەگەڕێمـەوە سەر سەرنجێك لەو ماوەیەوە بۆم ماوەتەوە کە کوێر نـەبووم. ئێسـتا ئەگـەر چاوێکم نوقانـد ئـەوا دەتـوانم هەندێك لە رەنگەکان بناسمەوە بە تایبەتی سەوز و شین، زەردیش هەرگیز وازی لێنەهێناوم. لە بەرامبەر ئەمەدا رەشم دۆڕاند. من تاریکیم لەدەستدا، سەیرە وا نییـە؟ کوێرێـك بێبـەری بێـت لـە تـاریکی، تەنانـەت کاتێـك دەنـوم خـۆم لـە سـەدیمێکی مەیلـەو سـەوز یاخود شیندا دەبینم.

- **تۆ بەم سەفەرانەت جەخت لە بیرۆکـەی کۆسمۆپـۆلیتی دەکەیتەوە کە پێی ناسراویت؟**

—بیرۆکەی سنور و نەتەوە بەلامەوە هیچن. تاکە شـتێك کـە دەتوانێـت رزگارمـان بکـات ئەوەیـە ببینـە هـاوڵاتی لـە جیهانـدا. شـتێکی خۆشـی خۆمـت پـێ بڵێم، لە منداڵیمدا هاوەڵی باوکمم کرد بۆ مۆنتفیدیو، وا بزانم لـە نـۆ ساڵیدا بووم. باوکم پێی وتم: (جوان سـەیری ئـەو ئـاڵا و پۆلیسـی گـومرگ و سـەرباز و کاهینانە بکە، چونکە هـەموو ئەوانە لە ناو دەچن و تـۆش دەتوانیـت بـە منداڵـەکانت بڵێی کـە بینیـوتن). ئەوەی روودەدات پێچەوانەی ئەمەیە. ئـەمڕۆ زیـاد لـە هەر کاتێکی تر ئاڵا و سنور هەیە.

• بەڵام کاهینەکان بە پێچەوانەوەن؟

—چـــوزانین! ئێســـتا خۆیـــان حەشـــارداوە. لەبەرئـەوەی باوکم روەکـی بـوو رێنیشاندەرم بـوو بۆ داســتانێك تــا بتــوانم دواتــر بڵــێم: (تەنانــەت مــن دوکانێکم بینی گۆشتی دەفرۆشت). لەوانەیە باوکم لەسەر حەق بوو بێت, پێدەچێت ئەمە پێشبینیەکی پێشـــوەخت بـــوو بێـــت کـــە چـــەند ســـەدەیەکی بووێت بێتەدی.

• درەنگ کەوتین لە بینینی بەدبهاتنیدا, کتێبە پیرۆزەکان ئامۆژگاریمان دەکەن لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا دەست لـە ژیان بکێشینەوە.

—من کەمێك زیادەڕەوی دەکەم وا نییە؟

• "بۆرخیس" مەبەستم ئەوە نەبوو..

—بە پەرۆشیەوە چاوەڕوانی مردن دەکـەم, بەڵام هەردەم مردن لە خێزانەکەماندا ترسناك بووە. نەنکم لـە تەمـەنی 99 سـاڵیدا و لـە حـاڵێکی بـێ ئومێدیـدا مرد. من لە مردن ناترسم, بەڵکو لە کەنفتی تۆقیوم. لەگەڵ مردنمدا رەچەڵەکێك لەناو دەچێت, ئەمەش بۆ یـــەکێکی عاشـــقی (رەچـــەڵەکەکان)ی وەك مـــن ئازاربەخشە.

• زۆر نیگـــەران مەبـــە, چـــونکە میراتگرێکـــی زۆر بەجێ ناهێڵیت.

—تۆ دڵنیام دەکەیت و منیش دەتوانم دواتر بە هێمنیەوە چاوەڕوانی مردن بکەم.

• مەسەلەیەك جێگای سەرنجە. تۆ نوسیوتە یاخود وتووتە: (ئەبەدیەت چاوی تێ دەبڕێت)؟

—ئەبەدیـــەتی تایبـــەتی (کەســـێتی) هـــەر وەك مردنی تایبەتی وایە و ناتوانرێت باوەڕی پێبکرێت. لەو باوەڕەدام من هەوڵم داوە لاسایی دێڕە شیعرێکی "ڤـرلین" بکەمـــەوە کـــە دەڵێـــت: (هـــەموو ئـــەوەی ماوەتەوە هیچ نییـە جگـە لـە ئـەدەب). ئاگاداربـە, من بەرپرس نیم لەوەی کە لەوانەیە وتبێتم یان کە ئێستا دەیڵـێم. شـتەکان بـە بـەردەوامی لـە گۆڕاندایـە و ئێمەش هـەروا. رستە بەناوبانگەکـەی "هیراکلیت"ت بـــۆ دووبـــارە ناکەمـــەوە کـــە لـــەبارەی رووبـــارە گۆڕاوەکەوەیـــە, بـــەڵکو دێـــرە شـــیعرێکی "بوالـــو" کە دەڵێت (ئەو ساتەی کـە لەگەڵتدا دەدوێم بـوو بـە زۆر دوور).

• بەڵام رێدەکەوێت کە گاڵتە بە مـردن بکـەیت, یـاخود گاڵتەت بـە تەمـەن درێـژی بێـت کـە خوویـەکی خراپـە و زەحمەتە رزگارمان بێت لێی).

—ئـەوە مـن نـیم کـە وا دەڵـێم, بـەڵکو حیکمـەتی میللیە کە دەڵێت: (هیچ شتێك وەك مردن نییـە وا لـە خەڵکی بکات لە بارێکی باشتردا بن. مردن خوویەکی هاوبەشە لە نێوان هەمووواندا).

• دەڵێی ئەوە قسەی "بۆرخیس"ە, ئایا ئەم "بۆرخیسە"ە لە مردن دەترسێت؟

—نـا, وەك بـاوکم لـەوە رادەمێـنم کـە بـە تـەواوی بمـرم (بـە رۆح و جەسـتەوە). زۆر لـەو باوەڕدارانـەی دەیانناسم تۆقیـون. هەنـدێك لـە رۆشـتن بـۆ بەهەشـت رادەمێنێت و هەندێکی تریش لـە دۆزەخ دەترسـێت. بەڵام بۆ کەسێکی وەك من کە باوەڕی بەم حیکایەتانە نییە, پێم وانییە من شایەنی نە پاداشت و نە سزاش بم. ئەوەی بۆ من دەمێنێتەوە تەنها چاوەڕوانییە.

• دەتوانم ناونیشانێکت بدەمێ (کۆمەڵەی لە پێناو مـافی مردن بە کەرامەت)دا کە من خۆم سەر بەوانم.

—خـۆم بکـوژم؟ هـەروەك "لۆغـۆنیس" وتـی: (هەرچـۆن گـەورەی ژیـانم بـووم, دەمـەوێت گـەورەی مردنیشـم بم), و خـۆم بکـوژم. ئـەم بیرۆکەیـە کاتێـك هـاتووە بـە مێشـکمدا کـە لـە حـاڵێکی زۆر ناخۆشـدا بووم. پاشـان کـە ژیـان لەدەسـت دەدەیـن نـازانم چـی روودەدات, دوای ئـــەوەی بینینمـــان لەدەســـتدا. وا نییە؟ پاشان بە خۆمم وت تـەنها بیرۆکـەی خۆکوشتن بەسـە. ئێسـتا پیر بـووم و دەڵـێم کـاتی بەسەرچووە.

دەشێ مردن لە هەر ساتێکدا بێت, بەڵام من هێشتا کابوس و پڕۆژەم هەیە کە سێ ساڵی تریان دەوێت.

## پەراوێزەکان

1-نوسەر و ڕۆژنامە نوسە.

2-ئەو فیلمی ***Under world*** . 1927.

3-لە نێوان 1976 و 1983 دا ئەرجەنتین لە ژێر سایەی سیستەمێکی دیکتاتوری دڵڕەقدا ژیاو نزیکەی 30 هەزار کەس دیارنەمان و لەسەر دەستی عەسکەریەکان کوژران.

## سەرچاوە

***www. Mondiploar.com***

# ئایینی بودا

خورخه لویس بورخس
لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح

باسی ئەمشەومان دەربارەی ئایینی بودایە، سەرەتای کورتە مێژووی ئایینی بودا دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی دوهەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر لە شاری (بنارس) کە شازادەیەکی (نیپالی) کە ناوی (سیزار تایا گوتاما) بوو، بوو بە بودا و چەرخی ئەم ئایینەی خستە گەڕ و چوار ڕاستیی شەریف و شەقامی هەشت لایەنەی ئایینی بودای ڕاگەیاند. بەڵام من ناچمە ناو مێژووی دوور و درێژی ئەم ئایینەوە، بەڵکو دەربارەی سەرچاوەکەی دەدوێم، دەربارەی توخمە پێکهێنەرەکانی ئایینی بودا کە هەر لە پێنج سەدە بەر لە زایینی مەسیح تا ئێستا پارێزراون. ئەم توخمە پێکهێنەرانە هەر لە سەردەمی هراکلیتوس[1]، فیساغورس و زینو[2] تا ئێستا هەر بە هەمان شێوەی سەرەتای خۆی ماونەتەوە، بەڵام خودی ئاینی بودا بە تۆگەڵێك لە ئەفسانە ناسی، ئەستێرەکان و بیروباوەڕی بێ سەروبەر و جادو و سیحر داپۆشراوە.

لەبەرئەوەی ئەم باسە ئاڵۆزە، من باسەکەم لە سنووری ڕووە هاوبەشەکانی گروپە جۆراوجۆرەکانی ئەم ئایینەدا دەست پێ دەکەم. ئێدی قسەکانم زیاتر سەبارەت بە (هینایانا) یان چەرخی بچووك دەبێ.

سەرەتا لە هۆکارەکانی درێژبوونی تەمەنی ئایینی بودا دەدوێین. دەشێت ئەم بابەتە بە پێشکەشکردنی هۆکارە مێژووییەکان شیبکرێتەوە، بەڵام ئەم جۆرە هۆکارانە، لە باشترین حاڵەتیشدا دەشێ وەك ڕێکەوت و گوماناوی بێنە بەرچاو. بەڕای من بەردەوام بوونی ئەم ئایینە دوو هۆکاری سەرەکی هەیە: یەکەم ئەو لێکبووردنە (تسامح)ە دەگمەنەیە کە پەیوەست بە سەردەمێکی تایبەتی نییە، ئایینی بودا هەمیشە لەسەرخۆ بووە. هەرگیز پەنای نەبردۆتە بەر زۆر و زۆرداریی. هەرگیز باوەڕی وانەبووە کە ئەم ئامڕازانە قایلکەرن. وەختێ ئەمپراتۆری هیند (ئاشوکا) بوو بە بودایی هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەدا کە ئایینە نوێیەکەی بەسەر کەسانی تردا بسەپێنێت. بوداییەکی باش دەتوانێ بە ئەوپەڕی ئازادیەوە ببێتە (لوتری یان موتدیست یان پرسبیتری یان کالوینسیت یان شینتوتیست یان تایوێست یان کاتولیك)" دەتوانێ ببێتە موسوڵمان

یان جوولەکە. بە پێچەوانەوە مەسیحییەك یان جوولەکەیەك یان موسوڵمانێك ڕێگای نادرێتێ ببێتە بودایی. ئەو لێبوردنەی لە ئایینی بودادا هەیە نیشانەی لاوازی نییە بەڵکو بەشێکە لە سروشتە تایبەتییەکەی. جگە لەوەش ئایینی بودا شتێکە کە دەتوانرێت ناوی یوگای لێبنرێت. یوگا چییە؟ یوگا هەمان وشەی (یوغ)ە کە سەرچاوەکەی واژەیەکی لاتینییە بە ناوی (*iugum*) – و بە واتای ئەو سیستەمە ڕێك و پێکەیە کە مرۆ دەیسەپێنێتە سەرخۆی. ئەگەر ئێمە ئەو قسانەی بودا دەرك بکەین کە بیست و پێنج سەدە لەمەوبەر لە یەکەم وتاری خۆیدا لە پارکی گاکێوی بنارسدا وتی، دەتوانین لە ئایینی بودا تێبگەین و دەرکی پێبکەین. جگە لەوەی مرۆ خۆی دەستپێشکەری تێگەیشتنی ناکات، بەڵام جەستە و ڕۆحی هەستی پێ دەکات – هەڵبەتە ئایینی بودا شوێنێکی بۆ ڕاستیی جەستە یان ڕۆح نییە.

بۆ تەمەن درێژی ئایینی بودا هۆکارێکی تریش هەیە. ئایینی بودا ئیمانێکی زۆر دەخوازێت. ئەمە زۆر ئاساییە، لەبەرئەوەی ئایین بە تەواوی لەسەر بنەمای ئیمانە. هەر بەو شێوەیەی کە نیشتمان پەرستیش لەسەر بنەمای ئیمانە. من زۆر جار لە خۆم پرسیووە کە ئارژانتینی بوون چ واتایەکی هەیە؟ ئارژانتینی بوون ئەوەیە هەست بکەین کە ئارژانتینین. مانای بودایی بوون چییە. بودایی بوون هەست کردنی چوار ڕاستیی تەواو و شەقامی هەشتانەکەیەتی – نەك دەرك پێکردنی کە دەشێ لە ماوەی چەند خولەکدا ئەنجام بدرێت.

وا ئێستا بە چیرۆکی بودا دەچینەوە. دەتوانین ئەگەر بمانەوێت باوەڕ بەم چیرۆکە نەکەین. من هاوڕێیەکی ژاپۆنیم هەیە کە بودایییە، من باسی دوورو درێژ و دۆستانەم لەگەڵ کردووە. ڕۆژێکیان پێم وت باوەڕم بە ڕاستیی مێژووی بودا هەیە. من باوەڕم وا بوو و ئێستایش هەر باوەڕم وایە کە لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر شازادەیەکی نیپالی بە ناوی سیزارتا یان گوتاما بوونی هەبوو کە بووبە بودا، واتە ڕووناك، یان بێدار بووەوە – بە پێچەوانەی ئێمە کە لە خەوندا‌ین یان خەونی ئەو خەیاڵە گەورەیە دەبینین کە ژیانە. دێڕێکی شیعری (جویس)[3]م وە بیردێتەوە کە دەڵێت: "مێژوو مۆتەکەیەکە من هەوڵ ئەدەم لێی بێدار ببمەوە". سیزارتا لە تەمەنی سی ساڵیدا بێدار بووەوە و بوو بە بودا.

لەگەڵ هاوڕێکەمدا کە بودایی بوو قسەم دەکرد – من دڵنیانیم کە مەسیحی بم، بەڵام دڵنیام کە بودایی نیم – و پێم وت: "بۆچی نابێ باوەڕ بە چیرۆکی شازادە سیزارتا بکرێت؟" وەڵامی دایەوە: "لەبەرئەوەی ئەو بابەتە گرنگ نییە گرنگ پەیڕەویەکانییەتی" بە حاڵەتێکەوە کە من وا بیردەکەمەوە زیاتر لایەنی گاڵتەو گەپی هەبوو تا ڕاستگۆیی وتی کە باوەڕ هێنان بە بوونی مێژوویی بودا، یان هاوبەستەیی لەگەڵیدا وەکو ئەوەیە کە ئێمە یاساکانی بیرکاری لەگەڵ ژیاننامەی فیساغورس یان نیوتن تێکەڵ بکەین. یەکێك لە بابەتەکانی بیرکردنەوەی ڕاهیبەکان لە پەرستگاکانی ژاپۆن و چین گومانکردنە لە بوونی بودا. ئەمە یەکێکە لەو گومانانەی کە پێویستە مرۆ بەسەر خۆیدا بیسەپێنێ بۆ ئەوەی بگاتە حەقیقەت. ئایینەکانی تر باوەڕی بێ چەند و چوونکردنیان دەوێ. ئەگەر مەسیحی بین پێویستە باوەڕمان بەمە بێت کە یەکێك لە سێ شێوەی خودا لەسەر ڕەحمەتەوە لە پێگەی خۆی دابەزیوەو وەکو مرۆی لێ هاتووە و لە یەهودیەدا لە دار درا. ئەگەر موسوڵمان بین پێویستە باوەڕمان هەبێ کە

خودایەکی تر جگە لە خودای تاك و تەنها بوونی نییە و حەزرەتی محەمەد پێغەمبەریەتی. بەڵام دەتوانین بوداییەکی باش بین و بوونی بودا ڕەت بکەینەوە. یان بە جۆرێکی وردتر, پێویستە بزانین کە لایەنی مێژوویی مەسەلەکە گرنگ نییە" ئەوەی گرنگە باوەڕهێنانە بە ئامۆژگاری و دەستوورەکانی, لەگەڵ ئەمەشدا ئەفسانەی بودا ئەوەندە جوانە کە ناتوانم باسی نەکەم.

فەرەنسییەکان بایەخێکی تایبەتیان بە لێکۆڵینەوەی ئەفسانەی بودا داوە. ئەوان وا ژیاننامەی بودا بۆ لێکدەدەنەوە کە راڤەکردنێکی ئەو شتانەیە کە لە ماوەیەکی کورت بەسەر مرۆڤدا دەگوزەرێت. دەشێ ئەو ڕاستییانە بەو شێوەیە ڕوویان دابێ و دەشێ بەو شێوەیەش نەبووبێ, بەڵام ئەفسانەی بودا تا ئێستا بیری میلیونەها کەسی رۆشن کردۆتەوەو تا ئێستایش لەسەر ئەو روشنکردنەوەیە بەردەوامە. ئەم ئەفسانەیە ئیلهامی بە ژمارەیەکی زۆر لە تابلۆ و پەیکەرو شیعرەکان بەخشیووە. ڕێبازی بودا جگە لەوەی ئایینە, ئەفسانەناسی, جیهان ناسی و سیستەمی میتافیزیکیشە. بەشێوەیەکی زۆر وردتر دەتوانین بڵێین کە زنجیرەیەکە لە سیستەمە میتافیزیکییەکان کە یەکتریان قبوڵ نییە و پێکەوە لە کێشمەکێشدان.

ئەفسانەی بودا رۆشنگەرانەیە, وەکو بڵێیت کە مرۆ پێویستی بەوە نییە کە باوەڕی پێ بهێنێ, لە گەردونەوە دەست پێ دەکات. لە گەردوندا کەسێك هەیە کە سەدەکان و سەدەکان – دەشێ بتوانرێت وا بوترێت کە سەدەگەلێکی بێ کۆتایی – خەریك بووە کە خۆی بە ئەوپەڕی بەرکەماڵی بگەیەنێت لە پێناو تێگەیشتندا, ئەو کەسەی کە لەبەرجەستەکردنی دوتریدا دەبێتە بوودا.

ئەو کیشوەرەی کە تێیدا لەدایك دەبێ, خۆی هەڵیدەبژێرێت. بەپێی گریمانەیی بودایی لەسەر دروستبوونی جیهان, دنیا کراوە بە چوار کیشوەری سێ گۆشە و شاخێکی ئاڵتوونی مەرکەزیەتی کە ناوی (میرۆ)یە. ئەو لە شوێنێکدا لەدایك بووە کە هیندستانە. خۆی ئەو سەدەیە هەڵدەبژێرێت کە تێیدا لەدایك دەبێ و هەروەها چینی کۆمەڵایەتی و دایکیشی هەر خۆی هەڵیدەبژێرێت. بەڵام, بەشە زەمینیەکەی ئەم ئەفسانەیە: شاژنێك هەیە بە ناوی (مایا) کە شووی بە شا سوزودانا کردووە, مایا بە واتای خەیاڵاتە. مایا لە دنیای خەونیدا دەبینێت کە فیلێکی سپی شەش عاجەیی کە لە شاخە زێڕینەکاندا سەرگەردان بوو بێئەوەی ئازاری بدات دەچێتە کەلەکەی چەپیەوە. لە خەو هەڵدەستێت. شا بەخت گرەوەکانی خۆی بانگ دەکات و ئەوان وا بۆی تەفسیر دەکەن کە شاژن کوڕێکی دەبێت یان دەبێتە ئیمپراتۆری جیهان و یان دەبێتە بودا, پیاوی بێدار بوو, ئەو پیاوەی کە دەتوانێ مرۆ ڕزگار بکات. هەر بەو جۆرەی چاوەڕوان دەکرێت شا چارەنووسی یەکەم هەڵدەبژێرێت: ئەو دەیەوێت کوڕەکەی ببێتە ئیمپراتۆری جیهان.

دەگەڕێینەوە بۆ وردەکاریەکانی مەسەلەی فیلی شەش عاج. (ئولدنبرگ) دەڵێت کە فیل لە هیندستاندا بە ئاژەڵێکی ماڵی ئاسایی دەژمێردرێت و رەنگی سپی هەمیشە نیشانەی پاکیزەییە. بەڵام بۆچی شەش عاج؟ پێویستە ئەمەمان لە یاد بمێنێ "جارو بار لە مێژوودا دێتە ئاراوە" ژمارەی شەش کە بەلای ئێمەوە ڕێکەوت یان نەگونجاوە – ئێمە ژمارەی سێ یان حەوت هەڵدەبژێرین – لە وڵاتی هیندا هەروا بە ئاسانی وێنا ناکرێت. خەڵکی ئەو ناوچەیە باوەڕیان وایە کە لە فەزادا شەش رەهەند هەیە: سەرەوە, خوارەوە, بەرامبەر, دواوە, چەپ,

راست. شەش عاج بوونی فیلێکی سپی لەلایەن هیندیەکانەوە شتێکی نائاسایی نیە.

شا جادوگەرەکانی بانگ دەکات و شاژن بەبێ هیچ ئازارێك منداڵی دەبێت. دارێکی هەنجیر بۆ یارمەتیدانی چڵەکانی دادەنەوێت. کۆرپەلەکە بە پێوە لەدایك دەبێ و چوار هەنگاو هەڵدەگرێت - بەرەو لای باکوور، باشوور، خۆرئاوا و خۆرهەڵات - و بە دەنگێکی شێر ئاسا دەدوێت: "من هەمان مرۆی بێ هاوتام، ئەمە دوایین لەدایك بوونم دەبێ". (هیندییەکان باوەڕیان بە لەدایکبوونی تازەو بێ کۆتایی هەیە). شازادە گەورە دەبێ و دەبێتە باشترین تیرهاوێژ، باشترین سوارچاك، باشترین مەلەوان، باشترین وەرزشکار و باشترین خۆشنووس" گشت پزیشکەکان سەریان لێ سووڕدەمێنێت (لێرەدا دەشێ مەسیح و پزیشکەکان بهێنینەوە یاد). لە تەمەنی شانزەساڵیدا ژن دەهێنێت.

باوکی دەزانێ - بەختگرەوەکان پێیان وتووە - کە ئەگەر کوڕەکەی چوار ڕاستیی ژیان واتە پیری،نەخۆشی، مەرگ و ڕاهێنانی ڕۆحی بزانێت ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە ببێتە بودا یان ڕزگارکەری کەسانی دی. شا، کوڕەکەی لە کۆمەڵگا دوور دەخاتەوە و لە کۆشکەکەیدا دەیهێڵێتەوە و حەرەمسەرایەکی بۆ ئامادە دەکات. با باس لە ژمارەی ژنانی حەرەمسەرا نەکەین کە لەوە دەچێت هیندیەکان زیادەڕۆییان تێدا کردبێ. بەڵام بۆچی نەیڵێین؟ ژمارەیان هەشتاو چوار هەزار کەس بوو. شازادە بە خۆشی و کامەرانی دەژیا. نازانێ لەم دنیایەدا ڕەنج و ئازار هەیە. ئەویان لە پیری و نەخۆشی و مەرگ پاراستووە. لە ڕۆژێ چارەنووسدا بە گالیسکەکەی لە یەکێك لە چوار دەروازەی کۆشکی لاکێشەیی دەچێتە دەرەوە" با بڵێین لە دەروازەی باکوورەوە. درێژە بە ڕێگاکەی دەدات تا چاوی بە بوونەوەرێك دەکەوێت کە هەرگیز لە ژیانیدا وێنەی نەبینیووە. بونەوەرێکە چەماوە، کۆم و کەچەڵە. بە زەحمەت ڕێ دەکات و داردەستێکی بە دەستەوەیە. شازادە دەپرسێت ئەو پیاوە کێیە، ئەگەر بەڕاستی پیاو بێ. گالیسکەوان وەڵامی دەداتەوە کە ئەوە پیرەمێردێکە و ئێمەیش ئەگەر لە ژیان بەردەوام بین وەکو ئەومان لێدێت.

شازادە بە نارەحەتییەوە بۆ کۆشك دەگەڕێتەوە. پاش شەش ڕۆژ دووبارە دەچێتەوە دەرەوە، ئەمجارەیان لە دەروازەی باشوورییەوە. پیاوێك دەبینێ کە لە رووبارێکدایە. ئەو پیاوە سیمای لە پیاوی پێشوو سەیرترە: پیاوێك کە دەم و چاوی بە هۆی نەخۆشی گولیەوە ناشرین بووە. دەپرسێت کە ئەو پیاوە کێیە، ئەگەر پیاو بێ. گالیسکەوان وەڵامی دەداتەوە ئەو پیاوە نەخۆشە و هەمووان ئەگەر درێژە بە ژیان بدەین وەکو ئەومان لێدێت.

شازادەکە زۆر بێ تاقەت و نیگەران بوو، بەرەو کۆشك دەگەڕێتەوە. پاش شەش ڕۆژ دووبارە کۆشك بەجێدەهێڵێت. ئەمجارەیان پیاوێك دەبینێ کە لە نوستوو دەچێت، بەڵام ڕەنگ و ڕووی، ڕەنگی ژیان نییە. ژمارەیەك هەڵیان گرتووە. دەپرسێت ئەوە کێیە؟ گالیسکەوان دەڵێت ئەوە پیاوێکە مردووە و هەموومان ئەگەر لە ژیان بەردەوام بین وەکو ئەومان لێدێت.

شازادە کە زۆر بێتاقەت و نارەحەتە، سێ ڕاستی ترسناکی بۆ ئاشکرا بووە: ڕاستیی پیری، ڕاستیی نەخۆشی و ڕاستی مەرگ. بۆ چوارەمین جار لە کۆشك دەچێتە دەرەوە. پیاوێك دەبینێ ڕووتە و سیمایەکی پڕ لە ئارامی و میهرەبانی هەیە. دەپرسێت ئەو پیاوە کێیە؟ پێیدەڵێن ئەو پیاوە ڕاهێنەری ڕۆحە، پیاوێکە چاوی لە هەموو شتێ پۆشیووە و بەختەوەر بووە.

شازاده بڕیار دەدات واز لە هەموو شتێ بهێنێت – ئەو کە ژیانی نەجیب زادەیی هەبوو (ئایینی بودا باوەڕی وایە کە دەشێ ڕاهێنانی ڕۆحی شتێکی پێویست بێ بەڵام نەك بەر لە تاقیکردنەوەی ژیان. بە پێویستی نازانێ مرۆ بۆ ئەوەی ببێتە بودایی واز لە هەموو شتێ بهێنێ. پێویستە مرۆڤ ژیانی خۆی تا ئەو ڕادەیەی دەگاتە خەڵتەکەی بپاڵێوێت و ئەو کات چاو لە خەیاڵاتی ژیان بپۆشێت، نەك بەرلەوەی بیناسێت). شازادە بڕیار دەدات ببێتە بودا. لەم ساتەدا پەیامێکی پێ دەگات: (یاشودارا)ی هاوسەری کوڕێکی بووە. دەڵێت: "کۆت و زنجیرێك دروست بووە". ئەمە ئەو کوڕەیە ئەو بە ژیانەوە دەبەستێتەوە. بۆیە ناوی دەنێت راهولا، واتە کۆت و زنجیر. سیزارتا دەچێتە حەرەمسەراکەی. سەیری ژنە جوان و گەنجەکان دەکات و ئەوان بەشێوەی پیرەژنی گول و ترسناك دێنێتە بەرچاو. دەچێتە ژووری هاوسەرەکەی. هاوسەرەکەی نووستووە، منداڵەکەی لە ئامێز دەگرێت. شتێکی نەماوە کە ماچی هاوسەرەکەی بکات. بەڵام دەزانێ ئەگەر وا بکات چیتر ناتوانێ وازی لێبهێنێت، ئیدی بەجێی دەهێڵێت.

دەبێتە خوێندکاری کۆمەڵێك مامۆستای جۆراو جۆر. ئەوان فێری ڕاهێنانی ڕۆحی دەکەن و ئەو تا ماوەیەکی زۆر خۆی لەسەر ئەو شتانە ڕادەهێنێ. لە کۆتاییدا، لە نێوان کێڵگەیەکدا ڕاکشاوە. جەستەی بێ جووڵەیە و خوداکان کە لە (33) ئاسمانەوە دەیبینن وا دەزانن مردووە. یەکێك لە خوداکان کە زیرەکترینیانە دەڵێت: "نە، ئەو نەمردووە. ئەو دەبێتە بودا". شازادە هەڵدەستێت، بەلای ئەو ڕووبارەدا تێدەپەڕێت کە لەو نزیکانەیە، کەمێك خۆراك ئامادە دەکات و لە ژێر داری هەنجیری پیرۆز دادەنیشێت – کە دەتوانرێت ناوی بە داری شەریعەت ناوببرێت.

ئەو شتەی پاشان ڕوودەدات میان پەردەیەکی سیحریە، ڕووداوێك کە لەگەڵ ئینجیلەکاندا ڕێك دەکەوێت: شەڕ لەگەڵ شەیتاندا. شەیتان لێرەدا ناوی (مارا)یە. (پێشتر سەبارەت بە *night mare* بە واتای شەیتانی شەو باسمان کردووە). مارا هەست دەکات کە دەستەڵاتی لەسەر زەویدا کەوتۆتە ژێر مەترسییەوە، ئیدی شوێنی خۆی بەجێدەهێڵێت. ژێی سازە موسیقاییەکانی پچڕاون" ئاوی ئەمبارەکانی وشکیان کردووە. بانگی لەشکرەکەی دەکات. سواری فیلێك دەبێ کە خودا دەزانێ چەند هەزار مەتر بەرزە، ژمارەی کەلوپەلەکانی زیاد دەکات و هێرش دەکاتە سەر شازادە. عەسرە و شازادە لە ژێر داری زانستدا دانیشتووە، ئەو دارەی کە هاوکات لەگەڵ لەدایکبوونیدا دروست بووە.

شەیتان و لەشکەری پڵنگەکان و شێرەکان و حوشترەکان و فیلەکان و سەربازە زل و قەبەکان تیرەکانیان بەرەو ڕووی شازادە دەهاوێژن، تیرەکان دەبنە گوڵ. چیای ئاگرینی بۆ دەنێرن. ئاگرەکان لەسەر سەری سێبەرێك دروست دەکەن. شازادە لە حاڵێکدا بێ جووڵە چوار مشقی دانیشتووە و لە ناو بیردا نوقم بووە. دەشێ نەزانێ کە هێرشی کراوەتە سەر. لە بیریدا بە ژیانیدا دەچێتەوە" خەریکە بە نیرڤانا یان ڕزگاری دەگات. بەر لە ئاوا بوونی خۆر شەیتان دۆڕاوە. شەوێکی دوور و درێژ لە ناو بیرکردنەوەدا دەگوزەرێنێت" لە کۆتاییدا سیزارتا چیتر سیزارتا نییە. بودایە" گەیشتووەتە نیرڤانا.

بڕیار دەدات کە شەرع بڵێتەوە. لە جێگاکەی هەڵدەستێتەوە – ئێستا کە خۆی ڕزگار بووە دەیەوێ کەسانی تریش ڕزگار بکات. یەکەمین وتاری خۆی لە ناو باخچەی گا کێوی بنارسدا دەدات.

پاشان وتارێکی دی پێشکەش دەکات، وتاری ئاگر، کە تیایدا دەڵێت هەموو شتێ خەریکە دەسووتێت: رۆحەکان، جەستەکان، هەموویان لە ناو ئاگردان. لەو کاتەدا کەم بۆ زۆر (هراکلیتوس[4] ئەفسوسی)یش – کە خەڵکی شارێکی کۆنی یۆنانە – دەیووت کە هەموو شتێ لە ناو ئاگردایە.

ئایینی بودا، ئایینی راهێنانی رۆح نییە، لەبەرئەوەی بە باوەڕی بودا راهێنانی رۆحی هەڵەیە. پێویست ناکات کە مرۆ واز لە دنیا بهێنێت لەبەر ئەوەی دنیا مایەی جەفاو ئەفسوس و مایەی شەرمە.

ئەو – ئەگەر زاراوەی ئیلاهیاتەکەی بەکاربهێنین – پێشنیازی میانە رێگایەك دەکات، ئەو گەیشتووەتە نیرڤانا و تا چل و چەند ساڵێکی دی درێژە بە ژیانی دەدات، کە هەموو تەمەنی بۆ فێرکردن تەرخان دەکات. دەیتوانی ناميرا بمێنێتەوە، بەڵام پاش ئەوەی پەیڕەوانێکی زۆر دەدۆزێتەوە ساتی مەرگی خۆی هەڵدەبژێرێت. لە ماڵی ئاسنگەرێکدا لەسەرەمەرگدایە. موریدەکانی لە دەوروبەریدا دانیشتوون. بێ ئومێدن. بێ ئەو چی بکەن؟ پێیان دەڵێت کە ئەو بوونی نییە، کە ئەویش هەر بە ئەندازەی ئەوان ناواقیعی و فانیە، بەڵام شەریعەتیان بۆ بەجێدەهێڵێت. ئەم قسەیە جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ قسەی مەسیحدا هەیە. عیسا بە موریدەکانی وت ئەگەر دووکەس پێکەوە بوون من سێیەم کەسم لەگەڵیاندا، بە پێچەوانەوە بودا دەڵێ: من شەریعەتی خۆمتان بۆ بەجێدەهێڵم. بە دەربڕینێکی دی، ئەو بە یەکەم وەعزدادانی خۆی چەرخی ئایینی خستوەتە گەڕ. لە دواییدا کورتە مێژووی ئایینی بودا دروست دەبێ: لاماکییزم. بودیزمی جادوویی، هینایانا یان چەرخی بچووك، ماهایانا یان چەرخی گەورە، رێبازی بودایی زن لە وڵاتی ژاپۆندا.

بەڕای من زن شێوەیەکە لە ئایینی بودا کە زۆر لە رێباز و کارە فێرکاریەکانی بودا دەچێت یان بە کردار لێی دەچێت. شێوەکانی دی فۆرم گەلێکن لە ئەفسانە ناسی، چیرۆکە ئاکاریەکانن. بێگومان بودا دەیتوانی موعجیزە بکات. بەڵام موعجیزە وەکو مەسیح دڵتەنگیان دەکرد" رقی لە ئەنجامدانی موعجیزە هەبوو.

لەلای ئەو ئەم کارە جۆرێك خۆ نواندنی عەوامانە بوو. سەبارەت بەم بابەتە چیرۆکێك باس دەکەم: چیرۆکی ئەو جامەی کە لە داری سەندەڵەوە دروست بووە.

لە یەکێك لە شارەکانی هیندا بازرگانێك پارچە دارێکی سەندەڵ هەڵدەکەنێت و جامێکی لێ دروست دەکات. لەسەر چەند دانە لقی حەیزەران کە زۆر بەرز و لووسە دایدەنێت و دەڵێت ئەگەر هەر کەسێك بتوانێ ئەو جامە هەڵگرێت جامەکەی پێ دەبەخشێت. چەند مامۆستای یاخی هەوڵی بێ سوود دەدەن. پاشان هەوڵ دەدەن بازرگانەکە بە بەرتیل رازی بکەن تاکو بڵێت ئەوان سەرکەوتوون. بازرگان قبوڵی ناکات. لەم کاتەدا یەکێك لە پەیڕەوەکانی بودا دێت. (لە دەرەوەی ئەم رووداوەدا ناوی لە هیچ شوێنێکدا نەهاتووە). بەرز دەبێتەوە، شەش جار بە دەوری جامەکەدا دەفڕێت، هەڵیدەگرێت و دەیداتە بازرگانەکە، وەختێ بودا ئاگادار دەکرێتەوە لەو مەسەلەیە ئەو موریدەی خۆی دەردەکات بە هۆی زیادەڕۆیی کردنی لە کارێکی منداڵانەدا.

لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ جار بودا موعجیزەی دەنواند. بۆ نموونە ئەم موعجیزەیە کە بە مەبەستی پاراستنی ئەدەب و نەزاکەتەوە کردبووی: رۆژێکیان بودا ناچار بوو لە کاتی نیوەڕۆدا بە بیابانێکدا تێپەڕێت، خوداکانی سی و سێ ئاسمان هەرکامیان

چەترێکی بۆ دەنێرن، بودا لەبەرئەوەی نایەوێت بە هیچ کام لەو خودایانە بێ ئەدەبی بکات خۆی دەکات بە سی و سێ بودا. بەم شێوەیە هەر خودایەك بودایەك لە ژێر چەترەکەیدا دەبینێت.

لە نێوان چیرۆکەکانی بودادا، چیرۆکێك بەشێوەیەکی زۆر بەرجەستە رۆشنگەرانەیە: چیرۆکی تیر. پیاوێك لە شەڕدا بریندار بووە، بەڵام ناهێڵێت کەس تیرەکە لە لەشی دەربهێنێ. سەرەتا دەیەوێ بزانێ ناوی تیرهاوێژەکە چییە، لە چ چینێکی کۆمەڵایەتییە، تیرەکە لە چی دروست کراوە، تیرهاوێژ لە کاتی تیرهاویشتندا لە کوێ وەستاوە درێژی تیرەکە چەندە. لە حاڵێکدا کە خەریکی باسکردنە سەبارەت بەو مەسەلەیە، دەمرێت. بودا وتی: "بەڵام داوادەکەم کە پێویستە مرۆ تیرەکە دەربهێنێتە دەرەوە" تیر چییە؟ تیر دنیایە. تیر بۆچوونی منە. بۆچوونم بۆ هەرشتێك کە پێی بەستراوینەتەوە. بودا دەڵێت نابێ ئێمە وەختی خۆمان بە پرسیاری بێ سوود لەکیس بدەین، ئایا دنیا کۆتایی هەیە یان بێ کۆتاییە؟ ئایا بودا پاش نیرڤانا درێژە بە ژیانی دەدات یان نا؟ گشت ئەم پرسیارانە بێ سوودن. ئەوەی گرنگە ئەمەیە کە پێویستە تیرەکە دەربهێنین. ئەمە جۆرێکە لە رزگاری، یاسایەکە لە رزگاری. بودا دەڵێت: "هەر بەو شێوەیەی کە ئوقیانووسی بێ کەنار تەنها یەك تامی هەیە، تامی خۆی، تامی شەریعەت و ئایینیش تامی رزگاریە.." پەیڕەولێکەرانی بودا خۆیان لەناو باس و لێکۆڵینەوە دوورودرێژە میتافیزیکییەکاندا ون کردووە (یان لە سنووریان زیاد تێپەڕاندوە). بەڵام ئەمە ئامانجی بودا نییە. بوداییەك ئەگەر پەیڕەوی لە ئایینەکەی بکات بۆی هەیە هەر مەزهەبێکی تر بۆ خۆی هەڵبژێرێت. ئەوەی گرنگە رزگار بوون و ئەو چوار راستییە رەسەنەیە: ئازار، رەگ و ریشەی ئازارو چارەسەرکردنی ئازار، رێگای گەیشتن بە چارەسەرکردن.

پاش ئەمانە نیرڤانایە. پۆلێنی راستییەکان لە ئارادا نییە. ووتویانە ئەم راستیانە لەگەڵ شێوەی باوی پزیشکی نەخۆشی، دۆزینەوە و دەرمان و چارەسەرکردنی دەگونجێت. لەم حاڵەتەدا چارەسەرکردن نیرڤانایە.

ئێستا دەگەینە بەشی دژواری ئەم بابەتە کە زەین و هۆشی خۆرئاوایی ئێمە حەزی بە رەت کردنەوەیەتی. دۆنادۆن (تناسخ) کە بە رای ئێمە بۆچوونێکی شاعیرانەیە، ئەو شتەی دوچاری دۆنادۆن دەبێ رۆح نییە، لەبەرئەوەی ئایینی بودا بوونی رۆح رەت دەکاتەوە، بەڵکو ئەوە (کارما)یە کە جۆرێکە لە میکانیزمی زەینی کە تاڕادەیەکی بێ کۆتایی دوچاری دۆنادۆن دەبێ. لە خۆرئاوادا ژمارەیەکی زۆر لە رووناکبیران ئەم باوەڕەیان هێناوەتە ئاراوە کە فیساغۆرس لە سەرووی گشتیانەوەیە - کە ئەو سپەرەی ناسییەوە کە وەختێ لە شەڕی تەروادەدا بەشداری کردبوو و لەو کاتەدا ناوێکی تری هەبوو. لە کتێبی دەیەمی کۆماری ئەفلاتون خەونی (ئێر) هاتووە (ئێر، سەربازێکە) کە ئاگادارە تا رۆحەکان بەر لەوەی لە ئاوی رووباری فەرامۆشی بخۆنەوە خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، (ئاگا ممنون[5]) وا هەڵدەبژێرێت کە ببێتە داڵ، (ئۆرفیوس[6]) وایدەوێت ببێتە قوو (ئودیسیوس) "فەیلەسوف و سیاسەتمەداری یۆنانی" داوادەکات ببێتە ئاساییترین و گومناوترین مرۆڤ.

لە کتێبی "ئومپدوکلس ئاگریجبنتومی[7]" بەشێکی تێدایە کە یاد لە ژیانی پێشووی خۆی دەکات: "کچێك بووم، لقی دارێك بووم، گاکێویەك بووم، و ماسیەکی بێدەنگ بووم کە لە دەریا

دەرچوومە دەرەوە". سزار ئەم تیۆرییانە دەداتە پاڵ درڤیدیەکان. شاعیری ڤلزی، تالیسین دەڵێت: تەنانەت یەك شێوەش لەم دنیایەدا بوونی نییە کە من خۆم تیا نەبینیبێتەوە: "رێبەرێك بووم لە جەنگدا، شمشێرێك بووم لە دەستدا، پردێك بووم کە بەسەر شەست رووباردا تێدەپەڕی، جادوکرام و بووم بە کەفی ئاوی دەریا. ئەستێرەیەك بووم، نوورێك بووم، دارێك بووم، وشەیەك بووم لە ناو کتێبێکدا، کتێبێك بووم کە سەرەتای دەستپێکردنی بوو." داریو شیعرێکی هەیە کە لەوانەیە جوانترین شیعری بێ و بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: "سەربازێك بووم لەسەر پێخەفی کلیوپاترای شاژندا دەنووستم.."

دۆنادۆن یەکێك بووە لە ناوەڕۆکە بەرجەستەکانی ئەدەبیات. لە نێوان عارفەکانیشدا رووبەرووی ئەم ناوەڕۆکە دەبینەوە. (پلوتینوس[8]) دەڵێت چوون لە ژیانێکەوە بۆ ژیانێکی تر وەك نووستن وایە لە پێخەفی جۆراو جۆر و لە ژوورگەلێکی جۆراوجۆردا. من وا دەزانم هەموومان تا ئێستا هەستی ئەوەمان کردبێت کە ژیانی کۆنمان تاقی کردۆتەوە (دانتە گابریل رۆسێتی[9]) لە شیعری جوانی خۆیدا "رووناکی لەناکاو" دا دەڵێت: "من پێشتر لێرەدا بووم" ئەمە بە ژنێك دەڵێت کە هێناویەتی یان دەیهێنێت. پێی دەڵێت کە پێشتر هی ئەو بووەو زۆر جار لەگەڵیدا بووە و تا ئەبەد هی ئەو دەبێ. ئەم بابەتە بەرەو تێزی چەرخەکان دەمانبات کە نزیکی ئایینی بودایە، و "سن ئاگوستین" لە شاری خودادا ڕەتی کردووەتەوە.

هەواڵی تێز گەیشتە لای رواقی[10] و فیساغورسیەکان: جیهان لە ژمارەیەکی بێ شوماری چەرخەکان پێکهاتووە کە دەبێتە چەند کالپایەکەوە[11]. کالپا لەوپەڕی توانای بەرجەستەکردنی مرۆڤە. دیوارێکی ئاسنی بهێننە بەرچاوتان کە زیاتر لە (25) کیلومەتر بەرزەو هەر شەش سەد ساڵ جارێك فریشتەیەك بە پەڕۆیەکی ناسکی بنارسی لێوارەکەی پاك دەکاتەوە. وەختی ئەو دیوارە بەرزە (25) کیلۆمەترییە بەهۆی پیاهێنانی ئەو پەڕۆیەوە بە تەواوەتی دەسوێت و ئاستی دەگاتە ئاستی زەوی، یەکەمین رۆژ لە کالپایەك تێدەپەڕێت. خوداکان بۆماوەی یەك کالپا دەژین و پاشان ئەوانیش دەمرن و دووبارە لەدایك دەبنەوە. مێژووی دنیا بەش دەکرێتە چەند چەرخە گەلێکەوە و لە ناو ئەم چەرخانە خۆرگیران گەلێکی زۆر گەورە بوونیان هەیە کە بەهۆی روودانیان هیچ شتێك نامێنێ جگە لە وشەکانی "ڤێداکان[12]".

ئەو وشە کۆنانە نموونە گەلێکن کە شتەکان دەخوڵقێنن. "برهما"یش کە خۆی خودایە دەمرێت و دووبارە لەدایك دەبێتەوە. ساتێکی تاڕادەیەك مایەی ئەفسوسە کە "برهما" لە کۆشکی خۆی دەبینرێت. ئەو پاش یەکێك لە کالپاکان، پاش یەکێك لە خۆرگیرانەکان دووبارە لەدایك بووەتەوە. لە نێوان ژوورەکانی کۆشك کە بەتاڵن تێدەپەڕێت. بیر لە خوداکانی دی دەکاتەوە، خوداکانی دی بە فرمانی ئەو دەردەکەون" و وا دەزانن کە "برهما" ئەوانی بۆیە خوڵقاندووە لەبەرئەوەی پێشتریش لەوێ بوون.

وەرن بۆ ساتێك لەم دیمەنەوە بیر لە مێژووی هەستی بکەینەوە. لە ئایینی بودا خودایەك نییە" یان لەوانەیە خودایەك هەبێت، بەڵام نەك وەکو پێویستییەکی سەرەکی. مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە کە باوەڕمان بەمە هەبێت کە چارەنووسمان لەلایەنی (کارما)کانمانەوە روویداوە. ئەگەر وا روویداوە کە من لە ساڵی 1899 لە (بوئنوس ئایرس) لەدایك بووبێتم، ئەگەر وا روویداوە کە کوێربم، یان ئەمشەو لە بەرامبەر ئێوە ئەم قسانە و ئەم بابەتانە بڵێم،

هەمووی ئەنجامی ژیانی پێشووی منە. تەنانەت راستیەکی ژیانی من بوونی نییە کە بەهۆی ژیانی پێشوومەوە ڕووی نەدابێ. ئەمە شتێکە کە ناوی (کارما)یە. کارما هەر بەو شێوەیەی کە وتوومە دەبێتە بونیادێکی زەینی, بونیادێکی زەینی زۆر ناسك.

ئێمە لە هەموو سات لە ژیانماندا خەریکی چنین و تێهەڵکێش بوونین لەگەڵ چنیندا. ئەوەی دەیچنین تەنها ئیرادە, کردار, نیمە خەون و خەون و نیمە هووشیاریمان نییە" ئێمە تا ئەبەد خەریکی چنینی کارەکانمانین. و وەختێ کە دەمرین بوونەوەرێکی تر لەدایك دەبێ کە ئەو کارمایەمان وەردەگرێت.

دیوسن - یەکێک لە پەیرەوەکانی شوپنهاور[13] کە شەیدای ئایینی بودا بوو - چیرۆکی ئاشنا بوون و دۆستایەتی خۆی لەگەڵ گەدایەکی کوێر لە هێندا دەگێڕێتەوە. ئەو گەدایە پێی دەگووت: "ئەگەر من کوێر لەدایك بووم بە هۆی ئەو تاوانانەیە کە لە ژیانی پێشوومدا ئەنجاممداون" کوێربوونی من لە ڕووی عەدالەت و یەکسانییە". خەڵك رەنج و ئازار قبوڵ دەکەن. گاندی رەزامەند نەبوو لەسەر دروستکردنی نەخۆشخانە. دەیگوت نەخۆشخانە و کاروباری خێرو کۆمەك تەنها بەجێهێنانی دەین دوا دەخات. مرۆڤێك ناتوانێ یارمەتی مرۆڤێکی تر بدات: ئەگەر کەسانی دی ئازار دەبینن پێویستە ئازار ببینن تا سزای تاوانەکەیان ببینن. ئەگەر من یارمەتیان بدەم بەجێهێنانی دەینەکەیان دوا دەخەم.

کارما یاسایەکی زاڵمانەیە, بەڵام ئەنجامێکی بیرکاری سەیری هەیە. ئەگەر ژیانی من لەلایەنی ژیانی پێشووم دیاری کرابێ, ئەو ژیانە پێشووەش لە لایەنی ژیانی پێشتری دیاری کرابێ و ئەویش لە لایەنی ژیانی پێشووی و بەم شێوەیە دەتوانرێت تا ئەزەل بەرەو پێشەوە بچیت. بە پێناسەیەکی دی پیتی (ی) لە لایەنی (ه), (ه) لە لایەنی (و), (و) لە لایەنی (ن) و (ن) لە لایەنی (م) دیاریکراوە. بەمەرجێك وا بزانین کە ئەم ئەلف و بایە تەنها کۆتایی هەیە و سەرەتایەکی نییە. بودایی و هیندییەکان بە گشتی باوەڕیان بە بێ کۆتاییەکی زیندوو هەیە. ئەوان بڕوایان وایە کە لە پێناو گەیشتن بە ساتێك کە تێیدا زەمەنێکی بێ کۆتاییان تێپەڕاندووە. مەبەستم لە بێکۆتایی, نادیار یان بێ شومار نییە - مەبەستم بێ کۆتاییە.

لە نێوان شەش چارەنووسێك کە مرۆڤەکان ناچارن هەڵیبژێرن - مرۆڤ دەتوانێ ببێتە بوونەوەرێکی شەیتانی, ڕوەکی, حەیوانی - گرانترینیان مرۆڤ بوونە, و پێویستە بۆ رزگاربوونمان سوودی لێوەربگرین. بودا وای دەهێنا بەرچاوی خۆی کە لە بنی دەریادا کیسەڵێك و ئەڵقەیەکی تێدایە. هەر شەش سەد ساڵ جارێك کیسەڵەکە سەری دەهێنێتە دەرەوە. گریمانەی ئەوەی سەری کیسەڵەکە لە کاتی هاتنە دەرەوە بچێتە ناو ئەڵقەکەوە زۆر کەمە. بەڵام بودا دەیوت کە مرۆڤ بوون هەر بە ئەندازەی ئەگەری چوونی سەری کیسەڵ بۆ ناو ئەڵقەکە کەم ڕوودەدات. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بڕیار وایە کە بگەینە نیرڤانا, پێویستە پێشتر ببینە مرۆڤ.

ئەگەر مانای خودا ڕەت بکەینەوە, ئەگەر خودایەك کە بە چییەتی مرۆیی بوونی نەبێ کە جیهانی خوڵقاندبێ, ئیدی سەرچاوەی ئازار و رەنج چییە؟ سەرچاوەی ژیان چییە؟ ئەمە شتێکە کە بودا ناوی ناوە: (زن). لەبەرئەوەی لەوانەیە واژەی زن واژەیەکی نامۆ بێ, خراپ نییە

لێرەدا ئەم واژەیە لەگەڵ ئەو واژانەی دەیانناسین پێوانە بکەین.

وەرن بۆ نموونە وشەی "ئیرادە"ی شوپنهاور لەبەرچاو بگرین. زەینیەتی شوپنهاور لە دنیا بە شێوەی ئیرادە و وێناکردن بوو. بەڕای ئەو لە هەمووماندا ئیرادەیەك شاراوەیە کە دەبێتە هۆی ئەو وێناکردنەی کە دنیایە. ئەم بابەتە لە فەلسەفەکانی تردا بە ناونیشانی جۆراو جۆر دەدۆزینەوە. (برگسن[14]) سەبارەت بە "جۆش و خرۆشی ژیان" و (برناردشاو[15]) سەبارەت بە "هێزی ژیان" دەدوێت کە هەردووکیان هەریەك شتە. بەڵام لێرەدا جیاوازیەك هەیە: بەڕای برگسن و شاو، جۆش و خرۆشی ژیانی، هێزێکە کە ئێمە زیرەکانە سوودی لێ وەردەگرین - درێژە بە خەونی دنیاو بە خولْقاندنی دنیا دەدەین. بە ڕای شوپنهاور، شوپنهاوری خەمۆك و مەلوول و بەڕای بودا، دنیا خەونە. پێویستە لەو خەونە بێدار ببینەوەو تەنها بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر دەتوانین سەرکەوین. ئێمە بنەمای ئازارمان هەیە کە دەبێتە زن. زن ژیان وەبەردێنێت و ژیان بە شێوەیەکی زۆر بەهێز کارەساتی دڵتەزێنی لێ دەبێتەوە. مانای ژیان چییە؟ ژیان لەدایك بوون، پیربوون، نەخۆش کەوتن و مردنە- لە خەم و خەفەتەکانی - تر تێپەڕین، بە تایبەت ئەو خەمەی کە لەلای بودا خەفەتبارترینیانە: نەبوون لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن.

پێویستە هەستەکانمان بنێینە لاوە. خۆکوشتن کۆمەکێك ناکات، لەبەر ئەوەی کردارێکی لە ڕووی هەست و هەڵچوونە. ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت لە دنیای خەونەکانیدا دەمێنێتەوە. پێویستە دەرکی ئەم مەسەلەیە بکەین کە دنیا خەیاڵە، خەونە. بەڵام پێویستە بە قووڵی هەستی پێ بکەین و ئەمە جگە لە ڕێی مەشق و خۆڕاهێنان لە بیرکردنەوەدا مەیسەر نابێ. لە پەرستگای بوداییەکاندا یەکێك لە پرۆڤەکان وایە: ئەو کەسەی پێویستە هەر سات لە ژیانی بەشێوەی تاقیکردنەوەی گشت ژیانی بگوزەرێنێت، پێویستە بیر بکاتەوە: "ئێستا نیوەڕۆیە" ئێستا خەریکم لە ناو حەوشە ڕێ دەکەم، ئێستا لەگەڵ ڕێبەرەکەمدا ڕووبەڕوو دەبمەوە". و لە هەمان کاتیشدا پێویستە وا بیربکاتەوە کە نیوەڕۆ، حەوشە و ڕێبەرەکەی ناڕاستین" پێویستە وا بیر بکاتەوە کە بەڕادەی پێویست خۆی و بیرو باوەڕەکانی ناڕاستین، لەبەر ئەوەی ئایینی بودایی من ڕەت دەکاتەوە.

یەکێك لە گەورەترین وەهمەکان (من)ە. ئایینی بودا بەم شێوەیە لەگەڵ (هیوم[16])، شوپنهاوەر و (ماسێدونیوفرناندز[17])ی خۆمان دەگونجێت، بکەرێك بوونی نییە" ئەوەی بوونی هەیە زنجیرەیەکە لە حاڵاتی زەینی. ئەگەر من بڵێم "وا بیر دەکەمەوە"، ئەوە خەریکی ئەنجامدانی کارێکی هەڵەم، لەبەرئەوەی خەریکم مەزەنەی بکەرێکی جێگیر و لە ئەنجامدا کارێك لەو بکەرە دەکەم کە بیرە. مەسەلەکە بەم شێوەیە نییە. هەر بەو شێوەیە کە هیوم دەڵێت: نابێ بوترێت "وا بیر دەکەمەوە" پێویستە بوترێت "وابیر دەکرێتەوە" هەر بەو شێوەیەی کە دەڵێین "باران دەبارێت". وەختێ دەڵێین "باران دەبارێت" واناهێنینە بەرچاومان کە باران خەریکی ئەنجامدانی کارێکە، بەڵکو وادەزانین کە کارێك خەریکە ئەنجام دەدرێت. هەر بەو شێوەیە کە دەڵێین "گەرمە" ، "ساردە"، پێویستە بڵێین "بیر دەکرێتەوە"، "ئازار دەبینرێت" و خۆمان لە بەکاربردنی بکەر بە دوور بگرین.

ئەو کەسانەی تازە ئایینی بودایان هەڵبژاردووە لە پەرستگاکاندا پەیڕەوی یاسا گەلێکی سەخت و گرانن. هەرکام لەوان دەتوانێ لە هەر کاتێکدا پەرستگاکە بۆ هەمیشە بەجێبهێڵێت. بیستوومە کە

کاریان بە ناویشیانەوە نییە. هەر کە ئەو کەسە دەچێتە ناو پەرستگاکەوە کاری سەخت و گرانی پێ دەکەن. دەنوێت، پاش چارەك سەعاتێك بێداری دەکەنەوە" پێویستە گسك بدات و ئەگەر خەوی لێبکەوێت سزای جەستەیی دەدەن. بەم شێوەیە پێویستە هەمیشە بیر بکاتەوە، نە بە تاوانەکانی، بەڵکو بە ناڕاستی بوونی هەموو شتێ. پێویستە بەردەوام خۆی لەسەر نەبوونی ڕاستی رابهێنێت.

ئێستا باسی (زن بودیزم) و هەروەها (بودیدارما) پەیامدەری گەورەی ئایینی دەکەین. لە سەدەی پێنجەمی زایینی بودیدارما لە هیندەوە بەرەو چین سەفەری کرد. لەوێ لەگەڵ ئیمپراتۆرێکدا چاوپێکەوتنی ساز کرد کە ئایینی بودایی بڵاودەکردەوە. ئیمپراتۆر ژمارەی پەرستگا و خوێندکارەکانی بۆ حساب کرد. بودیدارما پێی وت: "گشت ئەمانە پەیوەستن بە دنیای خەیاڵاتەوە. پەرستگا و کایەنەکان هەروەکو من و تۆ و بەهەمان ڕادە ناڕاستین". پاشان ڕۆیشت و بۆ بیرکردنەوە لەبن دیوارێکدا دانیشت.

فێرکاریەکانی بودایی گەیشتە ژاپۆن و کرا بە چەند ڕێبازی جۆراوجۆرەوە کە زن بەناوبانگترینیانە. بۆ گەیشتن بە ئیلهام لە زندا شێوازێك دۆزراوەتەوە. ئەم شێوازە پاش ساڵەها بیرکردنەوە بە ئەنجام دەگات. ئیلهام لەپرێکدا سەرهەڵدەدات: ئەنجامی زنجیرەیەك قیاسی وێنەیی نییە. مرۆڤ پێویستە لەپرێکا ڕاستی ئیلهام بدۆزێتەوە. ئەم پرۆسەیە ناوی ساتورییە و لەو ڕووداوە کتوپڕانەوە پێك دێت کە لەوپەڕی لۆجیکەوەیە.

ئێمە هەمیشە بە پێی بکەر – بەرکار، هۆکار – هۆدار، لۆجیك – نا لۆجیك، شتێك و دژ بەو شتە بیر دەکەینەوە. پێویستە بچینە ئەودیوی ئەم ڕیزبەندییانە، بە ڕای مامۆستاکانی زن، گەیشتن بە ڕاستی لە ڕێی مەزەنەی لە ناکاو، پێویستی بە وەڵامێکی نالۆجیکییە، خوێندکار لە مامۆستا دەپرسێت: "بودا چییە؟" مامۆستا وەڵام دەداتەوە: "داری چنار باخی میوەیە". ئەمە وەڵامێکی زۆر نالۆجیکییە بەڵام دەشێ ڕاستی بێدار بکاتەوە. خوێندکار دەپرسێت بۆچی بودیدارما لە خۆرئاواوە هات؟ مامۆستا وەڵام دەداتەوە: "سێ کیلۆ لۆکە". ئەم وشانە مانای ڕەمزی نییە. بەڵکو وەڵامێکی بێ سودە بۆ بێدارکردنەوەی کتوپڕی مەزەنە. گورزێکی لەناکاویش دەشێ هەر ئەم ئەنجامەی لێبێتەوە. دەشێ خوێندکار لە مامۆستا بپرسێت و مامۆستا بە زللە وەڵامی بداتەوە. چیرۆکێك سەبارەت بە بودیدارما هەیە کە دەیگێڕمەوە – هەرچەند بەپێی بنەماو دەستور پێویستە ئەفسانەیی بێ.

بودیدارما موریدێکی هەبوو کە بەردەوام پرسیاری لێدەکرد و بودیدارما هیچ وەڵامێکی پێنەدەدایەوە. ئەو موریدەی دەستی کرد بە بیرکردنەوەو پاش ماوەیەك دەستی ڕاستی خۆی لە بنەوە بڕی و پێشکەشی مامۆستاکەی کرد بە مەبەستی دەربڕینی مەیل و ئارەزووی بەرامبەر مامۆستاکەی. مامۆستا بێئەوەی بایەخێك بۆ دیاریەکەی دابنێت – لەبەرئەوەی هەموو شتێك لەوپەڕی ماددی و بێهودەییە – لێی پرسی: "تۆ چیت دەوێت" موریدەکەی وەڵامی دایەوە: "من ماوەیەکی زۆر بە دوای زەینی خۆمدا دەگەڕام و نەمدۆزیوەتەوە" مامۆستا وتی: "نەتدۆزیوەتەوە لەبەرئەوەی بوونی نییە" لەو ساتەدا موریدەکەی لە ڕاستی تێگەیشت، زانی کە (من) بوونی نییە، زانی کە هەموو شتێ ناڕاستییە. ئەم چیرۆکە کەم بۆ زۆر گەوهەری ئایینی بودایی زن نیشان دەدات.

وەسف کردن و بەشکردن و شیکردنەوەی ئاینێك, بەتایبەت ئاینێك کە پەیڕەوی نەبێن زۆر گرانە, بەڕای من ئەو شتەی لە ئایینی بودا گرنگە ئەفسانە سەرنجراکێشەکەی نییە, بەڵکو سیستەمە ڕێکو پێکەکەیەتی: سیستەمێکی ڕێك و پێك کە لەبەردەستماندایە و پێویست بەوە ناکات کە بۆ خاتری تەرکی دنیا بکەین. ئەو شتەی پێویستە بیرکردنەوەیە, ئەویش بیرکردنەوەیەك کە پەیوەندی بە تاوان و ژیانی رابردوومانەوە نییە. یەکێك لە بابەتەکانی بیرکردنەوەی ئایینی بودایی زن, بە پوچەڵ زانینی ژیانی رابردووە. ئەگەر من کایەنێکی بودایی ببومایە, لەم ساتەدا وابیرم دەکردەوە کە ژیانم هەر ئێستا دەستیپێکردووە, وا بیرم دەکردەوە کە تەواوی ژیانی رابردووی بورخس خەون بووە, وا بیرم دەکردەوە کە تەواوی مێژووی دنیا خەونە. لە ڕێی پرۆڤە کردن لە جۆری رۆشنبیرانە لە زن رزگار دەبین. وەختێ کە دەرك بەمە بکەین کە (من) بوونی نییە, وا بیر ناکەینەوە کە (من) دەتوانێ خۆشحاڵ بێت یان ئەوەی کە بەرپرسین بۆ ئەوەی دڵخۆشی بکەین. دەگەینە حاڵەتێك لە ئارامی. ئەمە بەو مانایە نییە کە نیرڤانا بەرامبەر بە وەستانی بیرکردنەوەیە. دەتوانرێت یەکێك لە هۆکارەکانی راستی ئەم مەسەلەیە لە ئەفسانەی بوودا بدۆزرێتەوە, بودا لەژێر داری هەنجیری پیرۆز گەیشتە نیرڤانا, لەگەڵ ئەمەشدا تا ساڵەها درێژەی بە ژیان و فێرکاری شەرع و ئایین دا.

گەیشتن بە نیرڤانا بە واتای چییە؟ تەنها بەم مانایەیە کە کارەکانمان چیتر سێبەری نەبێ. لەبەرئەوەی ئێمە لەم جیهانەداین پەیڕەوی (کارما)ین. یەك یەکی کارەکانمان پەیوەستە بەم بونیادە زەینییەوە کە ناوی کارمایە. وەختێ دەگەینە نیرڤانا, کردارەکانمان چیتر سێبەریان نییە" ئازادین. (سن ئاگۆستین) دەیگوت وەختێ کە رزگار دەبین هۆکارێك لە ئارادا نییە کە بیر لە خێر و شەڕ بکەینەوە. درێژە بە ئەنجامدانی کارە خێرەکان دەدەین, بێئەوەی بیری لێبکەینەوە.

(نیرڤانا) چییە؟ بەشێکی گەورە لەو بایەخەی کە ئاینی بودا لە خۆرئاوادا وەریگرتووە قەرزاری ئەم واژە جوانەیە. لەوە دەچێ کە شتێکی مەحاڵ بێت ئەم واژەیە شتێکی بەنرخی لەناو خۆیدا نەبێ. واتە زمانی نیرڤانا نەمان یان تاریکییە. وا دەزانرێت کە ئەو کەسەی دەگاتە نیرڤانا دەکوژێتەوە, بەڵام وەختێ کەسێك دەمرێت, سەرەتا نیرڤانایەکی گەورە روودەدات و پاشان لەناوچوون و نەمان, بەڵام خۆرهەڵات ناسی نەمسایی دەڵێت کە بودا سودی لە زانستی فیزیای سەردەمی خۆی وەردەگرت و لەو سەردەمەدا دیمەنی لەناوچوون بەشێوەیەکی دی بوو.

وا دەزانرا کە ئەو ئاگرەی دەکوژێتەوە, لەناو ناچێت بەڵکو درێژە بە مانەوەی دەدات, بە حاڵەتێکی تر پابەرجا دەمێنێتەوە. ئێدی نێرڤانا بە مانای لەناوچوون نییە, بەم مانایەیە کە ئێمە بەشێوەیەکی تر درێژە بە ژیان دەدەین, بەشێوەیەك کە ناتوانین بیهێنینە بەرچاومان. بەشێوەیەکی گشتی خوازەی عارفەکان بەشێوەیەکی جوت هەن" خوازەی بودااییەکان جیاوازن, وەختێ کەسێك سەبارەت بە نیرڤانا دەدوێت, دەربارەی شەرابی نیرڤانا یان گوڵی سوری نیرڤانا یان ئامێزی نیرڤانا قسە ناکات, بەڵکو بە دورگەیەك دەیشوبهێنێت, دورگەیەکی جێگیر کە دەرد و ئازارەکان دەورەیان داوە, بە بورج یان باخێك دەشوبهێنرێت. نیرڤانا شتێکە لە سەروو زاتەوە, ئەوپەڕی من و ئێمە.

ئـەو شـتەی ئەمشـەو وتومـە بابەتگـەلێکی کـەموکورت و پـەرش و بـڵاون. زۆر گەلۆرانـە دەبـوو ئەگـەر بـە مەبەسـتی نوانـدنی کـارێکی مـۆزەیی خەریکی شیکردنەوەی ئاینێك بووم کە ساڵانێك لـە تەمەنم بۆ تەرخان کردووە – و لـە راستیدا زۆریشـی لێتێنەگەیشـتم –. ئـاینی بـودایی کـارێکی مـوزەیی نییە, شـەقامێکە بـەرەو رزگـاری نـە لـەلای مـن, بـەڵکو لـەلای ملیونـەها مـرۆڤ, هیـوادارم ئەمشـەو قسـەکانم سەبارەت بە ئاینی بودا لەگەڵ ڕێزدا بووبێ.

## سەرنج

ئەم وتارە بەشێکە لەو چەند وتاربێژییەی کە ساڵی 1977 بۆرخس لە (بوینس ئایرس) داویەتی, ئەم وتارانە لەسەر کاسێت بڵاوکراونەتـەوە و لـە بازاڕدا بـە نـاڕەسمی فرۆشـراون, پاشـان خـودی بـورخس جـارێکی تـر بـەو وتارانــەدا چــووەتەوە و بــە یارمــەتی (بــارتۆلومیو) چاپیکردوون.

## پەراوێز

1–*Heraclitus* فەیلەسـوفی یۆنـانی سـەدەی شەشـەم تـا پێنجەمی پ.ز.

2–*Zeno* فەیلەسوفی یۆنانی سەدەی چوارەم تا سییەمی پ.ز بنیاتنەری قوتابخانەی رواقیەکان.

3–*James Joyce* (1882–1941) رۆماننووسی گـەورەی ئیرلەندی.

4–ئـەهلی *Ephesus* کۆنـە شـاری یۆنـان لـە خۆرئـاوای ئاسیای بچووك.

5–*Agamemnon* پادشای شاری یۆنانی کۆن کە لە شەڕی تەروادەدا پێشڕەویی دەکرد.

6–*orpheus* شاعیر و مۆسیقازانی ئەفسانەیی یۆنان.

7–*Empedocles of Agrigenzum* ئەمپدوکلس فەیلەسوف و سیاســەتمەداری یۆنــانی ســەدەی پێنجــەمی پ.ز ئەگریگنتوم شارێکی کۆنی باشووری سیسیل کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن *Agrigento*.

8–*plotinus* (205–270) فەیلەسـوفی رۆحـی (لەدایکبووی میسر).

9–*Rossetti Gabriel Dante* شـێوەکار و شـاعیری ئینگلیزی.

10–قوتابخانەی فەلسەفی رواقیەکان نزیکەی 300 ساڵ پـێش لـە زاینـی مەسـیح و فەیلەسـوفی یونـانی زنـو دروستی کرد. ئەم قوتابخانەیە دەڵێت پێویستە مرۆڤی عـاقڵ خـۆی لـە دلبەسـتەگی رزگـار بکـات. نەکەوێتـە ژێـر کاریگـەریی خۆشـی و ناخۆشـیەوە. ملکەچـی یاسـاکانی سروشت بێت.

11–*kalpa* سـەردەمێکە بە پێی زانینـی گەردووناسـانی هینـدی جیهـان گـیرۆدەی دەورەیـەکی دروسـت بـوون و لەناوچوون دێت.

12–*Vedas* چوار کۆمەڵەی شـەرعی سـروودە ئاینیـەکان, نزاو ئادابی خواپەرستی هیندیەکان.

13–*schopenhauer Arthur* (1788–1860) فەیلەسووفی رەشبینی ئەڵمانی.

14–*pergson Henre* (1859–1941) فەیلەسـوفێکی فەرەنسیە.

15–*George bernard shaw* (1856–1950) نووسـەری سوشالیستی ئینگلیزی لەدایکبووی ئیرلەندا.

16–*home David* (1711–1776) فەیلەسـوف و مێژووزانی ئوسکوتلەندی.

17–*Macedonio Fernandez* نووسـەری ئەرجـەنتینی کـە بـورخس دۆسـت و هـاوڕێی بـووە وەك خـۆی دەڵێـت زۆر کەڵکی لـێ دیوە.

## سەرچاوە

# لەگەڵ خورخە لویس بورخیسدا(1)

لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

## پێشەکی

لە نێوان ساڵانی 1984–1986 دا لە رادیۆی شاری "بوینس ئایرس"ەوە زنجیرە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خورخە لویس بورخیسدا ئەنجامدرا. گفتوگۆکان لە لایەن "ئوسوالدوفراری(2)" کە هاوڕێیەکی دێرینی بورخیس بوو سازدرا، گفتوگۆکان هەمەلایەن بوون، دەربارەی شیعر، نووسەرانی رووس، ڤۆلتێر، راسڵ، سپینۆزا، ئالوتسکی ژانو، هونەری شیوەکاری سەدەی نۆزدە و روناکبیری و شارستانی، ئەدگار ئالان پو، شکسپیر و گەلێك بابەتی تر، کە سەرجەم نەوەد گفتوگۆیان لێکەوتەوەو لە ڕۆژنامەی "تیمپوئارژانتینو" بلاوکرانەوە. پاشان کرانە سێ کتێب و هەریەکەیان سی گفتوگۆیان لەخۆ گرت. ئەم چوار گفتوگۆیە بەشێکە لە یەکەم کتێب کە ویدا فەرهودی کردوویەتی بە فارسی.

## گفتوگۆی یەکەم لە باری فێرکردنەوە

**ئوسوالدو فراری:** بورخیس تۆ دەزانیت، شتێکی ناجۆر لای من دروست بووە کە زۆر جار بیری لێ دەکەمەوە: تۆ کە ساڵانێکە بەردەوام دەرس دەڵێیتەوە، کەچی زیاتر لە قوتابی دەچیت تا مامۆستا، بە جۆرێکی دی تۆ زیاتر فێرخوازیت تا فێرکەر؟!

**بورخیس:** باوکم دەیوت: ئەوە منداڵەکانن داك و بابیان فێر دەکەن. من تەواو حەزم بە سمینارە، نازانم بۆ هەندێك مامۆستا حەزیان لەوەیە خوێندکاریان زۆر بێت، لە کاتێکدا کە تا قوتابی زۆر بێت گیروگرفت زیاتر دەبێت.

**ئوسوالدو فراری:** پۆلیش حاڵەتی جیاوازی لێدەبێتەوە..

**بورخیس:** وایە، من نزیکەی ساڵێك مامۆستای زانکۆی کاتۆلیکی شەقامی "کردوبا — *cordoba*" بووم، پاشان ئەو کارەم دایە لاوە، چونکە پۆلێکی چل دەقیقەیم هەبوو نەوەد خوێندکاری تیابوو، ئەدەبیاتی ئینگلیزیم پێدەوتن، ئەسڵەن نەمدەتوانی کارێکی تیا بکەم، چل دەقیقە هەر بەشی هاتن و چوون و جێگۆڕکێی ئەوانی دەکرد. کات دەڕۆیشت و کەس هیچی نەدەکرد. بە پێچەوانەوە، چاکترین شت ئەوەیە ئەوپەڕی شەش خوێندکارت هەبێت

(چوار یان پێنج چاکتره) بۆ ماوەی دوو سەعات. لەم حاڵەدا دەشێت کاری بەسوود بکرێت، من ئەم کارەم لە سەردەمی وانە وتنەوەی زمانی ئینگلیزی کۆن (ئەنگلوساکسون)دا لە کتێبخانەی میللی ئەنجامدا، ئێمە پێنج شەش کەس زیاتر نەبووین، ئەو کاتەیش کە لەبەردەستماندا بوو کراوە بوو، واتا بەرەهایی ئێمە زۆرمان کەڵک لێ وەردەگرت. پاشان کورسی مامۆستایی فەلسەفە و ئەدەبیاتم لە "ڤیمونتا – *Run Via monte*" دوای ئەویش لە "ئەندیپیندانس – *Run de lindependance*" وەرگرت.

**ئوسوالدو فراری:** من بزانم، بە چوار ساڵ وانە وتنەوەی سەرومڕ لەگەڵ چەند وتاربێژیەکدا ئەدەبی ئەرجەنتینیت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا تەواو کرد.

**بورخیس:** وایە، لە چوار زانکۆدا، لەگەڵ چەند وتاربێژیەك لە بارەی نووسەرانی ئەرجەنتینەوە، لە ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکای باکوردا، ئەم کارانە منیان شادمان دەکرد، بەڵام پاشان تێگەیشتم نووسینەوەی دەرس و وتاربێژی لە توانای مندا نیە (ئەوانی تریش لەمە گەیشتبوون) من گفتوگۆم لا پەسەندترە، هەر بۆ نموونە بە ڕێکەوت پێری شەو میوانی خانمێك بووم کە لە "ڤیلاکرسپو – *Villa crespo*" ئاتلیەیەکی[3] ئەدەبی هەیە، ئەو شەوە وەڵامی چەند پرسیارێکم دایەوە لە بارەی ئەدەبەوە. پرسیارەکان گونجاو و سەرنج ڕاکێش بوون، دوایی پێیان وتم گفتوگۆکە دوو سەعات و پێنج دەقیقەی خایاندوە، کەچی من هێندەم لا خۆش بوو وام هەست دەکرد تەنیا نیوسەعاتە.

**ئوسوالدو فراری:** بە هۆی پرسیارەکانەوە؟

**بورخیس:** بەڵێ، هەر لەبەرئەوە، لە ئێستادا من بەو ئەنجامە گەیشتووم، کە بۆ من شێوازی گفتوگۆ باشترە، هیوادارم بۆ گوێگر و خوێنەریش هەروا بێت (پێدەکەنێت).

**ئوسوالدو فراری:** پێدەچێت دەرس وتنەوە وەك کارێکی ناچاری کاریگەریەکی سەلبی لەسەر ئێوە هەبێت؟

**بورخیس:** بەڵێ کاری ناچاری واتا بێ توانایی کردنی وشە، گوێ بگرە، (با شتێکتان بۆ باسبکەم) (ئیمیلیو ئوریب – *Emilio oribe*)ی شاعیری ئۆرگوایی، کە یەکێك بوو لە هاوڕێکانم، لە کۆلێژی ئەدەبیات و فەلسەفەی (مونت ڤیدو) دەرسی فەلسەفەی دەوتەوە، پیاوێکی تۆکمە و بە هەیکەڵ بێ دەربەست بوو، ئەم هەڵکەوتنە وای لێکرد بوو تارادەیەك لە خۆی دڵنیا بێت، ئەوەی خۆی نەیویستایە نەیدەکرد، بیستم ڕەوشتێکی سەیری فێری خوێندکارەکانی کردبوو، پێش ئەوەی زەنگی کۆتایی دەرس لێبدرێت بە دە دەقیقە، ئەم پیاوە هەڵکەوتوە (کە تا ڕادەیەك لە ئەلمافویرت و سارمینتو) دەچوو، هەردوو چاوی دەنووقاند، خوێندکارەکان لەوە ئاگاداربوون کە دەرسەکەیان دە دەقیقە زووتر کۆتایی هاتووە و دەبێت پۆل بەجێبهێڵن. ئەم ڕەوشتە پەیڕەویی لێدەکرا، خوێندکارەکان مامۆستاکەی خۆیان دەناسی و، ڕێزیان لەو پیاوە هەڵکەوتوە دەگرت کە لە پشت مێزەکەیەوە دەمایەوە و خۆی بە خەوتوو دەدایە قەڵەم. ئەو خوێندکارانەی ئەمەیان بۆ گێڕامەوە مامۆستاکەیان خۆشدەویست، دەرکی ئەوەیان کردبوو کە بەشێوەیەکی سروشتی، چل دەقیقەی بەردەوام قسەکردن مرۆڤ ماندوو دەکات.

**ئوسوالدو فراری:** دەربارەی کۆنفرانسەکانت، نازانم ئەوەی من لێوەی دەزانم تەواوە یان نا؟ وابزانم یەکەمجار لە "قوتابخانەی ئازادی فێرکردنی باڵا" بوو.

**بـــورخیس:** وایـــە، دوای ئـــەوەی وازم لـــە کارەگەنیلەکەی سەرپەرشتکاری پەلەوەر هێنا، ئەو کۆلێــژە منــی بــۆ کۆنفرانســەکە بانگهێشــت کــرد. قۆنــاغی یەکــەمی وتاربێــژی یەکــەم پەیوەنــدی بــە ئەدەبیاتی کلاسیکی ئەمریکاوە هەبوو: بێگومان لە ئامرسـون و ملڤیـل و هـاتورن و ئـەمیلی دیکنسـون، هنری جیمز، تورو، والت ویتمان و ئەدگار ئالان پو وە دەستم پێ کرد پاشان هاتمە سەر لێکۆڵینەوەی ئاینی بودایی.

**ئوســـوالدو فـــراری:** پاشـــان لـــە "کـــۆڕی ئارجـــەنتینی لێکۆڵینـــەوەی کـــەلتووری ئینگلیـــزی" قسەت کرد.

**بورخیس:** بەڵێ، لەوێ هەم دەرسم وتەوە، هەم وتاربێژیـــەکی زۆرم کـــرد دوای ئـــەوەی لـــە گـــەلێك زانکـۆی تـر کـە زوربـەیان لـە "لاپلاتـا[4]" دان بـە تایبەتی لە زانکۆکانی کاسولیك. هەموو دەیانزانی من کاسولیك نیم، بەڵام بەهەرحاڵ بە درێژایی 45 دەقیقە منیان لەوە دەبەخشی کە کاسولیك نیم و بە ئازادییش قسە دەکەم. دیارە منیش هەوڵمداوە و دەیشی دەم زۆر رێز لەو پێزانینە بگرم.

**ئوسوالدو فراری:** دوایی لە کۆلیژی فەلسەفە و ئەدەبیات دەرست وتەوە.

**بـورخیس:** بـەڵێ، لـەوێ بابـەتی دەرسـەکانم ئەدەبیاتی ئینگلیزی و ئەمریکایی بوو، جێگرەکەم – جیم رست *Jame Rest* – کە ئێستا کۆچی دوایی کردووە، لێپرسراوی ئەدەبی ئەمریکایی بوو و من لێپرسراوی ئەدەبیاتی ئینگلیزی بووم. ئەم کارە لە چـوار کۆرسـدا تـەواو دەکـراو، بێجگـە لـە نـاوە ناســراوەکانی وەك چوســر (شـــاعیری ئینگلیـــزی 1340–1400) و دکتـــور جاکســـون (شـــاعیر و نووســەری ئینگلیــزی 1709–1784) و شەکسـپیر (شاعیر و درامانووسی ئینگلیزی 1564–1616) و بەرناردشـۆ (نووســەری ئیرلەنــدی 1856–1950) چــەند نووســەری تــری جیــاوازم پــێ ناســاندن. دەزانیـت، خوێنـدکارەکانی مـن ئەگـەر وای دابنـێن شتێکیان دەربارەی چسترتون (نووسەری ئینگلیزی 1874–1936) زانیبێت، بەڵام وەك نموونە لە بارەی بەرناردشۆوە هیچیان نەزانیوە، یان ئەگەر شتێکیان دەربـارەی شتیڤینوسـن (رۆماننووسـی ئینگلیـزی 1850–1894) زانیبێـت، چ ئاگایـەکیان لـە جـورج میردیـت (نووسـەر و شـاعیری ئینگلیـزی 1828–1909) نـەبوە. من هەوڵمدەدا نووسەری جیاوازیان پێبناسێنم، بەم جۆرە لە نێوان تنیسون (شاعیری ئینگلیــزی 1802–1892) و بــرونینگ (شــاعیری رومانتیکی ئینگلیزی 1812–1889) دوو دڵ بووم، بەڵام زوو لەوە بەئاگاهاتم کە بۆ خوێندکاران تنیسون زۆر گونجاو نیە، لە کاتێکدا کە برونینگ سەرنجیان رادەکێشـێت و، ئەمـەیش ئاسـاییە، چـونکە نرخـی تنیسون پێش هەرشتێك دەنگی شیعرەکانیەتی، وا نیە؟ مەبەستم ئەوەیە کە شیعرەکانی ئەو لە گوێدا خۆشـن، بـرونینگ بـە پێچـەوانەوەیە: هـەر شـیعرێك بێجگـە لـەوەی قارەمـانی راسـتی دادەهێنێـت لایـەنی هونەریشـی سەرسـامکەرە. یـەکێك لـە داهێنانـەکانی تری کە پاشان بووە مایەی چاولێکەری، گێڕانەوەی چیرۆکێکە لـە زمـانی چـەند پاڵـەوانێکی جیـاوازەوە، هەڵبـەت ویلکـی کـولێنز (رۆمـان نووسـی ئینگلیـزی 1824–1889) پێش ئەو لـە "بـەردی مـانگ"دا ئـەم کـارەی کردبـوو. لەوێـدا هەرکەسـایەتیەکی چـیرۆك بـاس لـە رووداوەکـە دەکـات و لـەوێوە لـە بـیری هەریەکەیان تێدەگەیت بە هۆی پەیوەندیەکانیانەوە. هـەموو ئەمانـە لـە راستیا لـە رۆمـانی نامـە گۆڕینـەوە یـان پەیوەنـدگیری سەرچـاوە دەگرێـت. ئـەم جـۆرە رۆمانـە ئێسـتا پەسـەند نیـە بـەڵام بـۆ خـۆی جـۆرە ئەدەبێکـە. لێرەدا بنـەمای بـیر لەسـەر حیکایـەتێکی

خەیاڵییە کە لە دووتوێیدا وەك ئالفونسوری (نووسەر و شاعیر و دیبلوماسی مەکسیکی 1889–1959) دەڵێت دیدگا و پەیوەندی و جیاوازی بیری پاڵەوانەکان دەناسرێتەوە.

بەڵێ, من بۆ ئەو ساڵانەی مامۆستاییم دڵتەنگم, ئەگەرچی ڕەنگە وەك مامۆستایەکی تەمەڵ یادم لێبکرێتەوە. گرنگ نیە, چونکە دەشێت عەشقی کارێکی هونەری یان نووسەرێکم لە دڵی خوێندکارێکدا چاندبێت (ناڵێم بە هەموو ئەدەبیات, چونکە ئەمەیان زۆر فراوانە).

**ئوسوالدو فراری:** جا ئەوەتان بەسە؟

**بورخیس:** من ژیان و وانە وتنەوەم بەبێ هوودە نەگرتوە.

**ئوسوالدو فراری:** ئەی ئەزموونتان لە بارەی کتێبخانەی میللییەوە کە هەژدەساڵ سەرپەرشتیتان دەکرد, ئایا هیچی لا بەجێهێشتوون؟

**ئوسوالدو فراری:** بەڵێ و دەبێت بڵێم یادوەریەکانم زۆر کاریگەرن, چونکە ئێستا, لە هەر شوێنێکی دنیابم, خەون بە گەڕەکی "مونت سیرا – *Montserrat*"ەوە دەبینم. وردتر بیڵێم بە کتێبخانەی میللییەوە, شەقامی "مەکسیکو" لە نێو شەقامەکانی "پیرو" و "بولیڤار"دا, بەڵێ شتێکی سەیرە کە هەمیشە خەون بەوێوە دەبینم, وەك شتێك لەو ساختمانە کۆنە لە مندا مابێتەوە. هەرچەندە هەقی ئەوەم نیە سیفەتی کۆنی بدەمە پاڵ چونکە مێژووی لەدایکبوونی ساڵی 1901ەو مێژووی لەدایکبوونی من 1899ە! لە دیدی مندا ساختمانێکی جوانە. بەهەرحاڵ برا بچووکمە بە نۆسەد هەزار بەرگی کتێبەوە و ئایا من بە درێژایی هەموو ژیانم ئەوەندەم کتێب خوێندۆتەوە؟ (پێدەکەنێت) نەخێر, دیارە نا, هەرچەندە سەرەو دەرەیەکم لەگەڵدا کردوون, بەڵام وا کە ئێستا من و تۆ بە تەنیاین دەمەوێت راستیەکت لا بدرکێنم, بێجگە لە چەند ڕۆمان و "مێژووی فەلسەفەی خۆراوا" ی برتراند ڕاسڵ[5] هیچ کتێبێکم لە لاپەڕەی یەکەمەوە تا دوا لاپەڕە نەخوێندۆتەوە. هەمیشە حەزم لە لاپەڕە هەڵدانەوە بووە, واتا هەمیشە بیرم لای ئەوە بووە کە دەبێت لە خوێندنەوەدا چێژێك وەربگرم, هیچ کاتێك وەك ئەرك و فەرمان شتێکم نەخوێندۆتەوە. بیری کارلایل (مێژونووس و خۆرهەڵاتناس 1795–1881)م دەکەوێتەوە کەوتبووی: ئەوروپاییەك (تەنیا یەك ئەوروپایی) توانیویەتی قورئان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بخوێنێتەوە. ئەو کارەیش هەست کردنە بە کارمەندی.

**ئوسوالدو فراری:** پێدەچێت تۆ هەر بەین بەینێك جارێکی تر بگەڕێیتەوە سەر هەندێك بابەتی ئەو کتێبانەی خۆشتویستوون. بێ ئەوەی بە تەواوی بیانخوێنێتەوە؟

**بورخیس:** نازانم, بڵێی تا ئەو ڕادەیە بەرەو پێش برۆم؟ (پێدەکەنێت) نامەوێت زۆر لەسەر خۆم بدوێم, بەڵام ئەوە تەواو ئاشکرایە کە دووبارەکردنەوە لە خوێندنەوە چێژی زیاترە. من وابەستەی توماس دوکونسی (نووسەری ئینگلیزی 1785–1859)م, ئێستا لێرە چواردە بەرگ کتێبم هەیە کە زۆر زوو کڕیومن و, دوای مردنیشم بێگومانم سەرنجی ئەوە دەدەن کە هەندێك لاپەڕەی ئەو کتێبانە دەستیان تێوە نەدراوە. ئەم مەسەلەیە, گەورەیی ئەو لە زەینی مندا کاڵ ناکاتەوە, تەنیا ئەوە پیشان دەدات کە یادم بەرەو لای هەندێك لە بەشەکانی ئەو کتێبانە گەڕاوەتەوەو چەند جارێکی تر خوێندومنەتەوە.

**ئوسوالدو فراری:** ڕەنگە تۆ هەندێکت لێخوێندبێتنەوەو ئەوی ترت هەڵگرتبێت بۆ دوایی؟

**بـورخیس:** ڕەنگـە، یـان دەشـێت توانـای ئـەو لاپەڕانـەی تـرم نـەبووبێت، لـە نێـوان ئەوانەیانـدا کـە زیاتر حەزم پێکردوون. دوێنـێ بابـەتێکیان بـە نـاوی "نووسـەر"ەوە بـۆ خوێندمـەوە، زۆرم لا خۆشـبوو، پـاش چـەند ڕستەیەك زانیم ئـەوە نووسینی خۆمـە، دوای ساڵانێك، بە سەرسامی و نرخاندنێکی زۆرەوە ڕووبەڕووی بووم. لەگەڵ خۆمدا بیرم کردەوە، سـەیرە بـورخیس ئەوسـا چـەند جوان نووسیویەتی! ئێسـتا زۆری داوەتە دواوەو ناتوانێت لەو جۆرە پەرەگرافانە بنووسێت، بەڵێ، ئەوسا دەمتوانی لـەو کارانـە بکـەم: دەمبینـی، دەمنووسـی، ڕەش نووسـم چـاك دەکـرد، دیسـان دەمخوێنـدەوەو ئەمـە وای لێـدەکردم ڕسـتەی درێژ، بە دەنگی جیاجیا بنووسم. ئـەمڕۆ نـا، دەبێـت ئـەمڕۆ هـەموو شـتەکان بـە هاوکـاریی یادەکـانم بهێڵمەوەو، ئەوەی دەتوانم، ڕزگاری بکەم،

**ئوسـوالدو فـراری:** ئەمـە دیـدی خوێنەرەکانت نیە!

**بـورخیس:** خوێنـەران زۆر دەستخۆشـی کـەرن، ستیفنسون (ڕۆماننووسی ئینگلیزی 1850-1894) دەڵێت: "خوێنەر لە ئێمە هوشیارترە" (پێدەکەنێت) ئەمە ڕاستیی تیایە.

**ئوسوالدو فراری:** نابێت چاوپۆشی لێبکەیت!

**بـورخیس:** نـەخێر، بـەڵام ئەگـەر دەستنووسـەکەمان هـەڵبگرین، بـۆ ماوەیـەك لـە چـەکمەجەی مێزەکەمانـدا فەرامۆشـی بکـەین و بەلایـەنی کەمـەوە دوای سـێ مـانگ جـارێکی دی پیابچینەوە، ئەوسا، ئێمە خۆمان دەبینە خوێنەرێکی لـە نووسـەر هوشـیارتر، وەك لـە بـیرم بێـت ئـەم مەبەسـتەم لـە بیـۆگرافی خـودی کیپلینـگ (ڕۆمـان نووسـی ئینگلیـزی 1865-1936) خوێندۆتـەوە: کیپلینگ چیرۆکی دەنووسی و لە شوێنێکدا دایدەنا، دوای ماوەیەك دیسان دەیخوێندەوە، هەڵـەی گـەورەو بچـووکی تیـا دەدۆزیـەوە، ئـەو پـێش بڵاوکردنـەوەی هـەر بەرهـەمێکی، لانـی کـەم سـاڵێك دەیهێشـتەوە تـا نووسـینەکەی کـۆك دەبـوو، مـن هەنـدێك جـار شـت دەنووسم و هەست دەکەم بەسـەریدا زاڵ نـیم. وایـش دەزانم توانـای چاککردنیم نیـە، کەچـی لـە پـڕا و لـە کـاتی پیاسـەی سـەر شـەقامێکدا، چارەسـەرەکەی ئەدۆزمەوە کە زۆریـش سادەیە، ڕەنگە هێنـد ئاسـان بێـت کـە هەسـتی پـێ نـەکرێت. بـۆ نموونـە (نامـەی فرێنراو)ی چیرۆکی ناوداری ئەدگار ئالان پۆ.

**ئوسـوالدو فـراری:** بـەم حسـابە تـۆ دوێنـێ خوێنەری چیرۆکی "نووسەر" بوویت؟

**بـورخیس:** بـەڵێ، ئەمـە ڕێکـەوتێکی بـاش بـوو. چونکە ئەو کتێبەم لە بیر نەمابوو، ئەم کتێبە چەند دەقێکـی کـورتی تیایـە کـە بـۆ کۆکردنـەوەی لـە بەرگێکـدا نەنووسـراوە و هەریەکـەیان وەڵامـی مەبەستێکن لە چرکەساتێکی تایبەتیدا، بۆیە ئەگەر تـەواو وردەکاریـان تیانـەکرابێت و ناتـەواویان تێکەوتبێت ڕەنگە زۆر خراپ نەبن.

**ئوسـوالدو فـراری:** تـۆ ئەوانـەت بـە مەبەست نووسیوە؟

**بورخیس:** بەڵێ.

## گفتوگۆی دووەم

## دەربارەی برتراند راسل

**ئوسوالدو فراری:** من لەو باوەڕەدام بیرمەندێکی هاوچەرخ کە ڕێنمایی تێگەیشتنی ئەم سەردەمەی کردبێت براتراند راسلە.

**بورخیس:** وایە بە تەواوی وایـە مـن "سـەرەتای فەلسـەفەی ماتماتیـك"ی ئـەوم چـەند جـار خوێندۆتـەوە. ئـەوە کتێبێکـی سـادەیە کـە

خوێندنــەوەی وەك هــەموو شــتەكانی تــری راســل، خۆش دەسـتە, لـە بیرمـە ئـەو كتێبـەم بـە قـەرز دایـە ئالفونسـوریس (شـاعیری مـەكزیكی 1889–1959) لەو كتێبەدا من بۆ یەكەم جار لێكدانەوەیەكی چاكم لەســـەر تیـــوری كۆمەڵـــەی ماتماتیـــك زانـــەكانی كــانتر (ماتماتیــك زانـــی ئـــەڵمانی 1845–1918) خوێنـدەوە. كـە بـەڕای مـن باشـترین لێكۆڵینـەوە و چـــاكترین پێشـــوازی لێكـــراوە. زۆر ســـەرنجی ئالفونسوریشی راكێشابوو.

هەمیشـە ئـەو پرسـیارەم لێدەكـەن ئەگـەر قـەرار بێت تەنیا كتێبێك لەگەڵ خۆمدا بەرمە دوورگەیـەكی چۆڵەوە چ كتێبێك هەڵدەبژێرم؟ (دوورگەی هاوبەشـی ژورنالیســـــتەكان) لــــە ســــەرەتادا بــــیرم لــــە ئینسـكلوپیدایەك كـردەوە. نـازانم ئایـا دەبێـت دە دوانـــزە بـــەرگ كتێـــب لەگـــەڵ خۆتـــدا بـــەریت (پێدەكـەنێت) پاشـان كتێبـی "مێـژووی فەلسـەفەی خـۆراوا"ی براترانــد راســـڵم بــۆ ئـــەو دوورگەیـــە هەڵبژارد. وەلـێ دوورگەیەك بەو دیمەنە جوانەیەوە بـوونی نیـە, وانیـە؟ (پێدەكـەنێت) كتێبەكـەم هەیـە, بەڵام تەنیا ئەوە بەس نیە.

**ئوسوالدو فراری:** دەبێت یەكێكت لەگەڵدا بێت بۆ خوێندنەوەی كتێبەكە.

**بورخیس:** ڕاستە, پێم خۆشە لە بارەی كتێبەوە یادم هاوكارم بێت. ئەگەر یادم تەواو بوایە كتێبەكەم هـەبوو. هەنـدێك جـار بـیر لـەوە دەكەمـەوە لـە نێـو موسـوڵمانەكاندا, ئێسـتا, كەسـانێك هـەن قورئانیـان لەبـەرە, ئەوانـە زۆرن, وشـەی "حـافظ" بـەو كەسـە دەڵێن كە یاد (حافظة)ی چاكە. بـە تایبـەت لـە بارەی قورئانـەوە. ئێسـتا شـێوازێكی فێركـردن هەیـە كـە خوێنـدكار ناچـار ناكـات مانـای كتێبەكـە بزانێـت (تەنانـەت دەشـێت منداڵ بێت) ئـەو تـەنیا بـە زەینـی خـــۆی دەســـپێرێت. ئەگـــەر منـــیش بمتوانیایـــە لـەو شـێوازە بـەرخوردار بوومایـە خۆشـبەختیەكی گـەورە بـوو, چونكە ئەوسا دەمتـوانی زۆر كتێبم لـە یـادا بمایەتـەوەو ئێسـتا بمخوێندنایەتـەوەو لێیـان بگەیشـتمایە, ئەمـە باشـترین چارەسـەر بـوو, چونكە ئەگـەر مـن بـەو شـێوازە بـە منـداڵی كتێبـی (مێـژووی فەلسەفەی خۆراوا)ی ڕاسڵم بخوێندایەتەوەو لە یادما بمایـــە, تەنانـــەت ئەگـــەر شـــتێكی زۆریشـــی لـــێ تێنەگەیشتمایە, ئێستا دەمتوانی بگەڕێمەوە سەری.

**ئوســـــوالدو فـــــراری:** یـــادت دەیتـــوانی بیخوێنێتەوە.

**بورخیس:** بەڵێ, یـادم دەیتـوانی بیخوێنێتـەوە, ئەمە بۆ ئـەو كەسـانەی كـە وردە وردە كوێردەبن زۆر كـارێكی باشـە. بـۆ منـیش هـەروا دەبـوو. بـە داخـەوە ئـەو شانسـەم نـەبوو, منیـان ناچـار ئـەكرد بخـوێنم و تێبگەم, بە پێچەوانەوە ئەگەر لەسـەر ئـەو یـادە ڕایـان بهێنامایە, دەمتوانی ئەمڕۆ هەموو ئـەو كتێبانـەی كـە زۆر لـێم دورن بیانخوێنمـەوە, بۆیـە وتم, گـەلێك لـە نـــاوی بەرهەمـــەكانی راســـڵم زانـــی و كتێبـــەكانیم خوێندەوە, راسڵ لەو بەرهەمانەیدا بە ڕوونی باس لە ڕەوشتی فەلسـەفی خـۆی دەكـات. بـەڵام هەمیشـە مـن خۆم لە دەرەوەی ئەوانـەدا دەبینی, مەبەستم ئەوەیـە كـە هـەر لاپەڕەیـەك لـە چـوار چێوەی خوێندنـەوەدا تێدەگەیشتم, بـەڵام كە دەمویسـت لـە زەینمـدا كۆیـان بكەمەوە, خۆم زۆر بە ناكام دەبینی.

**ئوســـوالدو فـــراری:** ئـــەم شـــێوازەی راســـڵ چ بیرێكی لە تۆدا دروست كرد؟

**بـــورخیس:** لـــە دیـــدی منـــدا سیســـتمێكە لۆژیكیی و زۆر ئاڵۆز, هەرچۆنێك بێت ئێستا ناتوانم بەرجەستەی بكەم.

**ئوسوالدو فراری:** وا ئەزانم داهێنـانی راسڵ لە دیــدی كــردار و ڕەفتــار و كۆمــەڵگا و سیاســـەتی سەردەمەوە, سەرنجی تۆیان راكێشاوە.

**بورخیس:** وایە، من وای بیر لێدەکەمەوە ئەو کەسێکی تەواو ئازادە کە توانیویەتی لە وەهمە ئاساییەکانی زەمانی ئێمە رزگاری بێت. بۆ نموونە وەهم لە بارەی میللیەتەوەو.. لە هەموو ئەمانە ئازادە، راسڵ کتێبێکی تری هەیە بە ناوی "بۆ من مەسیحی نیم؟" لەبەر ئەوەی کە منیش مەسیحی نیم، دەستم بە کتێبەکە کرد، بەڵام هەستم کرد بێهودەییە بۆیە وازم لێهێنا، چونکە بۆ مەسەلەی بە مەسیحی نەبوون پێویستم بە بەڵگەکانی ئەو نەبوو.

**ئوسوالدو فراری:** دیدگای تۆ لەگەڵ ئەودا، لە بارەی دەوڵەتیشەوە وەك یەکە.

**بورخیس:** وایە، وەك یەکە، ئەم دیدگایە پەیوەندی بە تاکگەرایی ئینگلیزیەوەیە چونکە ئێمە.. یەکێك لە باوکانی ئانارشیزم سپینسەرە (فەیلەسوفی ئینگلیزی 1820-1903)

**ئوسوالدو فراری:** لە یادمە تۆ کتێبی "لێگەڕێن خەڵك بیر بکاتەوە"ی راسڵ، کە کۆمەڵە وتارێك بوو دەتخوێندەوە، لە بیرتە؟

**بورخیس:** بەڵێ، زۆر دەمێکە، وانییە؟

**ئوسوالدو فراری:** ناوی یەکێك لە وتارەکان "بیری ئازاد و راگەیاندنی رەسمی" و ئەوی دی "شەجەرەنامەی فاشیزم"ە.

**بورخیس:** وایە، من لەگەڵ راسڵدا تەواو هاوڕام، وای بۆ دەچم کە فیختەو کارلایلیش[7] لەو شەجەرەنامەیەدا ئامادەگیان هەیە.

**ئوسوالدو فراری:** تەواو وایە.

**بورخیس:** بیری نووسینێکی چیسترتون[8]م کەوتەوە کە نووسەر لەوێدا بیر و باوەڕەکانی هیتلەر بەوە دەداتە قەڵەم کە مۆدیان بەسەرچووەو، لەگەڵ فەزای "ڤیکتوریایی"دا دەیانگونجێنێت، لە ڕاستیا وایشە.

**ئوسوالدو فراری:** لێرەدا بەو ئەنجامە دەگەین کە رووداوە فیعلیەکان، سەرچاوە لە تیورەکانی رابوردوو وەردەگرن.

**بورخیس:** منیش دەڵێم سیاسەتمەداران، بەم پێیە دوا دزی ئەدەبی یان موریدی نووسەرانن، هەڵبەتە بە زۆری دوای سەدەیەك یان زیاتر، ئەوەی بە واقیعی ئێستای دەزانین لە هەقیقەتدا موزەیەکی دێرینەیە. بۆ نموونە ئێمە هەموو بە دیموکراسی سەرسامین، باشە، ئەمانە دەمانگێڕنەوە بۆ پین[9] و جفرسون[10] (پێدەکەنێت) بەوەیش کە ساڵی 1855 لە دیوانی "گەڵاکانی گیا" دا بۆ ویتمان[11] سەرگەرمکردنێك بوو، ئەمانە راستیەکانی ئەمڕۆن.

بەم جۆرە سیاسەتمەداران، خوێنەرانێکی دواکەوتوون، وانیە؟ خوێنەرانێك سەردەمیان تێپەڕیوە، خوێنەرانی کتێبخانە کۆنەکان، وەك ئێستای من!

**ئوسوالدو فراری:** ڕەنگە هەر ئەمانە ئەم رستەیەیان بە ئێوە وتبێت "هەقیقەت هەمیشە هەڵەیەکی مێژوویی لە دواوەیە"

**بورخیس:** ئەمە رستەی کێیە؟

**ئوسوالدو فراری:** هی تۆیە (پێدەکەنێت)

**بورخیس:** وا ئەزانم تۆ هەر ئێستا ئەمەت بە دیاری داوە بە من.

**ئوسوالدو فراری:** نا! نا!

**بورخیس:** من ئەو ڕستەیە دەسەلمێنم، وەلێ وا هەست ئەکەم هی یەکێکی تر بێت، من ئاسایی ئەوەی دەیخوێنمەوە لەگەڵیا تەبام، نەك ئەوەی خۆم دایدەهێنم، ڕستەکە چۆن بوو؟

**ئوسوالدو فراری:** "هەقیقەت هەمیشە هەڵەیەکی مێژویی لە دواوەیە"

**بورخیس:** ئایا من ئەمەم پێوتوون؟

**ئوسوالدو فراری:** لە لێکۆڵینەوەیەکدایە کە دەربارەی "شەجەرەنامەی فاشیزم"ی راسڵ نووسیوتە.

**بورخیس:** باشە. کەواتە لەوێدایە, راستیەکە ئەوەیە ئەو کتێبە بۆ من زۆر سەرسوورهێنەرە (پێدەکەنێت) ئەگەرچی تەمەنی نووسینی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە کەچی هێشتا لای من تازەیە.

**ئوسوالدو فراری:** تۆ لەو وتارەدا, لێکۆڵینەوەت لەسەر کتێبێکی ویلز[12] و کتێبێکی راسڵ کردووە.

**بورخیس:** وایە, ئەو وتارە لە "لاناسیون"[13] دا چاپ کراو راسڵ لەو باوەڕەدا بوو کە دەبێت خەڵکی فێری هونەری ڕۆژنامە خوێندنەوە بکرێت.

**ئوسوالدو فراری:** زۆر راستە.

**بورخیس:** ڕستەکەیان گۆڕی, چونکە دەبوو لاناسیونیش بگرێتەوەو نووسیان: "هونەری خوێندنەوەی هەندێك لە ڕۆژنامەکان" ئەمە ناونیشانێك بوو نووسەران خۆیان لێ ئاوارتە (استثناء) دەکرد (پێدەکەنێت) لە بیرمە بە درێژایی جەنگی جیهانی یەکەم — کە ئێمە هیواداربووین دوا جەنگ بێت, دەمانخوێندەوە ئەڵمانەکان پەلاماری گوندێکیان داوەو دەستیان بەسەراگرتوە, دوو سێ ڕۆژ دوای ئەوە هاوپەیمانەکان ڕایان دەگەیاند کە پەلاماری ئەڵمانەکان ناکام بوەو زیاد لەو شارەی گرتوویانە نەڕۆیشتوون. ئەمە دوو دەربڕینی جیایە بۆ یەك ڕووداو.

**ئوسوالدو فراری:** راستە.

**بورخیس:** راسل دەیویست هەر لە پێشەوە خوێنەر لە بەرانبەر ئەو جۆرە هەڵانەدا ئامادەگی هەبێت.

**ئوسوالدو فراری:** بە وەدیهێنانی "بیری ئازاد و ڕاگەیاندنی رەسمی" بەڵام لە دواییدا..

**بورخیس:** باشە, من وا دەزانم لەم وڵاتەدا, ئێمە هەندێك شت فێر بووین, وا نیە؟ ڕەنگە زیاد لە پێویست, یان هەموو شتێك و, ئێمەیش قەرزاری ئەو راگەیاندنانەین.

**ئوسوالدو فراری:** بەوپەڕی سەرسامیەوە, راسڵ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە سەدەی هەژدە مەنتیقی بوەو سەدەکەی ئێمە نامەنتیقیە, لە ڕاستیا دەڵێی ئەو بابەتەی لە سەردەمی خۆیدا, بەرانبەر بە فاشیزم و نازیزم نووسیوە؟

**بورخیس:** هەروەها بەرانبەر بە گەلێك شتی تریش: بەرانبەر بە "سوریالیزم" بەرانبەر بە کەلتوری چەواشە, بەرانبەر بە لەناوچوونی هەندێك لە جۆری شیعر و پەخشان و لە نێوچوونی نیشانەی خاڵبەندی کە داهێنانێکی هەڵخەڵەتێن بوو. وا نیە؟ (پێدەکەنێت)

**ئوسوالدو فراری:** راسڵ ئەوەیشی دەوت کە لە سەردەمی ئێمەدا ئازادی تاك ئەوەندە هەڕەشەی لێ دەکرێت کە هیچ کاتێك لە سەدەی حەڤدە بەملاوە ئەوەی لەگەڵ نەکراوە. وەلێ دووبارەی ئەکەمەوە. دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت کە ئەم گوتارە پەیوەندی بە سەردەمێکەوە هەیە کە نازیزم و فاشیزم لەوپەڕی گەشەسەندنا بوون.

**بورخیس:** ئەم پێشڕەویە هێشتا تەواو نەبوە.

**ئوسوالدو فراری:** تۆ وای بیر لێدەکەیتەوە؟

**بورخیس:** من ئەوەیش دەڵێم یەکێك لە هۆکارە زۆر ناخۆشەکانی, ئەو شتەیە کە لە یەکێتیی سۆڤیەت "کومونیزم"ی پێدەوترێت, نا؟ ئەمە جۆرێکی توندتری فاشیزم و دەستتێوەردانی دەوڵەتە. مەبەستم لەو زۆرانبازیەیە کە لە کتێبی "تاك بەرانبەر بە دەوڵەت"ی سپنسەر[14] دا باسکراوە. ئاشکرایە ئەو وڵاتەی کە

دەوڵەت لە هەموو شوێنێکیدا ئامادەیە، وڵاتی شورەویە.

**ئوسوالدو فراری:** لە وڵاتانی خۆراوایشدا، وەك تۆ زۆر جار باسیان دەکەیت، هەمیشە دەوڵەت هەڕەشەمان لێ دەکات.

**بورخیس:** رەنگە ئێستایش لە حاڵەتی هەڕەشە لێکردنماندا بێت (پێدەکەنێت) هەر لەم شوێنەدا کە من و تۆ قسە پێکەوە دەکەین.

**ئوسوالدو فراری:** لایەنێکی تری راسڵ ڕووبەڕوو بوونەوەیەتی لەگەڵ ئاینـدا، نەك تەنیا ئاینی مەسیحی، بەڵکو لەگەڵ دیاردەی ئاین بە گشتی، بێگومان کتێبی "ئاین و زانست" تان لە یادە؟

**بورخیس:** بەڵێ، زۆر دەمێکە خوێندومەتەوە بەڵام لە بیرم ماوە، بەلامەوە ئاشکرا دژایەتییەکی تیایە، من لەوە دڵنیام کە بە درێژایی مێژوو، هەر دینە خۆی بە دەستەوە دەدات، بۆ نموونە کاتێك هیلەربلوك[15] وەڵامی ویلز[16] دەداتەوە. لە قسەکانیا گومانی لە تەکامولی بوون نیە، بەڵام بڕوای بەوەیە کە هەموو شتێك لە "ئیلاهیات"[17] وەکەی سنت توماس داکاندا[18] هەیە، بە هەرحاڵ، ئەمە لە هەر "پێنج ئینجیل"ە بەراییەکەدا نیە. لە راستیا ئاین، رۆژ بە رۆژ وردتر دەبێتەوە، تەفسیری زانست دەکات و دەیەوێت زانست لەگەڵ خۆیدا بگونجێنێت، ئەگەر ئەمە لەگەڵ کتێبە پیرۆزەکاندا ڕێك نەکەوت، پەنادەباتە بەر زانستە جۆربەجۆرەکانی تری ئیلاهیات. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، سەرکەوتن هەر بۆ زانستە.

## گفتوگۆی سێهەم
## لە بارەی شیعری -مەزەندە-وە

**ئوسوالدو فراری:** بورخس، من زۆر پەرۆشی شیعرێکتم کە "لە هەڵبژاردەکانی شیعری خۆت"دا داتناوە، تا پێکەوە بیخوێنینەوەو باسی لەسەر بکەین، لە ڕاستیا ئەو هەڵبژاردەیە نیشانەی دەربەست بوونتە بەو شیعرانەوە.

**بورخیس:** رەنگە جۆرە خۆبەدەستەوەدانێك بێت، وا نیە؟ چونکە لە کۆکردنەوەی هەڵبژاردەیەکدا، مرۆڤ ناچارە دیدێکی فراوانیشی هەبێت. بەهەرحاڵ من خۆم داوەتە دەستەوە، هیوادارم زۆر درێژ نەبووبێت.

**ئوسوالدو فراری:** ئەو شیعرەی من مەبەستمە زۆر هەقی بەسەرمانەوە هەیە، چونکە دیدگایەکی مێژویی و گونجاومان دەداتێ. دەڵێیت مێژوو لە باتی تۆ یان تۆ لە باتی مێژوو قسە دەکەیت، دیارە دەزانیت مەبەستم شیعری مەزەندە "گمانگونە"یە.

**بورخیس:** ئا، بەڵێ، کە ئاوا دەست پێدەکات: "فیشەکەکان لە دوا شێودا بە دەنگ دێن" ئاشکرایە کە من بە دەستی ئانقەست "دوا شێو"م داناوە کە رازێکی تیایە، چونکە دەشێت بە مانای کۆتایی شەو بێت یان بە مانای دوا شەوی قارەمانی شیعرەکە، ئەو خزمە دێرینەیەم، واتا لاپریدا.

**ئوسوالدو فراری:** دەستپێکی شیعرەکە بەم جۆرەیە: "فرانسیسکو لاپریدای ماف زان، کە لە 22ی سیپتامبەری 1829دا بە دەستی مونتونرس دالداو دەکوژرێت، پێش مەرگ بیر ئەکاتەوە..."

**بورخیس:** بەڵێ ئەو کاتەی من ئەم شیعرەم تیا دەنووسی، دەمزانی لە ڕووی مێژوییەوە کێشەیەکی تیایە، تەنیا لە حاڵێکدا نەبێت کە لاپریدا وەك سەمبولێك بخەینە بەرچاو. لەو سەردەمەدا، شیمانەی ئەوە هەبوو کە بیروباوەڕی ئەو گۆڕا بێت

یـان پەراگەنـدە بووبێـت. بـێ لـەوە قسـە قووڵـەکانی دانتەیش دەشیا نەوترانایە.

**ئوسـوالدو فـراری:** بـەڵام بـە درێـژایی شـیعرەکە جۆرێك پەیوەستەگی مێژوویی هەیە:

فیشەکەکان لە دوا شیعردا بە دەنگ دێن

بادێت, خۆڵەمێشەکان بەدەم باوە پەروازیانە..

**بورخیس:** نازانم دەتوانرێت ئەوە بوترێت یان نـا؟ وەلـێ بەرهـەحاڵ لـە گوێـدا خۆشـە و لـە دیـدی جوانناســیەوە, دەتوانێـــت دەلیـــل بێـــت. نـــازانم خۆڵەمێشــەکان بــۆ لەوێــدا هــەن, ڕەنگــە بەڵگــەی ئاگرگرتنی شوێنێك یان شتێك بێت. گرنگ نیە. وای بۆ دەچم خـەیاڵی خوێنـەر, ئەو خۆڵەمێشـە دوور لـە واقیعانە قبووڵ بکات, وا نیە؟

**ئوسوالدو فراری:** (پێدەکەنێت) وایە.

ڕۆژ و شەڕی دزێو پەراگەندە دەبن

سەرکەوتنیش لە دەستی دوژمندایە.

**بورخیس:** "دزێو" بۆ "شـەڕ" وەك سیفەتێکی نـامۆ دێتـە بەرچـاو, بـەڵام "پەراگەنـدەبوونی ڕۆژ و شەڕ" بەلای منەوە باشە.

**ئوسـوالدو فـراری:** زۆر چاکە "بێگانـەی دڕنـدە زاڵ بووە, گوشو[20] سەرکەوتووە"

**بورخیس:** بەڵێ, من بـەوردی پـێم خۆشبوو کە بێگانــەی دڕنــدە و گوشــو هــاو واتــابن, چــونکە بــە داخەوە تا ئێستا ئاینی گوشو ڕەواجی هەیە.

**ئوسـوالدو فـراری:** پاشـان لاپریـدا بـە مەزەنـە قسە دەکات:

"مــن کــە یاســا و ڕێ و ڕەسمــە مەزهەبیــەکانم خوێندۆتــەوە بــەڵێ. مــن فرانسیســکو نارســیزو دولاپریدا

کە دەنگی, سەربەخۆیی ویلایەتەکەی ڕاگەیاند

مـن, ژێـر کـەوتووم. بـە ڕوویـەکی ئارەقاویـەوە کـە پەڵەی خوێنی پێوەیە

بێ ئومێد, بەڵام بێ هیچ ترسێك, هەڵدێم, لـە دەست چووم

هەڵدێم بەرەو باشوور

بە ناو دوا گەرەکەکاندا.."

**بورخیس:** خۆشحاڵم کە بەرەو باشوور دەچێت چـونکە بـە ئیسـپانی واژەی باشـوور بـە پێچـەوانەی خۆرئـاوا یـان خۆرهەڵاتـەوە دەنگدانـەوەی ئـاوازێکی بـــەهێزە.. بـــاکووریش کـــەمێك چـــاکترە.. بـــەڵام خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا نـا. هەڵبەتـە دەتوانیـت ئەوانـە بگۆڕیـت بـە دوو وشـەی تـر کـە بـە "ئیسـپانی وڵی" خۆشتر بێت.

**ئوســـوالدو فـــراری:** ".. ڕاســت وەك ســەردار پورگـاتوار *purgatoire* کـە هـەر بـە پـێ هەڵـدەهات و دەشتەکەی خوێناوی دەکرد.."

**بورخیس:** بەیتێکی باشە, چونکە هـی مـن نیـە, هی دانتەیە و من بێ کێشە وەرمگێڕاوە.

**ئوسوالدو فراری:**

"... کە مەرگ کوێری کرد و لە پێی خست

لەو شوێنەدا کە ڕۆخانەیەکی تاریك. نـاوی خـۆی لـە دەست دەدات..

هــــەر ئــــاوا منــــیش دەکــــەوم, گەیشــــتوومەتە خۆڵەدەستدان

تـاریکیی کـەناری زەلکـاو بۆسـەی بـۆ ناومەتـەوەو دەموەستێنێت

دەنگی پێڵاوە دارینەکانی مەرگی گەرم دەبیستم

لەگەڵ سوارەکان. ئەسپ و نێزەکانیاندا بەدوامەوەن

من دەمویست جۆرێکی تر بم

خەوم بە ئینسانی بوونەوە دەدی

من کە لە نێو یاسا و ئەحکامی کتێبەکانمدا دەژیام

لـە ژێـر ئاسمـانی کراوەدا, بـە سـادەیی لـە نـاو قوڕدا وشك هەڵدێم

وەلێ سنگم, بێ ئەوەی کەسێك فەرمانی دابێتێ

پڕ پڕە لە خۆشیەکی شاراوە.
سەرئەنجام لەگەڵ چارەنووسی ئەمریکای باشوردا،
ڕووبەڕوو دەبمەوە"

**بورخیس:** وایە، ئەمە باشترین دێڕە، ئەم شیعرە لە کاتی بڵاوبوونەوەیدا، تەنیا پەیوەندی بە مێژووی رابوردوەوە نەبوو، لەگەڵ "ئێستا"یشدا پەیوەندی هەبوو، چونکە دیکتاتۆرێك دەسەڵات بە دەسەت و، ئێمەش هەموو خۆمان لە بەرانبەر چارەنووسی ئەمریکای باشووری خۆماندا دەبینیەوە. ئێمە کە دەمانویست "پاریس"ێك بین بێجگە لە ئەمریکای باشوور چی تر نەبووین، لەو سەردەمەدا. ئەوانەی ئەم شیعرەیان خوێندبووەوە، وایان هەست دەکرد شیعری ئێستایە: "سەرئەنجام لەگەڵ چارەنووسی ئەمریکای باشورمدا دیدار ئەگرم" مەبەست ئەوەیە کە دانیشتوانی ئەمریکای باشوور غەمگینترین و زەحمەتکێشترین کەسن.

**ئوسوالدو فراری:** بەلام لەو بەیتەدا ئەنجامگیریەکی میتافیزیکیانە بۆ تەقدیرکراوە، چونکە لە ئێستادا هەموو ئێمە دەزانین کە سەرئەنجام، لە چرکە ساتێکدا ئەو چارەنووسە دەردەکەوێت (چارەنووسی ئەمریکای لاتین).

**بورخیس:** من وای بۆ دەچم کە ئەو چارەنووسە ئاشکرا بووبێت و بە چاکی ئەوەمان زانیوە. وانیە؟ سەیریشە مرۆڤ ئارەزووی شتێکی وای هەبێت. ها؟ چونکە لە رابووردودا ئەمریکای باشوور سەرزەمینێکی دورو سروشتێکی تایبەتی جوانی هەبوو، ئەمڕۆ وا نیە، ئەمڕۆ ئێمەی خەڵکی ئەمریکای باشوور، دەبێت ئەم "بوون"ە بپارێزین و خۆمان بە شایستەی چارەنووسێك بزانین کە هەرچۆنێك بێت هی خۆمانە.

**ئوسوالدو فراری:** بەڵێ، بەردەوام دەبم.
"بەرەو ئەو شەوەی لە ئاوابووندایە
کە ئەم هەنگاوە نادیارانە دەجووڵێن
ئەو هەنگاوانەی لە سەردەمی منداڵیەوە
ڕۆژ بە ڕۆژ خۆم، هەموویانم چنیوە.
سەرئەنجام کلیلی نهێنی ساڵەکان
کە لەلایەن فرانسیسکو دولاپریداوە
لەبەردەم چارەنووسدایە
بە چاو دەبینم
قسەیەك کە کەمەکێکم لە بارەی وێنەیەکی کامڵەوە
دەزانی کە تەنیا خودا لە سەرەتاوە دەیناسی
لە ئاوێنەی ئەمشەودا، بێ هیچ گومانێك
ڕووی ئەبەدی من دەردەکەوێت
بازنەکە ڕوو لە داخستنە، من چاوەڕێم..."

**بورخیس:** شیعرێکی باشە، نا؟ شیعرێکی باشە، تەنانەت ئەگەر منیش شاعیرەکەی بم!

**ئوسوالدو فراری:** تابێت چاکتریش دەبێت (پێدەکەنێت)

**بورخیس:** هەڵبەت بە هاوکاری تۆوە کە بە بڕواو سۆزەوە دەیخوێنیتەوە.

**ئوسوالدو فراری:** وا کۆتایی پێدێت:
"هەنگاوەکانم لە سێبەری نێزەکانیاندا
کە بە دوای منەوەن، دەجووڵێت
مەرگی من، بە گاڵتەجاڕیەکەی خۆیەوە
لەگەڵ سوارەکاندا، ئەسپ و یاڵیان
هەڕەشەم لێ دەکەن.. ئەمەیش یەکەمین لێدان،
ئاسنی ئاودراوەو سنگم لەت دەکات و
چەقۆی ئاشنا بە گەرومدا ڕۆدەچێت".

**بورخیس:** باشە، من مەنەلۆژەکان و دراماتیکەکانی برونینگ[21]م خوێندبوەوەو، بەلامەوە چاکبوو منیش کارێکی وا بکەم، لەگەڵ ئەوەیشدا کە شیعرەکە وابەستەی (بوون)ی لاپریدایە و لەگەڵ ئەودا تەواو دەبێت. بە جۆرێکی دی شیعرەکە بەوە

کۆتایی دێت ئەو کەسەی هەستی پێدەکات و بیری پێدەکاتەوە, دەمرێت ".. چەقۆی ئاشنا بە گەروومدا رۆدەچێت" دوا بەیتی شیعرەکە و دوا چرکەساتی هوشیاری ئەوە, بەلای منەوە ئەمە هێزێکی داوەتە شیعرەکە, وا نیە؟

**ئوسوالدو فراری:** بێگومان وایە.

**بورخیس:** هەرچەندە, بێ چەند و چوون, هەموو ئەمانە بە ناواقیعی دێنە بەرچاو, چونکە دوا چرکەکانی لاپریدا, لە ژێر سووسەی بکوژەکانیدا, زیاتر وا پێدەچێت کەمتر عەقڵانی و قابیلی پێشبینی کردن بووبن. بێگومان ئەو هەندێك شتی دیوە, بیستوویەتی و لەگەڵ خۆیدا بیری لێکردۆتەوە کە ئایا ئەم بەرئەنجامانە دەبن بە ڕاستیی یان نا. بەڵام ئاخۆ هێنانەوەی ئەم بەڵگانە بۆ شیعر پێویستە؟ چاکترە وای بیر لێبکەینەوە ئەو تارادەیەك بە روونی هەموو شتەکانی بۆ شیعرەکە دیوە. کەم تا زۆرێك لەگەڵ وشە و ڕستەکاندا گونجاندوویەتی. ئەگەر ئەوە شیعرێکی ریالیستی بوایە, واتا ئەوەی جۆیس[22] بە مەنەلۆژی ناو دەبات, زۆرشتی لەدەست دەدا, وەلێ واچاکترە هەڵە بێت, واتا "ئەدەبی" بێت!

**ئوسوالدو فراری:** لەگەڵ ئەمانەیشدا, هەندێك لە حاڵەتەکانی دەشێت بۆ هەموومان واقیعی بن, بۆ نموونە تۆ دەڵێیت: "دووبارەبوونەوەی هەنگاوە نادیارەکان, ئەم چارەنووسەی تەنیوە"

**بورخیس:** هەڵبەت, منیش کە ئەم هەموو وڵاتە جیاوازانەم بە چاوی رووناکی خۆم دیوە, بۆ گەیشتن بە هەنگاوی دوایی چەند هەنگاوێکم ناوەو, ئایا ئەو هەنگاوی کۆتاییە کە هێشتا نازانم چیە, لە هەلێکی رەخساودا بۆم ئاشکرا دەبێت؟ من وای بیر لێدەکەمەوە زۆر زوو ئەو سەردەمە بگات, چونکە کە مرۆڤ پێ دەخاتە تەمەنێکی دیاریکراوەوە, لە هەر چرکە ساتێکدا دەشێت مەرگ بەرۆکی بگرێت, یان بەلانی کەمەوە بەردەوام ئومێدی ئەوەی لێ دەکرێت.

**ئوسوالدو فراری:** یان ئومێدی بەردەوام بوون لە سەفەرەکەدا!

**بورخیس:** وایە, یان شیمانەی بەردەوام بوون لەسەر سەفەر, هیچ کەس نایزانێت, بە حساب دەبێت ئێستا ژیان منی ماندو کردبێت, کەچی هێشتا لە سەرەو دەرەی ئەوەدام کە ئەگەر بیر لە هەردوو وڵاتی چین و هیند بکەمەوە, وای بۆ دەچم کە ئەرکی منە بیانناسم.

**ئوسوالدو فراری:** دەمێکە دەمەوێت لەگەڵتا لە بارەی دوو ئەنجامگیریی شیمانەیی ئەم شیعری مەزەندەیە قسە بکەم.

**بورخیس:** کامە ئەنجامگیری؟

**ئوسوالدو فراری:** شیعرەکە بەو ئەنجامە دەگات کە هەرچەندە "پێچ و پلوچی جۆراوجۆری هەنگاوەکان" کە بە هۆی چارەنووسەوە دێتە ڕێ, هەر شایەتێك دەتوانێت بەهەر شێوەیەك بێت لەگەڵ چەمکی تەقدیردا پەیوەندیەك دروست بکات. تەنانەت ئەگەر چارەنووسێکی گەردونی بێت.

**بورخیس:** بە گەردونی بوونی نازانم, بەڵام ئەوە دەزانم کە پێشان بریاری لێدراوە, بەو مانایەی کەسێك یان شتێك بە تایبەتی لەو بارەیەوە ناتوانێت بریار بدات. مەبەستم ئەوەیە کە کۆی هۆ و ئەنجامەکان بێ کۆتاین و جۆراو جۆریەکانی چارەنووسی ئێمە دەستنیشان ئەکات, هەر لەبەر ئەمەیە کە من لەبارەی "ئیختیار"ەوە گومانم هەیە. ئەم چرکەساتی کۆتاییە, لەگەڵ هەر هەنگاوێکی لاپریدادا هەر لە سەرەتاوە دەستنیشان کراوە.

**ئۆسوالدو فراری:** بەرئەنجامێکی دی ئەوەیە کە ئێمە، خەڵکانی ئەمریکای باشوور – کە شیعرەکە لەبارەمانەوە دەدوێت – بە ڕێگای خۆمان دەگەینە چارەنووسی تایبەتیمان، چارەنووسی ئەمریکاییەکی باشوور.

**بورخیس:** چارەنووسێکی تاڵ و دیکتاتۆری. وا پێدەچێت هەر لە ئەزەلەوە چارەنووسی ئێمە دەستنیشان کرابێت، هیچ کەرتەیەك بە ڕادەی کەرتەکەی ئێمە، ئەم هەموو نازناوە جۆراوجۆرانەی دانەهێناوە: "مەزنترین پاشا" وەك رامی ڕیز "پایە بڵند" وەك لوپێز[23] لە پاراگوای، گەورە هاووڵاتی نازانم کێ لە ڤەنزویلا "یەکەمین کارگەر" لە شوێنێکی تر. لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بە دەگمەن شتی وا بەرچاو دەکەوێت – ڕەنگە یەکێکی وەك لینکۆڵن[24] کە ئەویش ئەو جۆرە نازناوەی بۆ خۆی دانەناوە. نازناوی "یاساچاکەر" لە هەموو ئەوانە سەیر و سەمەرەترە، کەس نازانێت ئەم یاسایانە چی بوون و چیان لێهاتو کەسیش نەیویست لەو باسە ئاگادار بێت. ناونیشانی تەواو هەبوەو دەبێت و ئەمەیش بە تەواوی لەو شتە دەچێت کە هیدوبرو[25] بە (قوتابخانەی داهێنان) ناوزەدی دەکات. وا نیە؟ ناوێکی بێ ناوەڕۆك، "یاساچاکەر!" ئاخر کامە یاسا؟ کامە یاسای چاککردوە؟ هەموو گاڵتەی پێ دەکەن.. دەڵێیت هەموو خەڵکیی دەیانەوێت لە بری ناوی خۆیان ناوێکی جوانتریان هەبێت.

**ئۆسوالدو فراری:** بەم حاڵەیشەوە، هەندێك جار وا پێدەچێت ئێمە توانای گەشەکردنمان هەبێت، وەك تۆ وتت، لەگەڵ ئەو جۆرە چارەنووسەیشدا، بۆ ئێمە ئەو خۆشی و شادیەیش هەیە کە ئێستا ماوین و دەژین.

**بورخیس:** هیوادارم، بە هەرحاڵ دەبێت وەفامان بەم ئومێدە هەبێت، تەنانەت ئەگەر هەوڵی زۆرتریشی بوێت، چ ئومێدێکی تر هەیە؟ بیر لە دیموکراسی بکەینەوە! بۆ نا؟!

## گفتوگۆی چوارەم

## گفتوگۆیەکی تازە دەربارەی شیعر

**ئۆسوالدو فراری:** بورخیس، بەپێی باوەڕی کۆنی خۆرهەڵاتیەکان، حەزرەتی ئادەم لە بەهەشتا بە شێوازی شیعر دواوە(*).

**بورخیس:** لەوە بەئاگانیم، بەڵام دەزانم ئادەم بە زمانی عیبری قسەی کردوە(**).

باوکی کولریج – کە پێشەوایەکی مەزهەبی ئینگلیزی بوە – لە تەفسیرێکی دوورودرێژیدا، بە زمانی روح القدس کە بێگومان زمانی عیبری بوە، وەعزی داداوە، بۆیە موریدە بەوەفاکانی زۆر سوپاس گوزاریان لێ کردوە. دوای مردنی، ئەو واعیزەی هاتۆتە جێگای، یان زمانی عیبری نەزانیوە یان بەکاری نەهێناوە، لە ئەنجامدا موریدە بەوەفاکان هەستیان بە بێبەشی و زوڵم لێکراوی کردوە. ئەوان ئەگەرچی وشەیەکی عیبریان نەزانیوە، بایەخیان بەو مەسەلەیە نەداوە، ئەوان ئەوەیان لا مەبەستی سەرەکی بوە کە وەعزەکە بە زمانی روح القدس بێت.

سیر توماس براون[26] نووسیویەتی ئەگەر دوو منداڵ – بۆ نموونە – رومولوس و رموس – لە دارستانێکدا بەرەڵابکەن کە تێکەڵ بە خەڵکانی تر نەبن و چاویان لێ نەکەن شتێکی زۆر سەیر ڕوودەدات، چونکە لە هەلومەرجێکی وادا، ئەو زمانەی ئەو منداڵانە قسەی پێ دەکەن سەرەتاییترین زمانە عیبریەکەی بەهەشتە. گوایا ئەم تاقیکردنەوەیە کراوە بەڵام منداڵەکان قسەیان نەکردووە و تەنیا دەنگێکی بێ مانایان لە دەم هاتۆتە

دەرێ. بە هەرحاڵ هەندێك لەو باوەڕەدان كە بە هۆی بە تەنیا بەجێهێشتنی دوو منداڵ لە شوێنێكی تەریكدا, زمانی سەرەتایی مرۆڤ دەدۆزێتەوە.

**ئوسوالدو فراری:** زمانی ئورژینال..

**بورخیس:** بەڵێ, عیبری, بەڵام من نەمدەزانی كە ئادەم بە زمانی شیعر قسەی كردوە. لەگەڵ ئەوەیشدا لە یادمە لە كتێبێكدا دەربارەی "كابال" (كە یەكێكە لە كتێبە دەگمەنەكانی ئەو بابەتە) ئەوەم خوێندەوە كە ئادەم بەو گریمانەیەی, ڕاستەوخۆ خوا بە دەستی خۆی دروستی كردوە, لە زانستە میتافیزیكیەكان و, مێژوو و ماتماتیكدا باڵادەست بوە. چونكە بە كامڵی لەدایك بوەو خوا و فریشتەكان پەروەردەیان داوە. هەروەها دەڵێن كە شتێكی گەورەی هەبوەو وردە وردە بچووك بۆتەوە, لیون بلوی[28] لە ڕستەیەكی جوانیدا دەڵێت: "ئادەم كە لە بەهەشت هاتە دەرێ ئیتر لە ئاگر نەدەچوو, بەڵكو پزیسكێك بوو لە كاتی كوژانەوەدا" كەواتە گریمانەی ئەوە هەیە كە دەبێت "كابال" نەریتێكی كۆن بێت. چونكە فریشتەكان ئەوە فێری ئادەم ئەكەن, ئەویش بە قابیل و هابیل و ئەوانیش منداڵەكانیان فێر دەكەن, هەر بەو شێوەیە, ئەمەتا سەدەكانی ناوەڕاست بەردەوامە, ئەمڕۆ دەستخۆشی لە بیری تازە دەكرێت, بەڵام لە رابوردوودا بیرێك سەرنجی ڕادەكێشا كە كۆن بوو, ئایا شتێكی كۆنتر لە "كابال" لە بارەی ئادەمەوە هەیە؟

**ئوسوالدو فراری:** یەكەمین مرۆڤ كە بە رۆحی خودا فێركراوە!

**بورخیس:** كەواتە فریشتە نزیكەكانی خودایش پەیڕەویان لە (كاباڵ) كردوە.

**ئوسوالدو فراری:** بەهەرحاڵ ئێمە ئەوە دەزانین كە ئەدەبیات بە شیعر دەستی پێكردوە..

**بورخیس:** قسەكردنی ئادەمیش بە شێوەی شیعر هەر ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت.

**ئوسوالدو فراری:** تەواو وایە.

**بورخیس:** من وا بیر دەكەمەوە لە شاعیرانی عیبری تەنیا بۆ هاوسەنگی كردن نەبێت كەمتر لەسەریان دواون, وا نیە؟ چونكە (زەبور)ەكان پیتەكانی ئەلفبایان بەتەواوی تیا نیە, هەروەها سەرواو تیپ بەندی بەڵام ئاواز یان ڕیتمێكیان هەیە كە پاشان, والت ویتمان پەیڕەویی لێ دەكردن.

**ئوسوالدو فراری:** جارێكی دی سازیدانەوە.

**بورخیس:** نازانم ئەوەی كردبێت یان نا, هەرچۆن بێت لە "زەبوورەكانی داود"ەوە كە وەرگێڕانی قەشەكانە لە ئینجیلی ئینگلیزیەوە دەستی پێكرد.

**ئوسوالدو فراری:** بەرهەمەكانی بورخیسیش هەر بە شیعر دەست پێدەكەن, مەبەستم كۆمەڵەی "تاسەی بوینس ئایرس"ە.

**بورخیس:** بەڵێ, بە مەرجێك وشەی شیعر لابەریت, چونكە من بەوەی دانانێم ئەوە كۆمەڵە شیعر بێت, پەخشانێكی كەم تا زۆر ڕێك و پێكە, لە بیرمە لە كاتی نووسینیدا, كەمتر بیرم لە ویتمان دەكردەوە و زیاتر كاریگەری پەخشانی كوڤیدو[29]م لەسەر بوو, ئەوسا زۆرم لێدەخوێندەوە. بەهەرحاڵ ئەو كتێبە لەسەر شێوازی كوڤیدو, پڕە لە زاراوەی لاتینی كە توانیم هەندێكی لێ كەم بكەمەوە.

**ئوسوالدو فراری:** هەرچۆنێك بێت من وای بۆ دەچم كە تۆ لە شیعری ئازاددا, لە ژێر كاریگەری ویتماندا بوویت.

**بورخیس:** رەنگە, نازانم شیعری ئازادی من لە شیعری ویتمان چوو بێت, یان لە پەخشانی كێشداری كوڤیدو یان ساڤادار و فاجاردو[30] كە ئەوسا بەرهەمی ئەمیشم زۆر دەخوێندەوە.

**ئوسوالدو فراری:** هەندێك لە تیۆریەكانی تۆ لەبارەی شیعرەوە بۆ من زۆر سەرنجراكێشن, بۆ نموونە تۆ دەڵێیت هەر شیعرێك كە بنەماكەی حەقیقەت بێت بێگومان شیعرێكی باشە..

**بورخیس:** دەبێت ئەمەیشی بخەینە سەر: یان بنەمای حەقیقەت یان خەیاڵی تەواو وا نیەء؟ دوو شتی دژ بە یەكتر. هەڵبەتە ئەمە لە كاتێكدا دێتە دی كە خەیاڵەكە واقیعی بێت. واتا شاعیر بڕوای بە وێناكانی خۆی هەبێت. بەڕای من زۆر ناخۆشە شیعر تەنیا بەوە وەربگرین كە گەمەیەكی سادەیە بە وشە, هەرچەندە ئاوازیشی تیا بێت, بە بڕوای من ئەمە هەڵەیە, وانیە؟

**ئوسوالدو فراری:** وایە, بە بڕوای من ئەمە "هەقیقەتی هەستێكە". كە لە تۆدا كاریگەریی هەیە.

**بورخیس:** وایە "هەقیقەتی هەست". بە جۆرێكی تر من چیرۆكێك دەنووسم كە خۆم دەزانم درۆیە: چیرۆكێكی خەون (فانتازی) یان پۆلیسی — تاوانێك (ئەمیش جۆرێكە لە ئەدەبی خەیاڵی) بەڵام بە درێژایی زەمانی نووسینەكە, دەبێت بڕوام بەوە هەبێت. من لێرەدا لەگەڵ كولریج[31]ی شاعیری ئینگلیزیدا یەكدەگرمەوە, لای ئەو بڕوای شاعیرانە واتا بۆ ماوەیەك خستنە لاوەی بێ باوەڕی.

**ئوسوالدو فراری:** ئەمە گرنگە.

**بورخیس:** بەڵێ, بابڵێین یەكێك دەچێتە شانۆ بۆ بینینی ماكبێس, ئەو كەسە لەگەڵ ئەوەیشدا كە دەزانێت ئەوانەی لەسەر شانۆن ئەكتەرن, واتا كەسانێكن خۆیان گۆڕیوەو جارێكی تر بەیتەكانی سەدەی هەڤدە دەڵێنەوە, كەچی هەموو ئەمانە لەبیر دەكات و دەكەوێتە دوای چارەنووسە پڕ لە مەترسییەكەی ماكبێس, ئەو كەسەی لەبەرئەوەی حەزی بە تاج و تەختە بەهۆی سیحرباز و لیدی ماكبێسی هاوسەریەوە دەكێشرێتە پای قەنارە.

**ئوسوالدو فراری:** راستە.

**بورخیس:** هەروا كە تەماشای تابلۆیەك دەكەین و دیمەنێك دەبینین, بیر لەوە ناكەینەوە ئەمە وێنەیەكی خەیاڵیە و لەسەر پارچەیەك كراوە, بەڵكو وەك پەنجەرەیەك تەماشای ئەكەین كە بەسەر دیمەنگایەكدا كرابێتەوە.

**ئوسوالدو فراری:** راستە, وەلێ تۆ وتت بەكارهێنانی وشەی مۆسیقا بە مەبەستی شیعر هەڵەیە, یا جۆرێكە لە مەجاز و هەموو زمانێكیش ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە.

**بورخیس:** بەڵێ, بۆ نموونە گوێی من دەتوانێت بە چاكی موسیقای وشەكانی بەرناردشۆ ببیستێت, بەڵام هەر ئەم گوێچكانە. ناتوانێت موسیقای یەكێكی تر یان گورانیبێژێك ببیستێت.

**ئوسوالدو فراری:** ئەمانە دوو شتی جیاوازن.

**بورخیس:** وایە, جیاوازن, من قسەم لەگەڵ ژێنەر و موسیقازان گەلێكدا كردوە كە گوێی موسیقایان بە هیچ جۆرێك چاك نەبوە, ئەوانە ناتوانن بەندێك یان وتەیەكی پەخشان یا پارچە شیعرێك بڕگە بڕگە بكەن.

**ئوسوالدو فراری:** پرسیارێكی تر ئەوەیە كە ئایا تۆ وا بیر دەكەیتەوە بتوانرێت لە شیعردا دەستبەرداری خوازە (استعارە) ببیت؟

**بورخیس:** لەو باوەڕەدام, مەگەر بە قبوولّ كردنی شتێك.. كاتێك ئیمیرسون (*Emerson Ralph*) زمانی شیعر بە زمانێكی وشك دادەنێت, لەم حاڵەدا هەموو ناوێكی مانا, وردە وردە دەبێتە ناوی زات و ئەمە خوازەیەكە, بەڵام بۆ تێگەیشتنی وتەیەك, دەبێت لە كاتی گوێ هەڵخستندا, ڕیشەی فیزیكی و

ئیشتیقاقی وشەکان لە یاد بکەین، واتا بیر لە خوازەییان نەکەینەوە.

**ئوسوالدو فراری:** چونکە ریشەی خوازەیی..

**بورخیس:** گوێزانەوەیە.

**ئوسوالدو فراری:** گوێزانەوەیە..

**بورخیس:** بەڵێ، بەڵام خوازە، خوازەیە، وشەی خوازە خۆی لە خۆیدا خوازەیە.

**ئوسوالدو فراری:** بە مانای سمبولیك. ریلكە[32] لەم بارەیەوە وەك خۆی دیدێکی سەرنج راکێشی هەیە و تۆیش وەك خۆت. ئەو باوەڕی وایە جوانیی، سەرەتای سەرسووڕمانە و تۆ شیعر و سەرسووڕمان پێکەوە دەبەستیت. پێدەچێت تۆ لە ژێر کاریگەریی باوەڕی شاعیرانی "سلت"[33]دا بیت، ئەوان بڕوایان وایە مرۆڤ ناتوانێت بە ئاگا بێت لە شیعر، ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئینجیلەکان، تۆ دەزانیت مرۆڤ ناتوانێت خوا ببینێت، چونکە کە بینی دەمرێت، ئەمە لە بارەی شیعریشەوە راستە.

**بورخیس:** من لە چیرۆکێکمدا لەم باوەڕە کۆنە دواوم، چیرۆکەکە پەیوەندی بە شاعیرێکی "سلت"ەوەیە، پاشا دەستووری پێ دەدات شیعرێك بەسەر کۆشکەکەیدا بڵێت، شاعیرەکە بە درێژایی سێ ساڵ و بە سێ قۆناغ شیعرەکە دەنووسێت. لە دوو قۆناغی یەکەمدا بە نووسینێك دەگاتە لای پاشا، بەڵام سێیەم جار بە دەستی خاڵیەوە لە کۆشکەکەدا ئامادە دەبێت و تەنیا وشەیەکی لەسەر زمانە، دیارە ئەو وشەیە واژەی کۆشك نیە بەڵکو وشەیەکە کۆشکەکە بەشێوەیەکی کاملتر باس دەکات. هەر بە وتنی وشەکە کۆشکەکە دیارنامێنێت، لەو شوێنەدا کە ئامادەگی کۆشکەکە تەنیا بە واژەیەك بە تەواویی دیار نامێنێت، ئیتر بەڵگەیەك نامێنێتەوە بۆ بوونی کۆشکەکە.

**ئوسوالدو فراری:** شیعر و سیحر؟

**بورخیس:** بەڵێ، بێگومان، دەشێت ئەم چیرۆکە بە جۆرێکی دیش کۆتایی بێت، بەو جۆرەی لەبەر ئەوەی کە شاعیر گەیشتۆتە کەماڵ و وشەکەی وتوە، ئیدی پاساوێك بۆ بە زیندو مانەوەی نەماوەو پاشا بەتیغێك لەپێی دەخات. بێجگە لەوە دۆزینەوەی وشەیەك کە جێگای هەقیقەت بگرێتەوە جۆرێکە لە کوفر، وا نیە؟ چۆن دەبێت مرۆڤ وشەیەك دابهێنێت کە جێگای بەشێکی دنیا بگرێتەوە؟

**ئوسوالدو فراری:** ئەم قسەیەی تۆ ئەوەم وەبیر دێنێتەوە کە لە دیدی مەزهەبیەوە، ناوی شارە کۆنەکان، بە پیرۆز لە قەڵەم دەدران.

**بورخیس:** وایە، دوکونسی[35] کە ناوی شاری "رۆما" دێنێت و ناوی هاونیشتمانیەکی "رۆمی" دەبات کە بەهۆی نهێنی دەرخستنەوە فەرمانی مەرگی بەسەردا دەدرێت، ئەو ئەمەی بۆ زیاد دەکات کە ئەم ناوە پیرۆزە، بە نهێنی ماوەتەوەو نەگەیشتۆتە سەر زمانی ئێمە.

**ئوسوالدو فراری:** لە راستیا.

**بورخیس:** لێرەدا ئێمە بە مانایەك دەگەین ئەگەر کەسێك ناوی نهێنی "روما" بزانێت دەبێتە خاوەنی روما. چونکە کە ناوی شتێکت زانی دەسەڵاتی بەسەردا پەیدا دەکەیت. با بگەڕێینەوە سەر ئەو شتەی کە وتمان: خودا بۆ ئەوەی ناوی راستەقینەی خۆی بە موسا نەڵێت پێی دەڵێت: "من ئەو کەسەم کە منە" ئەمە ئەو شتەیە کە مارتین بوبر[35] بیری لێ دەکردەوە.

**ئوسوالدو فراری:** ئیتر لێرەوە باس لە ناوە رەمزیەکەی خودایە.

**بورخیس:** بەڵێ، خوا ناوێکی رەمزیی هەیە ئەگەر پێی بزانرێت، لەوانەبوو توانا خوداییەکە بچێتە موساوە. بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت دەڵێت: "من ئەو کەسەم کە منە" بەو جۆرە خۆی لە وەڵامی

راست و ڕەوان دەپارێزێت، ئەمەیش جۆرە خۆڵی نەبان کردنێکە.

**ئۆسوالدو فراری:** ئەگەر قایل بیت، کەمێك بگەڕێینەوە دواوە. ئایا خودی خۆت هەستت بە پەیوەندیی نێوان سەرسامیی و شیعر، یان پەیوەندی شیعر و جوانی کە قسەی لەسەر دەکرێت، کردوە؟

**بورخیس:** لە نێوان جوانی و سەرسامیدا بەڵێ، ئەمە شتێکە لە رابوردودا زۆرم بیر لێ دەکردەوە، چونکە وام هەست دەکرد گرتنی جوانیی لە توانای ئێمەدا نیە، ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە لەو بڕوایەدام کە جوانیی لە هەموو جێگایەکدا بوونی هەیە. کەواتە بۆ نەچین بە پێشوازیەوەو خۆش هاتنی لێ نەکەین؟

**ئۆسوالدو فراری:** لایەنێکی دی کە بەلای منەوە پڕ بایەخە و لە کاتی گفتوگۆکردن لەسەر ئەرەستۆ و ئەفلاتوندا[36] لێی دواین، ئەوەیە کە دەڵێیت شاعیر دەتوانێت هاوکات دەرك و بەڵگاندن بەکاربێنێت یان..

**بورخیس:** یان ئەفسانە.

**ئۆسوالدو فراری:** بەڵێ، لە کۆمەڵگای ئێمەدا شاعیر ئەو کەسەیە دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئەوانەدا هەبێت و پەنایان بۆ بەرێت.

**بورخیس:** شاعیر دەتوانێت کەڵکیان لێ وەربگرێت، هەڵبەتە بەو حەزەوە کە بۆ ئەم یان بۆ ئەویان هەیەتی. لە بارەی منەوە دەڵێن شاعیرێکی روناکبیرم.

**ئۆسوالدو فراری:** بۆ لەمەدا هەڵەن!

**بورخیس:** بەڵێ، بەڵام سەیرە، لە بارەی "برونینگ"[37]یشەوە، لە سەرەتادا، ئەویان بە شاعیرێك ناوزەد دەکرد کە کارەکانی تەسەنوعی تێدایە. بەڵام دواجار وتیان: ئەوەندە روناکبیرە کەس ناتوانێت تێی بگات.

## پەراوێز و ئاماژە:

1- *Jorge Luis Borges*.

2- *osvaldo Ferrari*.

3- ئاتلیە *Atelier* (فەرەنسی) شوێنێك چەند هونەرمەندێك لە ژێر چاودێریی مامۆستایەکدا کار بکەن – فەرهەنگی عەمید.

4- *Laplata* ناوی ناوچەیەکی دەوروبەری کەنداوی هاوبەشی نێوان ئۆرۆگواو پاران (ئەمریکای باشوور).

5- برتراند راسل *Bertrand Russell* (1872-1970) فەیلەسوفی ئینگلیزی.

6- فیختە *Fichte* 1762-1814 فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە.

7- کارلایلا *carlyle* 1795-1881 مێژوو نووسی ئینگلیزی.

8- چسترتون *chesterton* 1874-1936.

9- پین *Thomas Pain* 1737-1809 نووسەرێکی شۆڕشگێڕی ئەمریکیە.

10- جفرسون *Thomas Jeffrson* 1743-1826 سیاسەتمەداری ئەمریکایی.

11- ویتمان *walt Whitman* 1819-1892 شاعیری ئەمریکایی.

12- ویلز *Herbert Wels* 1866-1946 نووسەرێکی ئینگلیزیە.

13- *Lanacion*.

14- *Herbert Spencer* فەیلەسوفێکی ئینگلیزیە (1820-1903).

15- *Hilaire belloc* 1870-1953 نووسەر و شاعیری ئینگلیزی.

16- Wells 1866-1946 نووسەری ئینگلیزی.

17- Somme Theologigue کتێبی ناتەواوی سنت توماس داکان کە پێنج بەڵگەی لەسەر بوونی خودا تێدایە.

18- st. Thomas d Aguin 1225-1274 فەیلەسوف و زانای ئیلاهیاتی ئیتالی.

19- Dante Alighieri 1265-1321 شاعیری گەورەی ئیتالی.

20- Gaucho گاوانەکانی ئەرژەنتینی کە لە باوو باپیراندا تێکەڵن لەگەڵ ئەوروپایی و سوور پێستەکاندا، ئەمانە بەردەوام لە سەرکێشی و ئاژاوە نانەوەدان.

21- Browning Robert شاعیری رۆمانتیکی ئینگلیزی (1812-1889).

22- Joys James نووسەری ئیرلەندی (1882-1941).

23- Lopez calos Antonio (1790-1862) خۆی و کوڕەکەی دوو دیکتاتۆری پاراگوایی بوون.

24- Lincoln(1809-1865) سیاسەتمەدار و سەرکۆماری ئەمریکا.

25- Huidobro Vicente شاعیری ناوداری چیلی (1893-1948).

*وەك لە یاداشتی دەوڵەت شای سەمەرقەندیا هاتوە: یەکەمین کەس کە شیعری وتبێت ئادەم بوە. هۆیەکەیشی کوژرانی هابیلی بێ تاوان بوو بە دەستی قابیل، هەندێك لە مێژوناسان یەکەم وتنی شیعریان داوەتە پاڵ ئادەم کاتێك کە شینی بۆ هابیل گێڕاوە.

**لە "المعجم فی معاییر أشعار العجم" دا وا باس کراوە کە یەکەمجار ئادەم بە زمانی "سریانی" قسەی کردوە و ئەو زمانەیش بەشێکە لە زمانی عیبری.

26- Sir thomas Browne (5160-1682) نووسەر و پزیشکی ئینگلیزی کە لە نووسینەکانیدا زانست و ئاینی تێکەڵ بە یەکدی دەکرد.

27- Kabbale ئەو مەبەستە ئەفسانەییانەی کە دوای تەورات بە چەند سەدەیەك کۆکراونەتەوەو کابالیستەکان لە تەورات زیاتر بڕوایان پێی هەیە.

28- Loen bloy (1846-1917) نووسەری کتێبە مەزهەبیەکانی فەرەنسایی.

29- Quevedo Francisco Gomez (1580-1640) نووسەر و شاعیری ئیسپانی.

30- Saavedra Fagardo (1584-1648) نووسەری ئیسپانی.

31- coleridge samuel (1772-1834).

32- Rilke (1875-1926) نووسەر و شاعیری نەمساویی.

33- celte ناوی کۆنی ئیرلەندا.

34- De Quincy Thomas (1785-1859) نووسەرێکی ئینگلیزە.

35- Martin Buber (1878-1965) عارف و فەیلەسوفی نەمساوی.

36- گفتوگۆ لەبارەی ئەرەستۆ و ئەفلاتونەوە لە شوێنێکی تری دیمانەکانی بورخیس لەگەڵ فراریدا باس کراوە.

37- Browning Robert (1812-1889) شاعیری ئینگلیزی.

## سەرچاوە

کتێبی "اخرین گفتوگوهای بورخس و اسوالد و فراری"

نموونەیەك لە چیرۆكی بورخیس

# نهێنیی بوونی ئیدوارد فیتز جراڵد

خورخێ لویس بۆرخیس
لە فارسییەوە: یاسین عومەر

پیاوێك، بەناوی عومەری كوڕی ئیبراهیم، لە سەدەی یازدەی زایینییدا (بە بۆچوونی خۆی سەدەی پێنجی كۆچی) لە ئێران لەدایك دەبێت، قورئان و حەدیس لە سەر دەستی (حەسەنی كوڕی صەباح)ی دامەزرێنەری داهاتووی گروپی حەشاشەكان یان ئیسماعیلیە، و نیزامولمولك، كە پاشتر دەبێتە وەزیری ئەلب ئەرسەلان و ڕزگاركەری قەفقاز، فێر دەبێت.

ئەم سێ هاوڕێیە بە گاڵتە، یان هەر بەڕاستی سوێند دەخۆن كە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بەخت ڕوی كردە یەكێكیان، ئەوا دوانەكەی تریانی لە بیر نەچێتەوە. نیزام لە ساڵەكانی كامڵبوونی تەمەنیدا دەگاتە پلەی وەزارەت. عومەر بۆ خۆی هیچی ناوێت مەگەر گۆشەیەك لە سایەی شەوكەتی وەزیردا تا لە پێناوی بەردەوامی حكومەتەكەی ئەودا نزا بكات و بیر بكاتەوە و لە بیركاری‌دا قوڵ ببێتەوە. (حەسەن پلەو پایەیەكی بەرزتری لە نیزام دەوێت و بەدەستیشی دەهێنێت، سەرئەنجامیش لایەنگرەكانی، وەزیر دەدەنە بەر خەنجەرو دەیكوژن) ساڵانە موچەی عومەر لە بەیتولماڵی نیشاپور بە دە هەزار دینار دیاری دەكرێت و ئەمەش توانا دەداتە عومەر تا هەوڵ و كۆششی خۆی بۆ لێكۆڵینەوەكانی تەرخان بكات. عومەر بورجخوێندنەوە ڕەتدەكاتەوە بەڵام ڕوو دەكاتە ئەستێرەناسی، لە ڕاستكردنەوەی تەقویمێكدا كە جێگەی سەرنجی سوڵتان دەبێ بەشداری دەكات و نامیلكەیەكی بەناوبانگیش لە زانستی جەبردا دەنوسێت كە ڕێگاچارەیەكی ژمارەیی زۆر بۆ هاوكێشە پلە یەك و پلە دووەكان، هەروەها ڕێگاچارەی ئەندازەیی، لە ڕێگەی پارچە پارچە كردنی داتاشراوەكانەوە، بۆ هاوكێشە پلە

سـێیەکان، لـە خـۆ دەگرێـت. نهێنـی ژمارەکـانو ئەسـتێرەکان مێشـکی بێـزار ناکـەن" لـە گۆشـەی کتێبخانەکەیـدا دەقـەکانی ئـەفلاتین دەخوێنێتـەوە، ئـەفلاتین کـە لـە زمـانی ئیسـلامیدا، بـە ئـەفلاتۆنی میسری یان بە مامۆستای یۆنانی دەخوێنرێتـەوە، و پـەنجاو قسـور نامـەی عیرفـانیو ڕافـزی چەشـنی ئیخوان ئەلسەفا، کە دەڵێت جیهان دروستبووی یەك بوونو گەڕانەوەیەوە بۆ یـەك بـوون دەخوێنێتـەوە... ئەو وەکو موهتەدی فارابی بە حیسـاب دێت، کە لەو باوەڕەدا بوو شێوەکانی بونەوەر بوونێکی جیایان لـە شتەکان نییە، هەروەك موهتەدی ئەبو عـەلی سینا کە جیهـانی بـە شـتێکی هەمیشـەیی دەزانـی. یـەکێ لـە گێڕانـەوەکان بـاس لـەوە دەکـات کـە ئـەو بـاوەڕی بـە دۆناودونی گیان لە جەستەی مرۆڤەوە بۆ جەستـەی ئاژەڵ هەیە، یان وا خۆی دەردەخـات کە بڕوای بەمـە هەیـە، لـە شـوێنێکدا لەگـەڵ ولاخێکـدا قسـە دەکـات، وەك چۆن فیسارگۆرس لەگەڵ سەگدا قسـەی دەکرد. ئـەو بـاوەڕی بـە ئـاین نییـە بـەلام زۆر بـاش دەتوانێـت بەشێوازی بڕواداره زۆر جدییـەکان وردتـرین ئایـاتی قورئـانی لێکبداتـەوە، لەبـەر ئـەوەی هـەموو پیـاوێکی هۆشـیار زانایـەکی خوداییشـە، و دیسـان لـەو ڕووەوە کە بۆ بوون بە زانای ئیلاهیات بـاوەڕ پێویست نییـە. عومـەری کـوڕی ئیبراهیمـی خـەیام لـە مـاوەی نێـوان ئەستێرەناسـیو جـەبردا شـیعرگەلێك دادەنێـت کـە نیـوە بـەیتی یەکـەمو دووەمو چـوارەمی هاوسـەروا دەبن. درێژترین دەستنوسیێ کە ماوەتەوە پێنج سەد دانـە لـەم چـوارینانە دەداتـە پـاڵ ئـەو، ئـەم ژمـارە کەمەش زیان لە ناوبانگی ئەو دەدات، لەبەرئەوەی لە ئێـران (وەکچـۆن لـە ئیسـپانیای سـەردەمی لـۆپێو کاڵدرۆن)دا دەبوایە شاعیر بەرهـەمی زۆری هەبوایە. خـــەیام لـــە ســـاڵی 517 ی کۆچـــیدا ســـەرقاڵی خوێندنــەوەی لێکۆڵینەوەیــەك بــە نــاوی (وحــدة و کثـرة) وە دەبـێ" جۆرێـك بـێ ئـۆقرەیی یـان مـژدە لـە کارێکی بەدو شوم لە کار ڕایدەگرێت. لـەجێی خـۆی هەڵدەسـتێت، لاپەڕەیـەك کـە جـارێکی تـر چـاوی پێناکەوێتەوە دەستنیشان دەکاتو ڕو دەکاتە خوا، ئەو خوایەی کە ڕەنگە هەبێت، ڕەنیشگە نەبێت، ئـەو خوایـەی کـە ئـەو لـە لاپـەڕە دژوارەکـانی نامیلکـەی جەبرەکەی خۆی دا داوای کۆمەکی لێکردووە. هەمان ڕۆژ، لە کاتی خۆرئاوابووندا، خۆری تەمەنی ئەو ئاوا دەبێت. هـەر لـەو ڕۆژانـەداو لـە دورگەیـەکی بـاکوری خۆرئـــاوادا کـــە بـــۆ نەخشەکێشـــەرانی ئیســـلامی نەزانراوە، پادشـای ساکسـۆن کە پادشـای نەرویـژی شـــکاندووە، خۆیشـــی بـــە دەســـتی شـــازادەیەکی نۆرمانی تێکدەشکێت.

حـەوت سـەدە بـە بـاقو بریقـەکان، بـە ئاشـوبو لێـدانو برینـەکان" تێپـەڕ دەبێـت، لـە ئینگلتـەرەش، پیاوێك بە ناوی ئیدوارد فیتـز جیراڵـد، دێتـە دنیـاوە، کە توانای مێشکی لە توانای مێشکی عومەر کـەمترە، بەلام ڕەنگە شۆڕو شـەوقو بەهەستبوونی لـەو زیـاتر بێ. فیتز جراڵد دەزانێ کە چارەنووسـی واقیعـی ئـەو لە ئەدەبیاتدایـەو بە پیری، و سەرسـەختییەوە دوای ئـــەم چارەنووســـە دەکـــەوێت. چـــەندین جـــار دۆن کیشـــۆتە دەخوێنێتـــەوە، کـــە بـــە بۆچـــوونی ئـــەو گـەورەترین کتێبـی جیهانـە (حـەز ناکـات لـە ئاسـت شکسپیرو "ڤێرژیلی باش ئاشنا" بێ بەزەیی بێت)، حـەزی ئـەو فەرهـەنگێکیش دەگرێتـەوە کـە مانـای وشـــەکانی تیـــادا دەدۆزێتـــەوە. لـــەم مەســـەلەیەوە تێدەگات کە هـەر کەسـێ تۆزێك بـەهرەی مۆسیقا لـە بوونی دا هـەبێت دەتوانێت بەدرێـژایی ژیـان، ئەگـەر ئەســـتێرەکان ڕازی بـــن، دە دوازدە جارێـــك شـــیعر بهۆنێتـەوە، بـەلام نایـەوێت ئـەم بەهرە بچـکۆلەیە بـە شێوەیەکی نابەجێ بەکاربهێنرێت، لەگـەڵ (تنیسـۆن، کارلایل، دیکنـز، ساکری) دا هاوڕێیـەتی هەیـە بـەلام

سەرباری ئەدەبو تەوازوعەکەی بە هیچ جۆرێك خۆی لەوان بە کەمتر نازانێت. وتو وێژێکی جوانو دڵگیری بەناوی یوفرانوەر[1] وچەند گێڕانەوەیەکی مامناوەندیی لە مەڕ کارەکانی کاڵدرۆن[2]و مەرگەساتە گەورە یۆنانیەکانی بڵاوکردۆتەوە. حەزی لە خوێندنەوەی ئیسپانی نامێنێ، ڕوو دەکاتە فارسیو دەست دەکات بە وەرگێڕانی (لۆژیکی باڵندە)، کە دڵگەرمییەکی عیرفانییە، مەلەکان بە دوای پاشاکەی خۆیاندا، سیمرغ، لە شەقەی باڵ دەدەن و حەوت دەریا دەبڕن" تا سەرئەنجام دەگەنە کۆشکەکەیو بۆیان دەردەکەوێت کە خۆیان سیمرغن، هەموویان سیمرغنو هەر یەکەشیان بۆ خۆی سیمرغە. لە دەوروبەری ساڵی 1854دا نوسخەیەکی دەستنووسی شیعرەکانی عومەر بە ئیستعارە وەردەگرێت. لە کۆکردنەوەی شیعرەکاندا جگە لە ڕێکخستنی ئەلفبێیی هیچ ڕێکخستنێك لەبەرچاو نەگیراوە" فیتز جراڵد یەك دوانێك لە چوارینەکان وەردەگێڕێتە سەر زمانی لاتینی. ئیمکانی گۆڕینی ئەو شیعرانە بۆ شیعرێکی یەکلەدواییەکی ڕێكو پێك کە بە وێنەگەلێکی شاعیرانەی بەرەبەیانو گوڵو بولبول دەستپێبکات، و بە چەند وێنەیەکی شەو و گۆڕ کۆتایی بێت لەبەرچاو دەگرێت. فیتز جراڵد، ئەو پیرەمێردە گۆشەگیرو یەکلابینە، ژیانی خۆی بۆ ئەم ئامانجە نەشیاو و دوورە دەستە تەرخان دەکات. لە ساڵی 1859دا، یەکەمین نوسخەی چوارینەکان بڵاودەکاتەوەو لەدوای ئەوەیشەوە نوسخەکانی تر بە گۆڕانکاریو پوختەکردنێکی زیاترەوە بڵاودەکاتەوە. موجیزەیەك ڕودەدات: لە پەیوەندیی پیرۆزی ئەستێرەناسی ئێرانیدا کە خۆی خستۆتە مەترسییەوەو پێی ناوەتە سنوری شیعرەوە، لەگەڵ ئینگلیزێکی سەرگەرداندا کە لە دەقە ئیسپانییو فارسییەکاندا قوڵ دەبێتەوە، بە بێئەوەی بە تەواوی لێیان تێبگات، شاعیرێکی نائاسایی دێتە ئاراوە کە لە هیچ کامێ لەو دوانە ناچێت. سوینبرن[3] دەنوسێت کە فیتز جراڵد "لە نێو شاعیرە مەزنەکانی ئینگلیزدا پلەو پایەیەکی نەمری بە عومەری کوڕی خەیام بەخشیوە،" "چستەرتون[4]"یش کە زۆر بەئاگایە لە تێکەڵاوی ڕۆمانسیزمو کلاسیزم لەم بەرهەمە نائاساییەدا، دەڵێت کە ئەم بەرهەمە لە هەمان کاتدا "ئاوازێکی فریودەرو پەیامێکی هەمیشەیی" هەیە. هەندێ لە ڕەخنەگران ئەم وەرگێڕانەی فیتز جراڵد بە شیعری ئینگلیزی بەڵام بە تاموبۆی ئێرانییەوەی لەقەڵم دەدەن" ڕاستە فیتزجراڵد لە وەرگێڕانەکەدا دەستی بۆ داهێنانگەلێك بردوە، هەندێ وشەی گۆڕیوەو لە خۆیەوە شتی بۆ زیاد کردوە، بەڵام لەبەرچاوی خوێنەراندا، چوارینەکان هەم بەرهەمێکی ئێرانینو هەم دێرینن.

ئەم مەسەلە تایبەتیە گومانێك دروست دەکات کە خەسڵەتێکی سەروسروشتی هەیە، وەکو دەزانین عومەر باوەڕدار بوو بە بۆچوونە ئەفلاتۆنیو فیسارگۆسییەکەی گواستنەوەی ڕۆحەکان بۆ لەشگەلی هەمەچەشن، لە پاش تێپەڕینی چەند سەدەیەك، ڕەنگە لە ئینگلتەرە گیانی عومەر دۆناودۆنی کردبێت، تا بە زمانێکی جێرمەنی وازلێهێنراو کە پڕە لە وشەی لاتینی، کارە ئەدەبییەکانی خۆی بە ئەنجام بگەینێت، کە لە نیشاپور حسابات بواری ئەنجامدانی ئەم کارەی پێ نەدابوو. ئیسحاق لۆریا[5]، ناسراو بە (شێر) سەلماندی کە گیانی پیاوێکی مردو دەتوانێت بە مەبەستی زاڵبوون یان فێرکردن، بچێتە لاشەی پیاوێکی ترەوە. ڕەنگە لە دەوروبەری ساڵی 1857دا گیانی عومەر خەیام چووبێتە جەستەی فیتز

جراڵدەوە. لە چوارینەکاندا ئەوە دەخوێنینەوە کە مێژووی جیهان جگە لە ئەندێشەو ویستی خودا بەولاوە شتێکی تر نیە، کە مەوزوعیەت بە دەستدەهێنێت و خودا لێیدەڕوانێت" ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە (کە ناوە هونەرییەکەی یەکێتی بوونە) ڕێگەمان دەدا ئەو باوەڕەمان هەبێت کە ڕەنگە فیتز جراڵد سەرلەنوێ شاعیری ئێرانی خەڵقکردبێتەوە، لەبەرئەوەی هەردووکیان، لە ناوەڕۆکدا، خودا بوون، یان چەند سیمایەکی کاتیی خودا بووبن.

بۆچوونێکی شیاوی تر، کە لە ڕوی سەیرییەوە هیچی لەم بۆچوونە نەوعەن ما میتافیزیکیانەیە کەمتر نیە، فەرزی چارەنووسی یارمەتیدەرە. جاروبار هەورەکان، شێوەی کێوگەڵ یان چەند شێرێ بەخۆیان دەدەن" دەتوانرێت بەراورد بکرێت کە شۆڕو شەوقی ئیدوارد فیتز جراڵد، و دەستنوسێك لەسەر کاغەزێکی کۆنی زەرد، یان بە مرەکەبی ئەرخەوانی، کە لە یەکێ لە قاوشەکانی کتێبخانەی بۆدلینی شاری ئۆکسفۆرد، فەرامۆش کراوە، بەڕای زۆرێك لە ئێمە شێوەی شیعر بە خۆوە بگرن.

هەر جۆرە هاوکارییەك لە نێوان ئەم دوانەدا جێگەی گومانە، ئەمەیان، واتە هاوکاری ئینگلیزێك و ئێرانییەك، بگرە گوماناوی تر بوو، چونکە ئەم دوانە زۆر جیاواز بوون، ڕەنگیشە ئەگەر لە ژیاندا بەیەکتربگەیشتنایە هاوڕێیەتی یەکتریان نەکردایە" ئەمە مردن و گۆڕینی زەمانە بوو کە توانی ئەم مەسەلەیە ڕوو پێبدات کە یەکێك کەسێکی تر بناسێت و هەردوکیان ببنە شاعیرێك.

## پەراوێزەکان

تر لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ شێوازەکانی پەروەردەو فێرکردن، نووسینی ئیدوارد فیتز جراڵد.

2 (1600–1681) شانۆنامەنووس و شاعیری گەورەی ئیسپانی.

3 ئەدیب و شاعیری ئینگلیزی (1837–1909).

4 وتارنووسی ئینگلیزی (1872–1934).

5 ئیسحاقی کوڕی سلێمان لۆریا، عارفێکی جولەکەو دامەزرێنەری شێوازی نوێی شیکردنەوەی هێمایانەی تەورات (قەواڵەی لۆریایی)ە پەیڕەوانی بە (شێری پیرۆز) یان دادەنا.

## سەرچاوە

هزار توهای بورخس، خورخه لویس بورخس، ترجمه: احمد میرعلائی، کتاب زمان، تهران 1380 هجری شمسی.

- **قوتابخانەی فرانکفۆرت**

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **توندڕەوەکان توشی شیزۆفرینیای کەسێتی بوون..**

هاشم سالّح

له عەرەبییەوە: ئەحمەد فاتیح محەمەد

- **لێدوانێك لە کتێبی "شانۆ و تەفسیر و هەڵوەشاندنەوەو ئایدۆلۆژیا"**

کامەران سوبحان

- **خوێندنەوەی کتێبی شێرە کوللەی ئاسنین**

سەلیم بەرەکات

خوێندنەوەی: هەورامان وریا

- **ئەبستراکتی ئەندازەیی**

ئا: تینا

- **شیعر و فیکر**

له عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

## قوتابخانەی فرانکفۆرت

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

*Rethinking the Frankfort school Jeferey T. Nealon and carenirr university of New York press – 2002 P.277.*



لە نوسینی ئەم کتێبەدا لانی کەم دە لێکۆڵیار لە مامۆستایانی زانکۆکانی ئەمریکا بەشداربوون. هەردوو لێکۆڵیار "جێفری ت. نیالۆن" و "کارین ئار" کە یەکەمیان مامۆستای زمان و ئەدەبی ئینگلیزییە لە زانکۆی پەنسلڤانیا و دووەمیشیان مامۆستای یاریدەدەری زمانی ئینگلیزییە لە زانکۆی براندیس، سەرپەرشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەیان کردووە و پێشەکیان بۆ نوسیوە.

بابەتی ئەم کتێبە تازەیە ئەو قوتابخانە فەلسەفیە بەناوبانگەیە کە بەناوی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە ناوبانگی دەرکرد. ئەم قوتابخانەیە لە سەرەتای سیەکانی سەدەی بیستەمدا لە ژێرناوی پەیمانگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیدا دامەزرا، بەرلەوەی بە ناوی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە نێوبانگ پەیدا بکات.. یەکەمین دامەزرێنەریشی "یۆرکهایمەر" بوو (1895-1973). دواتریش چەندین فەیلەسوفی دیکەی وەك "ئەدۆرنۆ، ئەریك فرۆم، هێربرت مارکۆز و... هتد"، پەیوەندیان پێوەکرد.

فرانکفۆرتیەکان پێیان وابوو فەلسەفەی کلاسیکی (واتە فەلسەفەی کانت و هیگڵ) زیاد لە پێویست بۆتە شتێکی تەقلیدی و ئایدیالیستی و بەم پێیەش توانای ئەوەی نییە بونیادی ئاڵۆزی کۆمەڵگە سەرمایەداریە نوێیەکان شیبکاتەوە، هاوکات توانای ئەوەشی نییە کە رووبەرووی ئەو هەڕەشە و مەترسیانەش بێتەوە کە رووبەرووی کۆمەڵگەی ئەوروپی دەبێتەوە.

لەبەرئەوە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بریاری ئەوەیان دا کە دەبێت زانستە کۆمەڵایەتیەکانی وەك (کۆمەڵناسی و ئابووری ناسی و دیمۆگرافیا و دەرونشیکاری) جێگای فەلسەفە بگرنەوە.. هیچ یەك لەو فەیلەسوفانەش خواستی خۆیان بۆ تێکەڵ بوون بە کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی ئەڵمانیا و ئەوروپا نەشاردەوە.. چونکە ئەوان پێیان وابوو نابێت رۆشنبیر دەرگا لەسەر خۆی دابخات و لە دوورەوە سەیری رووداوەکان بکات، بەڵکو دەبێت دابەزێتە ناو کێشەو ململانێکان و لە نزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بێت.

شایانی باسە هیچ یەك لە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت چەپبون یان مارکسی بوونی خۆیان نەدەشاردەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هەڵوێستیان زۆر رەخنەگرانە بوو لەو کۆمەڵگە سەرمایەداریانەی تیایدا دەژیان.

تەواوی ئەو بیریارانەی سەر بە رەگەزو ئاقاری جۆراوجۆر بوون لە شاری فرانکفۆرتدا کۆبوونەوە، لەبەر ئەوەی بارەگای ئەو سەنتەرە زانستیەی دایانمەزراندبوو لەوێ بوو، هەر لەبەر ئەوەش قوتابخانەکەیان بەناوی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە ناسرا.

"هۆرکهایمەر" کە یەکەمین بەڕێوەبەری پەیمانگاکە بوو لە

سەرەتادا مامۆستای یاریدەدەری زانکۆ بوو، وەك ئاقاری فەلسەفیش سەر بە کانتیە نوێیەکان بوو واتە سەر بە فەلسەفەی ئایدیالیستی بوو بە شێوازی "کانت" خۆی، لەگەڵ هەندێك نوێکردنەوە و دەسکاری کردندا. بەڵام هێندەی نەبرد وازی لەم ئاقارە هێنا بۆ ئەوەی لەسەر ڕێبازی "هیگڵ و مارکس" و فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری فەرەنسی بایەخ بە فەلسەفەی مێژوو بدات.

یەکەمین وتار کە لە ساڵی 1930 دا نوسی تایبەت بوو بە ڕەخنەگرتن لە تێزە ئایدیالیستیەکانی فەلسەفەی مەعریفە. دوابەدوای ئەوە زانکۆی فرانکفۆرت پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە کورسی (فەلسەفەی کۆمەڵگە) لە زانکۆکەیاندا وەربگرێت، لە هەمان کاتیشدا ڕایان سپارد تا سەرپەرشتی ئەو لابورە زانستیەش بکات کە سەر بە زانکۆی فرانکفۆرت بوو دواتریش بووە بەردی بناغەی قوتابخانەی فرانکفۆرتی بەناوبانگ و ئەو لابورەش لە سەرەتادا پێیان دەوت: (پەیمانگای توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان). ئەمە سەبارەت بە "ماکس هۆرکهایمەر".

هەرچی "تیودۆر ئەدۆرنۆ" شە (1903-1969) ئەوا ئەویش لە شاری فرانکفۆرت و لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی دەوڵەمەند هاتە دنیاوە. سەرەتا ئاشنایەتی لەگەڵ "هۆرکهایمەر" دا پەیدا کردوو بە بیروبۆچوونە مارکسیستەکانی سەرسام بوو، ئەمە وایلێکرد هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە واتە لە دەوروبەری ساڵی 1932دا پەیوەندی بکات بە مەڵبەندی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیەوە. مارکسی بوونی "ئەدۆرنۆ" بە شێوەیەکی ڕادیکاڵانە و ڕەخنەگرانە بوو نەك بە شێوەیەکی دۆگماتیستانەی داخراو وەکی ستالینیەکان و کۆمۆنیستەکان بەگشتی. لەگەڵ "هۆرکهایمەر" دا کتێبێکی بەناوبانگیان بە ناوی "دیالەکتیکی ئەقڵ" ەوە بڵاوکردەوە، ئەم کتێبەش بە یەکێك لە گرنگترین ئەو سەرچاوە فیکریانە دەژمێردرێت کە قوتابخانەی فرانکفۆرت بە درێژایی مێژووی خۆی بەرهەمی هێناوە.

سەبارەت بە "هێربرت مارکۆزە" ش (1898-1979)، ئەویش وەکی "ئەدۆرنۆ" لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی دەوڵەمەند و شاری بەرلین لەدایك بوو، بەڵام هەر زوو لە بیروبۆچوونە کۆنەپەرستانەکەی بنەماڵەکەی یاخی بوو، سەرەتاش بووە ئەندامی پارتی سۆسیالیستی ئەڵەمانیا، بەڵام شکستی شۆڕش 1919 وایلێکرد واز لەو حیزبە بهێنێت. پێدەچێت "مارکۆزە" ساڵی 1936 لە تاراوگە و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاخود ماوەیەك بەرلەوە پەیوەندی بە قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە کردبێت.. وەکی ئاشکراشە "هۆرکهایمەر" دوای هاتنە سەرکاری نازییەکان لە ئەڵەمانیا لەگەڵ چەندین ڕۆشنبیری دیکەی وڵاتەکەیدا ڕویانکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە گەیشتنیشیان بۆ ئەوێ داوای لە زانکۆی کۆڵۆمبیا کرد شوێنێك بداتە ئەو پەیمانگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیەی خۆی لە فرانکفۆرت سەرپەرشتی دەکرد، زانکۆی کۆڵۆمبیاش داواکەیان پەسەند کرد. بەمجۆرە قوتابخانەی فرانکفۆرت لە دەرەوەی ئەڵەمانیادا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە فەلسەفی و سۆسیۆلۆژیەکانی خۆی. دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی، هەندێك

بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و بە تایبەتیش "هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ" گەڕانەوە ئەڵەمانیا و لەوێ و لە شاری فرانکفۆرت جارێکی تر درێژەیان بە باس و لێکۆڵینەوەکانیان دا. بەمجۆرە قوتابخانەی فرانکفۆرت گەڕایەوە سەر زێدی خۆی، بەڵام کاریگەریەکی قوڵی لەسەر کلتوری ئەمریکی بەجێهێشت.. هەندێکی تر لە بیریارانی فرانکفۆرت وەك "هێربرت مارکۆزە" لە ئەمریکا مایەوە و تەنانەت دوای هەرەسی نازیزم و ڕوخانی "هتلەر" یش نەگەڕایەوە ئەڵەمانیا.

ئەم کتێبە چەند بەشێکی تەرخانکردووە بۆ "هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ و مارکۆزە"، لەگەڵ پێشەکیەکی گشتی دەربارەی ئەو مشتومڕەی هەنوکە لە فیکری ئەمریکی و ئەوروپیدا سەبارەت بە قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ئارەدایە. هەروەها پرۆفیسۆر "دۆگلاس کیلنیر" لێکۆڵینەوەیەکی نایابی دەربارەی پەیوەندی نێوان قوتابخانەی فرانکفۆرت و لێکۆڵینەوە ڕۆشنبیریەکانی بەریتانیا نوسیوە. "کیلنیر" پێی وایە پەیوەندییەکی لەمجۆرە دروست نەبووە، لەبەرئەوەی فەلسەفەی شیکاری و وەسفی کە لە بەریتانیادا باڵادەست بوو ڕێگربوون لەبەردەم ئەوەدا کە فەلسەفەی قوتابخانەی فرانکفۆرت بێتە ناو وڵاتی "شکسپیر" ەوە، بگرە تەنانەت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش فەیلەسوفانی بەریتانیا بە چاوی ڕقەوە سەیری ئەم قوتابخانەیەیان دەکرد و پێیان وابوو قوتابخانەیەکە زیاد لە پێویست دەستەبژێریانەیە و کەموکورتی زۆری تێدایە، بەم پێیەش لە بۆچونی ئەواندا فەلسەفەیەکی وا زانستی نییە و وەکو پێویست کامڵ و کۆنکرێتی نییە.

لێکۆڵیارێکی دیکە بە ناوی "ئیمەر سیمان" ەوە لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (سنوری ڕۆشنبیری قوتابخانەی فرانکفۆرت و لێکۆڵینەوە ڕۆشنبیریەکان) ەوە نووسیووە. "سیمان" بەڕێوەبەری پەیمانگای بەجیهانیبوونە لە زانکۆی (ماک ماستەر) لە کەنەدا و خاوەنی کتێبێکە دەربارەی "پییر بۆردیۆ"ی سۆسیۆلۆژستی فەرەنسی بە زمانی ئینگلیزی.

هەرچی "تۆماس و. بیب"ی لێکۆڵیاریشە ئەوا لێکۆڵینەوەیەکی گرنگی لە ژێر سەردێڕی (چەمکی کایەی گشتی لای یۆرگن هابرماس) نوسیوە.. بەڵام ئایا ئەم چەمکە (واتە چەمکی کایەی گشتی) بەرهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرتە؟ جێی باسە "هابرماس" دوایین نوێنەری قوتابخانەی فرانکفۆرتە و سەر بە نەوەی دووەمی ئەو قوتابخانەیە کە لە دوای نەوەی "هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ و مارکۆزە و.. هتد"، دێت.. لەم چەند ساڵانەی دوایدا "هابرماس" نێو و نێوبانگێکی زۆری پەیدا کرد، بە ڕادەیەك بووە گرنگترین فەیلەسوفی هاوچەرخ لە سەرتاسەری خۆرئاوادا، تەنانەت نێوبانگی ئەڵەمانیا و ئەوروپاشی بڕی و گەیشتە ئەمریکا و تەواوی وڵاتانی دنیا.

"یۆرگن هابرماس" ساڵی 1929 لە شاری دوسڵدۆرفی ئەڵەمانیادا لەدایك بووە. دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەسەر خوێندنی باڵا بەردەوام بووە. لەو کاتەشدا بیروبۆچونی نازیزم هەر مابوو، کاریگەریشی لەناو زانکۆکاندا بە ئاشکرا دیاربوو. لەبەرئەوەی وەکو پێویست کەس نەکەوتبووە لێك -شیتاڵکردن یاخود ڕەخنەلێگرتنی، هەر بۆیە "هابرماس" بڕیاری دا خۆی بۆ ئەم کارە تەرخان بکات. ئەو

دەیویست ئەو دیواری بێدەنگییە بشکێنێت کە تەوقی ئایدیۆلۆژیای نازیزمی دابوو، ئایدیۆلۆژیایەك کە دواجار بوو مایەی وێرانبونی ئەڵمانیا.

ساڵی 1953 واتە کاتێك تەمەنی تەنها بیست و چوار ساڵان بوو، "هابرماس" وتارێکی بەناوبانگی لە ژێر سەردێری (چۆن لەگەڵ هایدگەردا دژ بە هایدگەر بیر بکەینەوە؟) بڵاوکردەوە. لەو وتارەدا "هابرماس" سەلماندی کە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لە نێوان رەخنەگرتنی "هایدگەر" لە میتافیزیکا واتە لە ئەقڵانیەتی فەلسەفی و لەگەڵ قەناعەتە سیاسیەکانی نزیکەکانی لە نازیزمدا هەیە.

"هابرماس" هاولاتیانی ئەڵەمانیای وریا کردەوە لەوەی وابەستەی ئاقارە کۆنەپەرستانەکانی ناو کلتوری ئەڵمانی نەبن و باسی ئەوەشی کرد کە پێویستە ئەڵەمانیا بکەوێتە دادگایکردنی خۆی و خۆی یەکلایی بکاتەوە، ئەمەش لە پێناو ئەوەی بتوانێت خۆی لە پاشماوەکانی نازیزم قوتار بکات. پاشان "هابرماس" ئەڵمانەکانی لەوەش ووریاکردەوە کە جارێکی دی ببنەوە بە دوژمنی خۆرئاوا – واتە ببن بە دوژمنی رۆشنگەری و بکەونە دژایەتیکردنی–.

ئەمەش مانای وایە کە هەر لە بنەڕەتدا "هابرماس" فەیلەسوفێکی ئەقلانی و رۆشنگەرە و هەر لەبەرئەوەش سەرنجی بەلای مەترسی ئەو بانگەشانەدا راکێشاوە کە داوای تێپەڕاندنی فەلسەفە و ئەقلانیەتی رۆشنگەری دەکەن، بە بیانوی ئەوەی ئەمانە ئەوروپایان گەیاندە فاشیزم و نازیزم و ماڵوێرانی. ئەو پێی وایە سەرەڕای هەموو ئەوانەش پێویستە فەلسەفە لەسەر ئەرکی رەخنەیی خۆی بەردەوام بێت و تەنها ئەلتەرناتیڤی ئەقلانیەت و رۆشنگەریش هەر ئەقلانیەت و رۆشنگەریە.

"هابرماس" جەختی لەسەر ئەوەش کردەوە کە ئەوەی پێویستە تێپەڕێنرێت خودی فەلسەفە نییە، بەڵکو ئەو ناکۆکیەیە کە لە نێوان فەلسەفە و زانستدا دروستی دەکەن. ئەو بە کارێکی پێویستی دەزانی فەلسەفە زیاتر و زۆرتر وردتر و زانستیانەتر بێت، بۆئەوەی لەو خەسڵەتە ئەبستراکتیەی قوتاری بێت کە هەر بە تەسلیم و گرێ کوێرە دەچێت. هەروەها لەسەر فەلسەفە پێویستە لە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەلایەتیەکانی وەك (زمانناسی و رەگەزناسی و ئابوریناسی و کۆمەڵناسی و دەروننناسی) نزیك بێتەوە.

ئاراستەی ئەم جۆرە ئیشکردنە وایکرد "هابرماس" کەم تا زۆر لە قوتابخانەی فرانکفۆرت نزیك بێتەوە، چونکە ئەوانیش داوای شتێکی تەواو لەو جۆرەیان دەکرد و دەیانویست فەلسەفە لە قوللەی قافەوە دابەزێتە ناوجەرگەی ژیانی رۆژانە و تێکەڵ بە خەمە سیاسیەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگە بێت.

چونکە پێویستی و گرنگی فیکر لە چیدایە گەر بەکەڵکی خەڵك نەیەت و نەبێتە مایەی چاککردنی هەلومەرجی ژیانیان؟

ساڵی 1956 "هابرماس" لە زانکۆی فرانکفۆرتدا بوو بە یاریدەدەری "ئەدۆرنۆ" و لە ساڵی 1962 تێزەکەی خۆی دەربارەی (کایەی گشتی) پێشکەشکرد.

سەرەتا "هابرماس" چەپێکی تۆخ و بگرە مارکسیستێکی رەخنەگر بوو، بەڵام دواتر چەپرەویەکەی کاڵ بووەوەو لە مارکسیزمیش دوورکەوتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی لایەنە پۆزەتیڤەکانی فەراموش بکات

وەکی زۆر لە کەسانی تر کردیان. دوای ئەوە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی دەربارەی ئەقڵی کۆمنیکا شێونخوازی بڵاوکردەوە و تیایدا تیۆرییایەکی نوێی بۆ ئەقڵانیەتی خۆرئاوایی خستبووە ڕوو.

هەرچی پەیوەندی بە "هربرت ماركۆزە" شەوە هەیە، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەویش وەك زۆربەی بیریارانی قوتابخانەی فرانكفۆرت لە خەمی جیهانێکی چاکتر و کۆمەڵگەیەکدا بوو کە کەمترین ستەمی تێدا بێت و یەکسانی و عەدالەتی زیاتری تێدا بەرقەرار بێت. هەروەها "ماركۆزە" هەڵوێستێکی رەخنەیی توندی لە سەرمایەداری وەرگرتبوو.. لە رووی فیکریشەوە بەو ئاراستەیە کاریدەکرد کە "هیگڵ و مارکس" دایانڕشتبوو، بەلاّم وەکو زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرانی ئەوروپای ئەو سەردەمە نەکەوتەوە داوی کۆمۆنیستەوەو وەکو مارکسیستێکی رەخنەگر مایەوە.

شایەنی باسە لەسەر وەختی جەنگی ساردیشدا وەکی "جان پۆل سارتەر" بە دوای رێگای سێهەمدا دەگەڕا، چونکە نە سەرمایەداری بەدڵ بوو نە کۆمۆنیزم. لە هەندێ قۆناغیشدا – واتە لە شەست و حەفتاکانی سەدەی پێشوودا – فەلسەفەی "ماركۆزە" بوو بە ئنجیلی گەنجانی ئەوروپا. ساڵی 1964 کە کتێبی (مرۆڤی تاك رەهەند)ی بڵاوکردەوە، بە روداوێکی فەلسەفی گرنگ مەزەندەکراو تیایدا فەلسەفەی پۆزەتڤستی و شیکارگەری دایە بەر رەخنە کە ئەوکات لە جیهانی ئەنگلۆساکسۆنیدا بالادەست بوون، چونکە ئەو پێی وابوو ئەوانە فەلسەفەیەکی کۆنسێرڤاتڤن و بە هیچ شێوەیەك نایانەوێت واقعی سستەمی سەرمایەداری بگۆڕن.

لێرەوە "ماركۆزە" داوای دەکرد شۆڕشێکی فیکری لە خۆرئاوادا ڕووبدات، شۆڕشێك لەو دیدگا دیسپۆتیزمی و تەکنۆلۆژییەی ئەقڵ رزگارمان بکات و بمانداتە دەست دیدگایەکی ئازادیخوازانەتر و مرۆڤانەتر.

ئەقڵانیەتی خۆرئاوا لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بووە بە ئەقڵانیەتێکی وشکەهەڵاتوو بابەتگەرایی زیاد لە پێویست. بۆتە ئەقڵانیەتێکی ماتماتیکی و پراگماتی کە جگە لە سود و قازانج و چێژ بینین خولیایەکی دیکەی نییە. بە کورتیەکەی "ماركۆزە" پێی وایە ئەقڵانیەتی تەکنۆلۆژی مرۆڤی کورتکردۆتەوە بۆ کائینێکی (تاك – رەهەند) و هەموو رەهەندەکانی دیکەی ئافەرۆز کردووە، تراژیدیای خۆرئاوا و قەیرانی شارستانیەتەکەشی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت..

### سەرچاوە

بیان الکتب، ژمارە (243)، 30 دیسەمبەری 2002.

## توندڕەوەکان توشی شیزۆفرینیای کەسێتی بوون.. عەقڵیان نوێیە و ڕۆحیان بۆ سەردەمە تاریکەکان دەگەڕێتەوە.

هاشم سالح

لە ... ەد



هەموو ئوسولیەك تەنها ئاینی خـــۆی بەڕاســـت دەزانێـــت و ئاینەکانی دی بە چەواشەکارو بۆ ساتێکیش بیر لەوە ناکاتەوە ، کە ئوسولی ئاینەکانی تر وەك ئەو بیر بکەنـــەوە بـــەلأم بەئاراســـتەی پێچـــەوانە: بـــۆ نمونـــە ئوســـولی کاسۆلیکی باوەڕی وایە کە تەنها بیروباوەڕی کاسۆلیکی لای خودا راســـــتە و قبوڵـــــدەکرێت، هـــەروەها ســـەبارەت بـــە ئوســـولی یـــــــەهودی، بـــــــوزی ، و کۆنفۆشیۆسی...هتد.

بنیـامین بـاربییر یەکێکـە لـە رۆشنبیرە کاریگـەرەکانی ئێستای ئـــەمریکا، لـــەروی ناوبانگـــەوە هیچـــی لـــە فۆکۆیامـــا، ســـامۆئیل هانتیگنتۆن، چۆمسکی کەمتر نیە . وەلـێ رەنگـە نـاوی تـا ئێستا لە جیهانی عەرەبیدا وەك ناوبراوانی دی بلأونەبوبێتـــەوە، ئەمـــەش جێگـــای داخـــە چـــونکە توانـــای لەناوبراوانی تر کەمتر نیە. باربییر دژی بەرەی هانتیگتۆنە، کە تەنها رەخنـە لـە ئوسـولیەتی ئیسـلامی دەگرێت، بەبێ ئاوڕدانەوەیەك لە رەخنـــەگرتن لـــە ئیمپریالیـــەتی بازرگانی و فراوانخوازی ئەمریکا. بـــاربییر تـــەنها لایـــەك بەهەڵـــە دانانێـــت، بـــەڵکو هـــەردوولا: شارستانیەتی رۆژئـاوا بـێ کـەم و کـــوڕی نیـــە وەك هـــانتیگتۆن و فۆکۆیامـا بانگەشـەی بـۆ دەکـەن، ئـەو (فوضـی) جیهانیـەی ئیسـتا هـــەموو کۆمـــەڵگای گرتۆتـــەوە، بـــەرەنجامی تەقینـــەوە ئـــاینی رەگەزپەرستـی و تایەفگەرییـەکان نیـــە، بـــەڵکو دەرەنجـــامی ســـــەرمایەداری جیهـــانگیری چاوچـنۆکە، کـە تـەنها بـەهای زێـــدەبایی، تینویـــەتی بـــۆ بـــەکاربردنی پێداویســـتی، گەشەســــەندنی بــــازاڕە بازرگانیـەکان، دەزانـێ. جێگـای باســـە پرۆفیســـۆر بـــاربییر مامۆستای زانستە سیاسییەکانە لـە زانکـۆی نیـۆرك، یەکێکـە لـە رۆشـنبیرە نزیکـەکانی سـەرۆکی پێشـوو کلینتـۆن، واتـە سـەر بـە بـــالی نـــوێی رۆشـــنبیرە ئەمریکیەکانـــە، نـــەك بـــالی راستڕەوی پارێزگاری هانتیگتۆن و بـالی راسـت تـڕەوی لیبرالـی فۆکۆیامـا. بـۆ پێکـەنین بـاربییر لـەکاتی وانـە وتنـەوەدابوو، لـە زانکـۆی نیـۆرك، کاتێك فرۆکـەکان خۆیـان بـە سـەنتەری بازرگـانی جیهانیـدا کێشـا، بێگومـان ئـەو دیمەنەکـــەی راســـتەوخۆ لـــە پەنجەرەکانـــەوە بینـــی. ئـــەم روداوەش شـــــیکردنەوەکانی پێشـووی نـاوبراوی دەسـەلماند، دەربـــارەی ململانێـــی نێـــوان هێزەکـانی جیهـاد و کـەلتوری گەردوونی سەرمایەداری رۆژئاوا. مەبەسـت لـە جیهـاد، کـۆی ئـەو هێزانەن کە دژی مۆدێرنەن، دیارە ئوسولیە ئیسلامیەکان پێشەنگن، بـــە بۆچـــوونی نـــاوبراو ئوسولیەکانی یەهودی، مەسیحی، هیندۆسی و چەندینی تـر رقیـان لـــە مۆدێرنـــە و فەلســـەفەی رۆشـنگەرییە، وەك ئوسـولیەتی ئیسلامی، بەلأم بە شێوازو رێگای جیاجیا. وەلـێ وێـڕای ململانێـی نێـوان ئوسـولیەتی جیهـادی و ســـەرمایەداری جیهـــانگیری رامالـــدەر لەســـەر شـــێوازی ئـــــەمریکی، هـــــەروەها پێکداداچـوونیش هەیـە. لێـرەدا خـــالی نـــاکۆك و سەرســـامی دەردەکـەوێ، ئێمـە پێشـبینیمان دەکـرد کـە ئوسـولیەتی تونـدڕەو لەلایـــەك بـــێ و ســـەرمایەداری جیهـانگیر لەلایـەکی دی، بـەلأم راسـتی وادەرناکـەوێت. بۆنمونـە ئەوانـەی هێرشـیان کـردە سـەر نیـــۆرك و واشـــینتۆن، توانـــای بـەرزی خۆیـان بـۆ بـەکارهێنان و کـــۆنترۆڵکردنی تەکنـــەلۆژیا ســـەلماند، شـــارەزابوون لـــە بەکارهێنانی ئەنتەرنێت، دەزگـای زانیارییــــــە نوێیــــــەکان، فرۆکـــەی خێـــرا و تەکنـــەلۆژیای کاروبــــاری ئاسمــــــانی، مۆبایـل...هتـد. ئەوانـە کۆمەڵـە

گەنجێکی سەرلێشێواو و بێ ئەقڵ نەبوون، بەڵکە کەسانی خاوەن توانا و زیرەکیەکی بەرزبوون، سەرەنجام کەل و پەلی سیستمی سەرمایەداری رۆژئاواییان بەکارهێنا بۆ لەناوبردن و وێرانکردنی.

لە کۆتاییدا باربییر ئەنجامێکی سەرەکی بەدەست دێنێت ئەویش: بەڵێ ئەقڵی ئوسولیەکان ئەقڵی جیهانی نوێیە، بەڵام رۆحیان رۆحی سەدە تاریکەکانی ناوەڕاستە. ئەمەش خاڵێکی ناکۆك و تێڕامانە، کە قبوڵکردن و تێگەیشتنی ئاسان نیە، وەلێ دەتوانین راڤەی بکەین کەوا، ئوسولیەکان تەکنەلۆژیای رۆژئاوایان خۆش دەوێ بەڵام ڕقیان لە فەلسەفەی زانستی و رۆشنگەرییە و هەموو شێوازێکیش بە ڕەوا دەزانن، لەپێناوی بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای لاهوتی یاخود تاریکی بە سەرتاپای جیهاندا. هەندێك جار سەرسام دەبین لە هۆگربوونی ئوسولیە توندڕەوەکان، بۆ دەزگاکانی زانیاری و تەکنەلۆژیای نوێ، هاوکات دژایەتیکردنی بیرە نوێیەکانی رۆژئاوا، لێرەدا باوەڕدەکەین کە ئەوانە تووشی شیزۆفرینیابوون، بۆیە باربییر دەڵێ: عەقڵیان لەلایەکە و رۆحیان لەلایەکی دی. لەرووی لۆژیکیەوە دەبوایە تەواوی مۆدێرنەیان رەتکردبایەتەوە، چونکە بەرهەمی کفر و کافرانە ، بەڵام تەنها رووکاری دەرەوەی واتە ئامێرە تەکنەلۆژیەکانیان وەرگرتووە، رۆح و جەوهەریان رەتکردۆتەوە، بەمانای بیری فەلسەفی و زانستی بە مەترسییەکی گەورە دادەنێن بۆ سەر بیروباوەڕی لاهوتیان و ئامادەن هەموو ئامێرە نوێیەکانی تەکنەلۆژیا لەپێناو لەناوبردنیدا بەکاربهێنن.

بۆئەوەی زیاتر راستگۆو دادپەروەربین پێویستە بوترێ: هەروەها سەرمایەداری جیهانگیر بەتاڵکراو لە هەستی مرۆیی و ئەخلاق لێپرسراوە لە بەرامبەر ئەو دۆخەدا، بۆیە باربییر لە ناونیشانەکەوە هێرش دەکاتە سەر هەردوو بەرە ، بەبێ ئەوەی لەیەك ئاستدا دایانبنێ، بەئەمریکابوونی جیهان هەژاری و نایەکسانی ، بوون بە قوربانی بازاڕی جیهانی لەگەڵ خۆیدا دێنێت و هەست دەکەیت چارەنووست لەلایەن هێزە نادیارەکانی پشت پەردەوە، یا پەنجەدانان لەسەر ئامێرەکانەوە دیاریکراوە. بۆیە ئەگەر رێڕەوی جیهانگیری راست نەکەینەوە ، ئەوا جەنگ لە دژی ئوسولیە توندڕەوەکان سەرکەوتن دەستەبەر ناکات، کە تائێستاش بۆش بە پێچەوانەی کلینتۆنەوە تێیناگات.

ئوسولی جیهادی ڕقی لە بەرامبەرە، چونکە سەر بە باوەڕ و ئاین و مەزهەبەکەی نیە، لەبەرئەوەی باوەڕی بە راستییە پیرۆزەکەی ئەو نیە، کوشتن و خوێنڕشتنی حەڵاڵە. بەبۆچوونی ئوسولیەکان ئەوە کەسێکی بێ بوونە، وەك دەڵێن (ئاین لە سنگیدا نییە) و نەزانە، هیچ نیە، مێرووە، لەبەرئەوە بە تاك و بەکۆمەڵ کوشتنیان کێشە دروست ناکات، بەپێچەوانەوە حەڵاڵە و جێگای رەزامەندی خودایە. بێگومان هەموو ئوسولییەك بەتەنیا ئاینی خۆی بەڕاست دادەنێ، ئاینەکانی دی بە چەواشەکار و تەنانەت بەبیریدا نایەت کە ئوسولیەکانی تر وەك ئەو بیردەکەنەوە بەڵام بە ئاراستەی جیاواز: بۆنمونە ئوسولی کاسۆلیکی باوەڕی وایە تەنها بیروباوەڕی کاسۆلیکی راستەو قبوڵکراوە لای خودا، بەهەمان شێوە سەبارەت بە ئوسولی یەهودیو هندۆسی، بوزی، کۆنفۆشیۆسی... هتد.

بەڵام سەرمایەداری جیهانی بە سیفەتی ئامێرێکی بەکاربەر یا ژمارەیەك لە ژمارەکان سەیری مرۆڤەکان دەکات، هەموو ئامانجیشی فراوانکردنی بازرگانی و کۆمپانیاکانیانە لە هەموو جیهاندا ئەگەر بۆیان بکرێ و هەموو دەرهاویشتەکانی وەك کارەسات و ماڵوێرانی و برسێتی جێگای بایەخپێدان نییە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا مرۆڤ وەلانراوە، وەلانانی دووەم جیاوازی لەگەڵ وەلانانی یەکەمدا هەیە، لەڕووی تیۆرییەوە کوشتنی مرۆڤەکان حەڵاڵ ناکات، چونکە ئایدۆلۆژیایەکە لاهوتی نییە بەڵکو تەواو مادییە. لەڕاستیدا ئەو فەیلەسوفانەی بەم دواییە رەخنەیان لە مۆدێرنەی رۆژئاوا گرت، بابەتەکانیان بەڕوونی خوێندبۆوە کاتێك وتیان: بێگومان عەقڵ و زانست و تەکنەلۆژیا هەموویان پێشکەوتن بەرهەم دێنن، هاوکات چەوساندنەوەو ئیمپریالیش بەرهەم دێنن و چاکەکردن، دژەکەشی بەرهەم دێنێ کە گرێدراوی یەکترن، ئەمەش راستیەکی حاشا هەڵنەگرە. ئەمەش بەمانای مۆدێرنە بۆتە دیاردەیەکی دیالەکتیك و گونجاو. بەڵام خاسیەتی سەرەکی ئوسولییەتی ئاینە توندڕەوەکان ئەوەیە دیالەکتیکی نییە، بابەتەکان بە رەش و سپی دەخوێنێتەوە، بۆنمونە رۆشنگەری بە فەلسەفەیەکی عەلمانیەتی کافر ئەژمار دەکات. لە تێڕوانینی ئەوانەوە شارستانیەتی رۆژئاوا تاوانبارن، تەنها تەکنەلۆژیا و داهێنانەکانیان نەبێ. هەروەها دانەر چەند نمونەیەك دێنێتە پێش چاو سەبارەت بەپێکداداچوونی نێوان عەقڵیەتی ئوسولیو جیهانگیری ئەمریکی، کە ماوەی چەند ساڵێکە جیهان بە ئامێرە زانیارییەکانی، چێشتخانەکانی و وێنەکان و ئەڵقە تەلەفزیۆنەکان و مۆسیقا میللیەکان... تاد, رادەماڵێت. پیاوانی ئاینی ئێران لەلایەکەوە کە لایەنگرانیان بۆ جیهادکردن ئامادە دەکەن، ئەو پیاوانەشن لەلایەکی ترەوە سەیری زنجیرە تەلەفزیۆنی ((دیناستی)) ئەمریکی دەکەن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان. کەنیسەی ئەرسەزۆکسی رووسی کە هەوڵی زیندوکردنەوەی باوەڕی کۆن و ئوسولییەت دەدا لەدوای هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم، هاوتەریب هاوکاری سەرمایەدارە ئەمریکیەکان دەکات لەپێناوی دەستبەسەراگرتنی ئاوی کانزایی و هەڵگرتنی لە شوشەی پیرۆزدا کە ناوی (ئاوی سەرچاوە پیرۆزەکان)!. هەموو ئەمانەش لەپێناوی بەدواداچوونی گەلانی سادە (باوەڕدار) وکڕینی..

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین سەرمایەداری تێکەڵاوی ئوسولیەت دەبێ و مۆدێرنە بە کۆنەپەرستی و ماتریالیستی بە رۆحانیەت. دەمارگیرە سربیەکان لەلایەك جلی وەرزشی تێنسکردن جۆری (ئەدیداس)یان دەپۆشی و گوێیان لە گۆرانییەکانی (مادۆنا) دەگرت، لەلایەکی دییەوە بۆردومانی هاوولاتیە سیڤیلەکانی بۆسنەیان دەکرد لە سەرایيڤۆ. بەڵام یەهوودە توندڕەو و نازییە نوێیەکان لە خاسیەتێکدا هاوبەشن: ئەویش بەکارهێنانی مۆسیقای رۆکی ئەمریکییە بۆ گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکانیان بۆ نەوەکانی داهاتوویان! بەڵام ئوسولیە ئیسلامیەکان ئەکتیڤ بوون لە بەکارهێنانی مایکەکانی دەنگ و کاسێتە تەسجیلکراوەکان، تەنانەت ئەنتەرنێت و تازەترین ئامێری زانیاری، لە پێناوی گەیاندنی بۆچوونەکانیان و وتارە ئاگرینەکانیان بۆ جەماوەر. ئەم تێکچڕژانە نامۆ و نائاساییەی

نێوان نوێترین ئامێری تەکنەلۆژیا و کۆنترین و دواکەوتووترین جۆری بیرەکان ، یەکێکە لە سیما دیارەکانی سەردەمی ئێستا.

ڕەنگە گەیشتبینە سەردەمی سەرسوڕهێنەران و هیچ داواکردنێکی تر نیە. بۆیە وشەی (جیهاد)ی بەکارهاتوو لە ناونیشانی کتێبەکەدا، مانای جیهادی ئیسلامی ناگەیەنێت، بەڵکو هەموو ئوسولییە ئاینیەکانی تری دژی مۆدێرنە، بەڵام تا کەی؟ ڕەنگە دوای بیست یا سی ساڵی دی، بەڵام نەك پێش ئەو، هیوادارین بەهەڵەدا چووبین. تەنانەت دانەر باس لە جیهادی ئەمریکی دەکات و بە جیهادی ئیسلامی بەراوردی دەکات چونکە گەورەترین تەقینەوەی تیرۆریستی لە ئەمریکا جگە لە (11)ی سێبتەمبەر ، تەقینەوەی ئۆکلاهۆما سیتی بوو کە بووە هۆی قوربانیدانی سەدان کەس و ڕاستڕەوێکی توندڕەوی ئەمریکی ئەنجامی دا. بەهەمان شێوە دروشمی توندڕەوە ئیسلامیەکانیان بەرزدەکردەوە. باشە بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا تەنها باس لە تیرۆری ئیسلامی و توندڕەوی ئیسلامی دەکات؟ بۆچی کەمایەتیەکی توندڕەوی بەهێز تێکەڵاو بە زۆرینەی موسوڵمانانی میانڕەو دەکات؟ و کێ بەم جۆرە هاندەرە لەسەر موسوڵمانان و بۆ بەرژەوەندی کێ؟.

بنیامین باربیر دەڵێت: دەوروبەری ساڵی(1920) شێخ حەسەن بەنا، دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیخوان ئەلموسلمین، ئیدانەی ئەو شەپۆلی گومرایی و خراپیەی دەکرد کە ڕووی کردۆتە میسر. ووتی: خەریکە بنەما ئەخلاقی و ئاینیەکان بە بیانوی ئازادی بیر و تاك لەناوببات و خراپی ڕۆژئاوای لە ناردنی ئافرەتە نیمچە ڕووتەکان خستەروو! هەروەها باسی لە خراپی ناردنی خواردنەوە کهولیەکان و فیلمە سینەماییەکان، سەما ڕووتەکان، گۆڤارو چیرۆك، یارییە بێ مانا و خراپەکانی دەکرد. بەم شێوەیە شێخ بەنا پێش سەردەمی جیهانگیری ئەمریکی کەوت و بەچاوی خۆی بینیویەتی پێش ئەوەی ببێتە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگر و جیهان بگرێتەوە. هەروەها لە داگیرکردنی ڕۆشنبیری ئەوروپا بۆ میسر و هەموو جیهانی ئیسلامی مەترسییەکی گەورەترە، لە هەڵمەتە سەربازییە کۆلۆنیالییەکان و بەبیری تیژی زانی ئەوەی کە داگیرکەری ڕاستەوخۆ توانای نەبوو بیکات هاتنە ناوەوەی ڕۆشنبیری دەیکات، دەتوانرێ سوپاکان لەسەر سنور بوەستێنرێت، بەڵام بیرەکان سنوریان نیە. بەڵام قسەکانی هیچ جیاوازیان لەگەڵ قسەی پیاوانی ئاینی مەسیحی لە ئەوروپا و ئەمریکا، قسەی پاپاکانی ڤاتیکان نیە. نمونەیەك دەخەینە ڕوو: یەکێك لە سەرکردەکانی بزوتنەوەی پرۆتستانتی توندڕەو لە ئینگلتەرا بەناوی (براین)، بەتوندی ئیدانەی شانۆگەرییەکی کرد چونکە هانی خراپە و بەرەڵایی ئەدات. ووتی: ئەو شانۆگەرییە سیخناخە بە دیمەنی گومرایی و سۆزی تواوە کە ئەخلاق خراپ دەکات، بەگوێرەی قسەکانی ژیانی نوێ، پڕیەتی لەدیاردەی دژی ژیانی بێگەردی مەسیحیەت. لەو بارەیەوە نمونەیەکی باسکرد، سەمای پیاو لەگەڵ ئافرەتدا. هانای بۆ خودا بردوو گوتی ئەوە کاری ئەهریمەنە. هەروەها ئاماژەی بۆ یاریەکانی بەخت و وێنە ڕووتەکان و وێنەی ئافرەتە ئاڵۆشهێنەرە ڕازاوەکان، مۆسیقای ئالۆش، دیاریەکانی

سەری ساڵان، رازاندنەوەی مێزی یادەکانی لەدایك بوون کە پڕە لە خواردن و خواردنەوە و پێکەنین و نقوم بوون لە خۆشی و پێکەنیندا، کە هەموو ئەمانە مرۆڤ لە خودا دوردەخەنەوە و بیریان دەچێت. هەروەها قسەکانی لە قسەی سەرکردە ئوسولیەکانی ئەمریکا وەك (باس رۆبیرتسۆن)، (باس کۆنان) ناچێت کە کاندیدی پێشووی سەرۆکایەتی ئەمریکا بوو، لە واو ژان ماری لۆبنی فەرەنسا دەچێت, کە هەموویان بانگێشەی گەڕاندنەوە بۆ پێودانگی خێزانی دەکەن کە تا سەدەی نۆزدە لە ئەمریکا باوبوو بگەڕێنەوە بۆ کەنیسە بۆ بەجێهێنانی کارە پیرۆزەکانیان و گەڕاندنەوەی نوێژ بۆ قوتابخانە ئەمریکیەکان دوای ئەوەی سیستمی عیلمانی رایبماڵێت. بەکورتی ئەمانە، بانگێشەی گەڕاندنەوە بۆ سەردەمی زێڕینی ئەمریکای مەسیحی پرۆتستانتی دەکەن. باربییر کۆتایی بە قسەکانی دەهێنێت و دەڵێ: گومانی تێدا نیە مۆدێرنە گەورەترین دوژمنیشی تەنانەت لە ئەمریکای دڵی بەهێزی سەرمایەداری و جیهانگیری و مۆدێرنەدا هەیە! ئەوان رقیان لە کەلتوری گشتی دنیاییە، کە هەژمونی بەسەر کۆمەڵگای ئەمریکیدا کردووە پێیان خۆش بێ یان نا. ئەو کەلتورەی کە رادیۆو تەلەفزیۆن پەخشی دەکات، هەژمونی بەسەر تەواوی گەردوونی عەلمانیدا گرتووە، رۆشنبیری سیاسییە لیبراڵەکان وەك نمونەی کلینتۆن و ئەوانی دی. لیبرالیەکان خوێندنی تیۆری گەشەسەندنی داروینیان لە قوتابخانەکانی ئەمریکا سەپاند، بە بیانوی بێلایەنی و عەلمانیەت نوێژی مەسیحییان لە قوتابخانەکاندا یاساغ کرد. بۆیە کلینتۆن کەسێکی زۆر بێزراوە لەلایەن راستڕەوی مەسیحی بەپێچەوانەی بۆشەوە کە زۆر خۆشەویستە، کە ئیمرۆ هاوپەیمانی مەسیحی دەستەبەری دەکات. بۆیە دەتوانین بە کۆپییەکی راستڕەوی توندڕەوە ئیسلامیەکانی دابنێین، چونکە بەلایەنی کەمەوە تائێستا پەنا بۆ لێدان دەبات هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە کەمایەتییەك لەناو کۆمەڵگادا پێکدێنن، کە بیری مۆدێرنە و رۆشنگەری و لێبوردنی ئاینی بەگشتی بالأدەستە. بەپێچەوانەی ئەفغانستان و پاکستان و ئێران و سەرجەم کۆمەڵگا ئیسلامی و عەرەبیەکان، کە رێژەکە تەواو پێچەوانەیە, کە هیچ کەسێك ناتوانێت بەئازادی هەوا هەڵبمژێت لەترسی تاوانبارکردنی بە کافر و دەرچوون لە بیروباوەڕە پیرۆزەکان. بەلأم چارەسەر چییە بۆ رزگاربوون لە مەترسی ئوسولیەتی ئاینی لەلایەك و سەرمایەداری جیهانگیری چاوچنۆك لەلایەکی تر؟ بەپێچەوانەی وێناکردنمانەوە چارەسەر دەستبەرداربوونی جیهانگیری نیە، بەڵکو بەزیاتر دیموکراسیکردن و دادپەروەرتر و مرۆییانەترکردنی چونکە تەواوی سەرمایەداری نێگەتیف نیە، بەڵکو پۆزەتیفی زۆرەو نکۆڵی لێناکرێت، بەپێچەوانەوە توانای سەرکەوتنی بەسەر زۆر لە سیستمەکاندا نەدەبوو، تەنها کار پێویستە بخرێتە سەر رێڕەوی راست و کەمکردنەوەی زیادەڕۆییەکان. بەلأم سەبارەت بە ئاین پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان ناوەرۆکی رۆحانی و ئەخلاقی کە لە هەمووان بەرزترە بکرێت، لەگەڵ ئایدۆلۆژیای توندڕەو کە خۆی لەسەر ئاین ئەژمار دەکات کە لە راستیدا خیانەت لە پەیامی ئاینەکە دەکات.

*جیهاد دژی بەئەمریکابوونی جیهان: جیهانگیری سەرمایەدار و توندڕەوی ئوسولی

دژی دیموکراتیەت. دانەر/ بنیامین باربیر. خانەی چاپ/ ماشیت – پاریس.19-1-2003.

## لێدوانێك لە كتێبی "شانۆ و تەفسیر و هەڵوەشاندنەوە و ئایدۆلۆژیا"

**کامەران سوبحان**

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە دانسقە و پڕ بەهاکان لە دونیای شانۆدا, کە بە ڕەهەندێکی قوڵەوە لە تێز و چەمکە شانۆییەکانی کۆڵیوەتەوە, لەمەش گرنگتر راستەوخۆ بۆچوون و دیدو تێڕوانینی چەندین رەخنەگر و بیریاری شانۆیی هێناوە لەبارەی بەها ئیستاتیکی و مەودا مەعریفیەکانی دونیای شانۆ..

دیارترین رەخنەگران لەم کتێبەدا کە تیۆر و بۆچونەکانیان باسی لێوەکرابێت "پیتەر بروك و تیری ئیجەلتۆن و سوئیلین کیس و چەندین رەخنەگری دی, ئەم کتێبە لە لایەن رەخنەگر و وەرگێڕانی شانۆیی (نهاد صلیحە – سارە عنانی – سەنا صلیحە)ەوە کراوە بە عەرەبی و لە ساڵی (2000) لە قاهرە لە دوتوێی (346) لاپەڕەدا چاپکراوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم کتێبە باس لە گیروگرفت و بۆچونێك دەکات کە ئەمڕۆ لە پانتایی ڕەخنەی ئەدەبی و بەها فیکری و میتۆدیەکان قسە و باسێکی بەرفراوانیان لەسەر دەکرێت, لەوانە بەها هونەریەکان کە ئایا ئەو بەهایانە ڕێژەیەکی مێژوویین یان چەسپاوێکی رەها؟؟

دواتر پەلدەهاوێت بۆ پەیوەندی ئایدۆلۆژیا بە تەفسیر و شیکاری رەخنەیی کارێکی ئەدەبی و هونەری و پەیوەندی نێوان فیکر و درامای کلاسیکی, جگە خۆدان لە باسی دیاردەی داهێنان لە شانۆدا وەك ئەو ئەزمونگەلەی کە ئەمڕۆ لە جیهانی شانۆدا مومارەسە دەکرێت لەوانە ئەزمونی (ئاریان مونشکین) و ئەزمونی شانۆی ڕۆژ لە فەرەنسا, کە ئەزمونێکە پێویستی بە هەڵوێستە و لە سەر وەستان هەیە. تەوەرە سەرەکیەکانی ئەم کتێبە لە چەند بەشێکی گرنگدا خۆی دەبینێتەوە کە پێکهاتون لە: (گرفتی بەها هونەرییەکان کە دیالۆژێکی دورودرێژە لە نێوان ڕەخنەگری ئەدەبی تیری ئەنجلتۆن و ڕەخنەگری هونەری پیتەر فووللر, رەهەندی ئەم دیالۆژەش خۆی لە خاڵێکی سەرەکی دەدات ئەویش ئایا بەها هونەرییەکان لە لایەنی چێژبینینەوە بەهایەکی ڕێژەیی و دیاریکراون یان بەهایەکی رەها و نادیار, دواتریش ئەم بابەتە پەل دەهاوێت بۆ مانای کەلەپوری ئەدەبی و پێوانەیی لە کارێکی ئەدەبی تۆکمەدا, پاشتریش لە هەریەك لە مانای هونەری میلی و رۆشنبیری میلی دەدوێت, تا دەگاتە حاڵەتی بایلۆژی و دەرونی مرۆڤ لە هەست کردن بە بەها ئیستاتیکیەکان و دوا تەوەریش لەم گفتوگۆیەی نێوان ئەنجلتۆن و پیتەر فۆللر دەگاتە گفتوگۆ لەبارەی بەهای ئیستاتیکی و بەهای ئەخلاقی و پەیوەندیان بە یەکەوە) ئەم بەشەو ئەم گفتوگۆیە خۆی لە خۆیدا شێوازێکی نوێیە لە باسکردن لە گیروگرفت و بەهایەکی هونەری کە ئەمڕۆ قسە و باسێکی بەرفراوانی لەسەر هەیە, بە تایبەتی لە دونیای شانۆدا و چۆنیەتی دۆزینەوەی ڕەگی شانۆ و تەقسە میللییەکان لە ناو کەلەپوری نەتەوایەتیدا. لە بەشی دووەمدا لە کتێبی تەفسیر و هەڵوەشاندنەوەو ئایدۆلۆژیا کە کریستۆڤەر بەتلەر نوسیویەتی, کریستۆڤەر بەتلەر مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزیە لە زانکۆی

ئۆکسفۆرد و ئەم کتێبەی لە ساڵی 1984دا نوسیوە کە دواتر ئەم کتێبە بوەتە ناونیشانی کتێبە وەرگێڕاوەکەی (نیهاد صلیحە)ش.

بنەمای ئەساسی لەم کتێبەدا یان لەم بەشەدا کە بەناوی (تەفسیر – هەڵوەشاندنەوە – ئایدۆلۆژیا)یە، باسکردنە لە میتۆدە جیاوازە نوێکان لە تەفسیری تێکستی ئەدەبیدا بە هەموو ئاراستە دژوارەکانەوە لە بونیادگەریەوە بۆ هەڵوەشاندنەوە و بۆ مارکسی و بۆ لیبرالی.. هتد کە هەریەکە لەم قوتابخانە و ئاڕاستە ئەدەبیانە میتۆدێکی تایبەتی هەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ بنەما و چەمکەکانی دەقدا، دواتریش پەیوەندی هەریەک لەم قوتابخانانە بە زاکیرەی موفەسیر و ڕەخنەگرەوە کە تا چ ئاڕاستەیەک لە ژێر ئایدۆلۆژی قوتابخانەکەدا دەقەکە تەفسیر و شیکار دەکات. باتلەریش هەرەمی تێکست دابەش دەکات بەسەر سێ ڕەهەنددا ئەوانیش:

أ–بابەت و بیرۆکەی تایبەتی لە سکێچی دەقدا.

ب–سیاق و پێگەی ئەندێشەیی کە لە ناو دەقدا باسی دەکات و مانا و دەلالەتی جیاوازی پێ بەرهەم دێنێت.

ج–سیاقی مێژوویی حەقیقی دەق کە بە (*context*) ناودەبرێت کە نوسەر لە دوای خوێندنەوەی مێژو و تێکستی پێ بەرهەم دێنێت، ئەم سیاقە مێژووییەش دوەمین سنوری گەڕانەوەیە بۆ دەلالەت و ئاماژەکانی نێو دەق کە بێگومان ئەم سێ ڕەهەندە یارمەتی شانۆکار و شیکەرەوەی دەق دەدات زیاتر هەیمەنەی دەق بکات، دیارە شانۆکار زیاتر "دەرهێنەر" دەگرێتەوە چونکە ئەو بەرپرسە لە دۆزینەوە و پەی بردن بە هەموو نهێنیەکانی دەق.

هەمو تێزەکانی ئەم ڕەخنەگرە لە چوارچێوەی سنوری مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا خۆی دەبینێتەوە، چونکە ئەو پێی وایە دەق یەکەمین ڕوبەڕوبونەوەیە لە نێوان نوسەر و ڕەخنەگردا، دواجاریش دەبێتە خاڵی ڕوبەڕوبونەوەی نێوان نوسەر و دەرهێنەر کە هەڵدەستێت بە کەشف کردن و پەیبردن بە سەرجەم شفرە و نهێنییەکانی دەق.

جەختی ئەم ڕەخنەگرە لە سروشتی پەیوەندیەکەدا کە نەفی پەیوەندی ئایدۆلۆژی و ڕوکاری دەکات لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا، نابێت ڕەخنەگر تێزە ئایدۆلۆژیەکانی خۆی بەسەر دەقدا بسەپێنێ، چونکە دەق سنورەکانی تا دوا پلەی بون ڕەها و نادیارە و هەرگیزیش دەقی زیندو مامەڵەی ئایدۆلۆژیانەی ڕەخنەگر قبوڵ ناکات!!

لە بەشێکی تردا بە ناوی (فیمینیزم و شانۆ.. تێڕوانینێکی تەقلیدی بۆ مێژوی شانۆ، خوێندنەوەیەکی هەڵوەشاوەیی "تفکیکی" بە تێڕوانینێکی ژنانەو فیمینیزمیانەوە)

ئەم نوسینە لەم بەشەدا کە (سۆئیلین – کیس) نوسیویەتی باس لە دیاردەیەک دەکات کە چۆن پیاوان لە سەردەمی کلاسیکدا بە جلوبەرگی ژنانەوە ڕۆڵی ژنانیان بینیوە، ئەمیش بێگومان لە غیابی ڕەگەزی ژن بوو لە شانۆی کلاسیکدا، بۆیە نوسەر پێی وایە ئەگەر بەپێی ئەو تێڕوانین و کتێبانەی کە لەلایەن ژنانەوە نوسراوە مێژوی شانۆ بخوێنینەوە ئەوا یەکسەر ئەوە تێبینی دەکەین کە ژنان لەم کەلتورە هونەرییەدا نائامادەن.

توێژینەوە فێمینیستیە سەرەتاییەکان گرنگیان بە مەسەلەی غیابی ژنان داوە لە بواری نوسینی شانۆدا کردویانە

بە کێشەی سەرەکی خۆیان، تەماشاکردنی مێژویی بۆ دەقی شانۆیی ژمارەیەکی کەم لەو دەقانە نیشان ئەدات کە پێش سەدەی (17) ژنان دایانهێناوە، ئەم تێڕوانینەش ئەو هەستەمان لا ئەبزوێنێ کە ژنان لە چەرخی شانۆی کلاسیکدا نائامادەبون، لەبەرئەوەی تێڕوانینە فیمینیستیەکان کە گرنگی بە داهێنانی ژنان لە بواری شانۆدا دەدەن سەرنج لەو قۆناغە مێژوییانە دەگرن کە دەنگی ئەوانی لە گۆڕەپانی داهێنانی شانۆیی بەخۆیەوە بینیوە، بە تایبەتیش لە دوای سەدەی (16)هەمەوە لە بەریتانیا و سەدەی نۆزدە لە ئەمەریکا، ئەم توێژینەوانە ئاماژە بەوە دەدەن کە لە سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێك کتێبی چاپکراوی شانۆیی دەرکەوتن کە ئافرەتان خۆیان نوسیویانە، هەندێك کتێبی تریش باس لە ژیاننامەی ژنە نوسەرەکانی شانۆ دەکەن. وردبونەوە لە وێنەی ژنانی ناو ئەم شانۆنامەی کە پیاوان نوسیویانە زۆرێك لە توێژەرەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە کتێبە بەناوبانگەکەی (*Katemillett*) بە ناوی (دیاردە سیاسیەکانی جیاوازی سێکسی کە لە ساڵی 1970 چاپکراوە دەسپێکی ئەم بوارە بووە).

واتە بواری توێژینەوە لە بارودۆخی ژن لە شانۆی کلاسیکدا، نوسەر لەم کتێبەدا شێوازێکی میتۆدۆلۆژی بەکارهێناوە، بە هۆیەوە توانیویەتی وێنەی ژنان شیبکاتەوە، وەك ئەوەی تێستە کلاسیکیەکان باسیان لێوەکردوەو چەوساندنەوەی ژنان لە لایەن پیاوانەوە دەردەخات. دواتر لە بەشێکی تردا دێتە سەر ئەزمونی شانۆی (ئاریان مۆنشکین) و شانۆی رۆژ ئەم بەشە کە (دافید ویتۆن) نوسیویەتی باس لە ئەزمونی هاوچەرخی شانۆی فەرەنسی دەکات لەسەر دەستی مۆنشکین، کە نزیکەی (20 ساڵ) بەردەوام لە چالاکی و بەرهەمی هەمەجۆر کە خۆی لە قاڵب و فۆرمێکی نوێی شانۆییدا بینیەوە کە لەوەو پێش ئەم ئەزمونانە نەبینراوە، ئەمە جگە لەوەی ئەزمونی شانۆی رۆژ پرسیارگەلی بەرفراوانی هێنایە بون سەبارەت بە چەمکەکانی شانۆ لەوانەش (ئەکتەر، نواندن، تێکست، بینەران، دەرهێنان، ئێکسسوار).

لە بەشێکی دی ئەم کتێبەدا کە من پێم وایە گرنگترین و تۆکمەترین بەشە باسێکی دورو درێژ سەبارەت بە (شانۆی ماتەم –پرسە)ی ئێرانی و لێکۆڵینەوەیەکی (سیمیائی)کە بە نوسەر و ڕەخنەگری شانۆیی (ئەندریە فیرث) نوسیویەتی.

شانۆی (ماتەم یان پرسە) پرسیارگەلێکی بەرفراوانە سەبارەت بە ئاهەنگی میلی و سروتە ئاینیەکانی ئێران بە تایبەتیش ئاهەنگی (حەسەن و حسێن) کە ڕەگەکەی لە مەزهەبی شیعەگەرێتیەوە گەشەی کردوەو رەگێکی قوڵی ئاینی هەیە.

وشەی ماتەم یان تەعزێ (*Taziyeh*) کە شێوازێکی فۆرمەلەیە لە کردەی شانۆیی، جگە لە هاوبەشی کردن لە نێوان ویژدان و هەستەکانی مرۆڤ لە پێناو پاکبونەوەی ئیحساس لە کەرنەڤاڵە ئاینیەکان بە تایبەتی دوای ئەو چرکەساتەی کە مرۆڤ لەم یادەدا هەست بە تاوانباری خۆی و بێ تاوانی (حەسەن و حسەین) دەکات ناچار بە زنجیر لە خۆی دەدات. هەموو ئەمانە لە ناو فۆرمێکی شانۆییدا دەبینرێت بە شێوازێکی ڕێکخراو، هەموو ئەم

یادەش لە یادی عاشورادا ڕێکدەخرێت.

نوسەر شێواز و فۆرمی ئەم تەقسە شانۆییە بەسەر دوو شێوازدا دابەش دەکات کە بریتیین لە:

1-شێوازی یەکەم:

پێکهاتووە لەخۆدان و لاواندنەوە لە شارە شیعە نشینەکانی ئێران، بۆیە بەرزڕاگرتنی ئەو یادە کە سەرەتای ئەم شێوازەش لەم یادە لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا گەشەی کردوە.

2-شێوازی دووەم:

لە سەدەی شانزەهەمدا گەشەی کردوە. ئەم شێوازەیان زیاتر گرنگی بە گێڕانەوە ئەدات، ئەویش گێڕانەوەی ژیانی (حسەین) و شەهیدانی تر کە ڕاوی و گێڕەرەوە لەسەر سەکۆیەکی بەرز ئەوەستێت و گوێگرانیش لە خوارەوە گوێی بۆ دەگرن..

ئەم دوو شێوازە لە ئەنجامی گەشەسەندنیەوە پەرەی سەند تا گەیشتە فۆرمێك لە كردار و پرۆسەی شانۆیی، ئەمە جگە لەوەی ئەم سروتە ئاینیانە لە پێناو دۆزینەوەی ڕەگی شانۆیی تێیاندا تا ئێستا چەندین کۆنگرە و سیمیناری جیهانیان بۆ بەسراوە لەوانە لە مانگی ئۆغستۆس لە ساڵی 1976 سیمینارێکی نێودەوڵەتی لە (شیراز) بەسرا بە ناوی (ماتەمی ئێرانی یان تەعزیی ئێرانی و دواتر بوو بە ڤیستیڤاڵێکی ساڵانە وە لە ساڵی 1979 زانکۆی نیویۆرك لێکۆڵینەوەیەکی چاپکرد و دواتر گفتوگۆ و دیالۆگی لەسەرکرا لە شێوەی کتێبێکدا بە ناوی (پرسە "ماتەم"ی ئێرانی لە نێوان سروت و درامادا) کە ڕاستەوخۆ بە سەرپەرشتی (پیتەر شلکۆفسکی مامۆستای دراسات و لێکۆڵینەوەی فارسی و ئێرانی بوو.

ئەم سیمینار و هەوڵانەش هەموی لە چوارچێوەیەکدا دەخولایەوە کە شانۆی ماتەم (پرسە) ڕەگێکی قوڵی درامایی و کردەی شانۆیی تێدا کەشف کەن، هەروەك چۆن لە یۆنانی کۆندا جەژنە ئاینی و دیۆنزیۆسیەکان بونە بنەمایەکی سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی شانۆ و دواتریش شانۆی کلاسیك بۆ یەکەمجار لەوێوە گەشەی کرد، نابێت ئەوەشمان لەیادچێت ئەم شێوازە شانۆییە کە ئەمڕۆ لە ئێرانی هاوچەرخدا بە چەندین شێواز گەشەی کردوە ڕەگێکی قوڵی کەلتوری میللی وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی پێوە دیارە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خاوەنی دەوڵەمەندترین کەلتور و داستان و ئەفسانەی میللییە.

هەمومان بە قۆناغی منداڵیدا تێپەڕیوین، ئەو قۆناغەی پڕە لە نهێنی و پرسیاری سەیر سەیر، نهێنی و پرسیاری چۆنیەتی دروستبونی گەردون و هاتنەدنیای خۆمانەوە، چۆنیەتی هاتنی شەوڕۆژ و داکردنی بەفرو

باران، چۆنیەتی وەستانی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە، ئەم قۆناغە گەرچی پڕیەتی لە پرسیار، گەرچی بەئاسانی منداڵ دەتوانێ پرسیاری هەمەجۆر و سەیر بکات، بەڵام زۆر بەدەگمەن وەلاَمێکی ڕاستی دەستدەکەوێت، زۆر بەکەمی یەکێك دێت و هەندێ شتی دروست و ڕاستی سەبارەت بە پرسیارە بێشومارەکانی پێ دەڵێ، نەبونی وەلاَمێکی گونجاو بۆ پرسیارەکان یەکەم هەنگاوە بۆ ئەوەی منداڵ عەوداڵی گەڕان و پشکنین ببێت، خۆی هەوڵدەدات وەلاَمێکی گونجاوی دەست بکەوێت.

ئەم قۆناغە سەرەڕای ئەو پرسیارانەی کە ڕۆژانە منداڵ دەیکات بۆخۆی خاوەنی جۆرێك لە شەڕانگێزییە، لەم قۆناغەدا کەم نین ئەو ساتانەی منداڵ سەرقاڵی شەڕ و کاری تێکدەرانە و ڕاوکردنی باڵندە و کوشتنی ئەو زیندەوەرانەیە کە توانای بەسەریاندا دەشکێ، کەم نین ئەو ڕۆژانەی منداڵ بەهۆی هاروهاجی- چ لە ماڵەوە بێت یان لە قوتابخانە- دارکاری دەکرێن و گەر لە قوتابخانەش هاتنە دەرەوە دیسانەوە یەخەی یەکتر دەگرن و تێکهەڵدەچنەوە، شەڕە گەڕەك و شەڕە قۆچەقانی هەر لەم قۆناغەوە سەرچاوە دەگرن، زیزبون و توڕەبون و هەڵچونی منداڵ لە دایك و باوك و ئەندامەکانی دیکەی خێزان هەر لەم قۆناغەوە دەستپێدەکات، بەلاَم ئەم شەڕانگێزیەی کە لەم قۆناغەدا دەردەکەوێت مەرج نییە ئەنگێزەیەکی دوژمنکارانە یاخود تێکدەرانەی لەپشتەوە بێت، مەرج نییە ئەو پاڵنەرانەی کە لە پشتی ئەم کارانەوەن لە خودی شەڕانگێزی و حەزی منداڵەوە بێت بۆ کاری توندوتیژی، بەڵکو ئەو جۆرە شەڕانگێزیەی کە لەم قۆناغەدا لای منداڵ دروست دەبێت جۆرێکە لە یاریکردن و گەمە و دنیای منداڵ، ساتێکە منداڵ تێیدا تواناکانی خۆی تاقیدەکاتەوە، بێ ئەوەی زۆر گوێ بداتە دەرئەنجامی ئەوەی تواناکانی چی لێدەکەوێتەوە.

گرنگە شەڕانگێزی ئەم قۆناغە لە ئاستێکدا بوەستێت و زیاتر گەشە نەکات، بەردەوام نەبێت و نەبێتە سیفەتێك لە سیفەتەکانی منداڵ، نەپەڕێتەوە بۆ قۆناغەکانی دیکەی ژیان، نەبێتە بەشێك لە کەسایەتی منداڵ و ئیدی تا مردن لێی نەبێتەوە، ئەم شەڕانگێزییە لای کەسی نوسەر وخوێنەوار دواجار دەگۆڕرێت بۆ کاری داهێنان و نوسینی شاکاری مەزن، وەك لای سەلیم بەرەکات دەیبینین، بەلاَم لای کەسی دیکتاتۆر دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی گەورە و کاولکاری، لای کەسی نوسەر دەبێتە پانتاییەك لە یادەوەریدا هەڵیدەگرێت و جار جارە دەگەڕێتەوە ناوی و سەرلەنوێ لە پرۆسەی نوسیندا بەشێوەیەکی داهێنەرانە سودی لێوەردەگرێ و دایدەڕێژێتەوە، بەلاَم لای کەسی دیکتاتۆر دەبێتە جۆرێك لە هەڵسوکەوت و بەشێك لە کەسایەتییەکەی، کە ئەمەش دواجار وێرانە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

کتێبی گیرفانی شێرە کوللەی ئاسنین، یەکێکە لەو کتێبانەی کە تێیدا خوێنەر لەبەردەم سەرگوزشتەی منداڵی سەلیم بەرەکاتدا ڕادەوەستێت، ئەم سەرگوزشتەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە نوسەری گەورە سەلیم بەرەکات هەر لە منداڵیەوە جۆرێك لە پرسیار و سەرکێشی و هەوڵدان بۆ زانینی شتەکانی دەوروبەری تێدا بووە، جۆرێك لە حەزی زانین و گەڕان و سەفەرکردنی تێدابووە، لەو تەمەنە کەمەدا ئەم پیاوە دەرك بەوە دەکات کە ژیان پانتاییەکی

فراوان و بێسنورە، تێدەگات دنیا زۆر لە گوندەکەی ئەمان گەورەتر و بەربلاوترە.

لەم کتێبەدا ئێمەی خوێنەر لەبەردەم منداڵییەکداین کە سەرشارە لە هەڵچون و سەرکێشی و تورە بوون، پڕە لەو ساتانەی کە تێیدا توندوتیژی گەشەدەکا و پەرەدەسێنێ، ئەوەتا سەلیم بەرەکات لەو تەمەنەدا و لەکاتی هاتنی سەرۆکدا بۆ قوتابخانەکەیان و ڕاوەستانیان لەسەر شۆستەو شەقامەکان و بەزۆر هوتاف پێکێشانیان بە سەرەتای توندوتیژی لێکدەداتەوە، ئەم حاڵەتی ڕاوەستان و هوتاف خوێندنەوەیەش کە بە جۆرێك توندوتیژی باسی لێوەدەکات چەند ڕۆژێکی خایاندووە، هەربۆیە وایکردووە سەلیم بەرەکات لەبەرامبەریدا هەڵوێستی توندوتیژ بنوێنێ، لەمەکتەب کەوتوەتە بردنی تەباشیری ڕەنگاو ڕەنگ و نوسینی دیواری کوچە و کۆڵانەکان، لەماڵەوەش دوای ڕۆشتن و چونەدەرەوەی باوکی کەوتوەتە قیڕاندن بەسەر دایکیدا و شکاندنی کەلوپەلەکانی ماڵەوە.

لێرەدا ئێمە لەبەردەم حاڵەتێکی ناسراوی گشتیدا ڕادەوەستێن، حاڵەتی بردنە دەرەوەی قوتابیان و خوێندکارانی قوتبخانەکان بۆسەر شۆستەو شەقامەکان، لەکاتی هاتنی سەرۆکێك یاخود بەرپرسێکی گەورە، یاخود هێنانەوەی تەرمی کەسێکی ناودار و ڕاوەستانی ئەو منداڵانە بۆ چەندین سەعات، بەبێ ئەوەی ئەو منداڵانە لەوە بگەن کە بۆچی هێناویاننتە سەر شەقامەکان و وانەکانیان پێ بەجێهێشتون، گومانی تێدا نییە ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی گرژبون و بێزاری ئەو منداڵانە، ڕاستە لەوکاتەدا کە ڕاوەستاون لەوانەیە هیچ پەرچەکردارێکی ناڕەزایی دەرنەبڕن، بەڵام لەناوەوەیندا و لەناخیاندا دەبێتە هۆی دروست بونی جۆرێك لە نارازیبون و تورەبون، ئەویش لەوکاتەدا دەردەکەوێت کە ئەو منداڵانە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و بێزاری و تورەبونی خۆیان بە ئەندامانی خێزانەکەیان دەرێژن.

هەر لەم کتێبەدا لەوەدەگەین کە دنیای منداڵی دنیایەك نییە دوور لە توندوتیژی و دوور لە بەکارهێنانی ڕەق، مەملەکەتێك نییە هەموی پڕبێت لە گوڵ و گوڵزار و میهرەبانی، ئەوەتا ئەم نوسەرە گەورەیە دوای ئەوەی لەدەست دایکی ڕادەکات، خۆی دەگەیەنێتە بەردەم گۆشەیەکی حەوشەکەی ماڵەوەیان کە تەلبەندێکە بەدەوری کولانەی کەروێشکەکاندا کێشراوە، لە بنەوە تەلبەندەکە دەردەهێنێ و تا هێزی تێدایە مەسینەیەك کە لە مس دروستکراوە دەگرێتە کەروێشکەکان و بەر دانەیەکیان دەکەوێت، لە ئەنجامی هەڵکێشانی تەلبەندەکە و فڕێدانی مەسینە مسیەکە دوازدە کەروێشك گیانیان لەدەست دەدەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بۆماوەی بیست ڕۆژ ئەو منداڵە نەوێرێ بچێتەوە بۆ ماڵەوە و لە نێو کێڵگە پەموەکەی تەنیشت ماڵەوەیاندا بنوێ و خواردنیشی تەنیا ئەوەبێت کە براکانی بۆی دەهێنن.

لەم کتێبە بچکۆلەیەدا ئێمە لەبەردەم دنیای منداڵی نوسەرێکی گەورەدا ڕاوەستاوین کە تا ئەندازەیەکی بەرچاو پڕە لەساتی شەڕانگێزی و لاساری، کەم نین ئەو کارە سەرەڕۆیانەی کە نوسەر لە قۆناغی منداڵی خۆیدا ئەنجامی داون، بەڵام هەموو ئەو کارانە دواجار نەیانتوانیوە کەسێکی دیکتاتۆر دروست بکەن، بەڵکو بونەتە هۆی ئەوەی ئەدیبێکی گەورەمان

پێببەخشن، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەو شەڕانگێزیە لە ژیانی ئەم نوسەرەدا نەگوازراوەتەوە بۆ قۆناغەکانی دیکەی تەمەن.

ماوەتەوە بڵێن وەرگێڕی کوردی توانایەکی باشی نواندوە و تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتو بووە لە وەرگێڕانەکەیدا، چونکە خوێنەر بە ئاسانی و بێ گرفت دەتوانێت کتێبەکە بخوێنێتەوە و لێی تێبگات.

## ئەبستراکتی ئەندازەیی

**ئا: تینا**

**تابلۆ: خاچێکی ڕەش** 1915

**هونەرمەند: کازێمیر مالیفێچ**

(1935-1878)

**شوێن: مۆزەخانەی هونەری مۆدێرن لە پاریس**



ئەگەر زۆر جار هونەری کوبیزم (التكعيبية) پشتی بەستبێ بە مۆدێلێکی دیاریکراو، بۆ بەرهەمهێنانی تابلۆیەک کە تیایدا گرنگی دەدرێ بە فۆرم و ڕەنگ و هێڵ" ئەوا دواتر ئەم جۆرە تێگەیشتنە شیکردنەوەیەکی پەرگیری خێرای بەخۆوە بینی. بۆ نموونە لە هونەری ئەبستراکت (تجريد)دا مۆدێل بایەخێکی ئەوتۆی نامێنێ، هەرچەندە هەندێ جار ئەو هونەرە ئەبستراکتەی کە لە سروشتەوە ئیلهام وەردەگرێ، پەنا دەبا بۆ بەکارهێنانی چەند دیمەنێکی سروشتی بە بیانووی نمایشکردنی چەند رووبەرێك لە ڕەنگی ڕوون" بەڵام هونەری ئەبستراکتی ئەندازەیی پەنا بۆ هیچ سەرچاوەو بیانوویەك نابا. لە ئاست تابلۆیەکی وەك "خاچی ڕەش"دا، بینەر دەبێ تەنها بەرامبەر پارچەیەك لە ڕەنگ بووەستێ و هیچی تر. زۆر کەس لە توانایاندا نییە هەست بە هیچ چێژێك بکەن لە ئاست ئەبستراکتی ئەندازەییدا، ئەمەش کەموکورتییەك نییە کە پەیوەندیی بە نەبوونی هەستیارییەوە هەبێت" چونکە چێژێکی راستەقینە کە هونەری ئەبستراکت دەیبەخشێ، وەك سێجاگەری (کوبیزم) و چەند ڕەوتێکی هونەریی کە دوای کوبیزم هاتن، چێژێکی فیکرییە کە چاو نایگەیەنێ. (هەرچەندە) ئەگەر تابلۆیەك هەڵگری شتێك نەبێت کە پێشتر لە تابلۆکانی تردا لەسەری ڕاهاتبین، وەك ئەوانی تر نامانبزوێنێ، بەڵام فیکر و دۆخە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان و تەواوی مۆتیڤەکانی دیکە، هەروەها پەرچەکرداری هونەرمەندانی ئەبستراکت، سەرچاوەی ئەو ڕاچەنینە ویژدانییەن کە هەستی پێدەکرێ.

ڕەنگە پێویست نەکا ئاماژە بەوە بدەین کە خاچی ڕەش لێرەدا هیچ پەیوەندییەکی بە خاچی مەسیحەوە نییە، بەڵکو تەنها فۆرمێکی ئەندازەییە. هونەرمەند چەند تابلۆیەکی تری هەن" وەك چوارگۆشەیەکی سپی، چوارگۆشەیەکی ڕەش و.. شتی تری لەو بابەتە.

### سەرچاوە

جولة في عالم الفن، عبود عطية. (بيروت: المؤسسة العربية للدراسات و النشر، 1985)، ص 108.

## شیعر و فیکر

## ئەدۆنیس وەك نموونە

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد



ئەزموونی شیعری و فیکریی شاعیری گەورەی عەرەب ئەدۆنیش ئارەزووی توێژەران و رەخنەگران بۆ نووسین دەبزوێنێ, بەو پێیەی ئەم ئەزموونە دیاردەیەکی سەرجەمگیر و بەنێویەکداچوو و ئاوێتە ئامێزە, یاسا و میکانیزم و مەرجەعیاتی خۆی لە کەلەپوور و لە هەردوو کولتووری عەرەبی و ئەورووپیدا هەیە, هەروەکو کۆمەڵێ دژایەتی و ناکۆکیشی هەڵگرتووە و بزووتنەوە ناوەکییەکەی ئەو ئەزموونە بەدەست دەهێنێ و لە ئاسۆیەکەوە بەرەو ئاسۆیەکی تر و لە کایەیەکی مەعریفییەوە بەرەو کایەیەکی مەعریفی تر دەیگوازێتەوە. ئەم ئەزموونەی ئەدۆنیس ئەرگۆمێنت و گفتوگۆ دەوروژێنێ و لە ڕاستیدا ئەم ئەزموونە بەرامبەر بە ژمارەیەك پرسیار و شیمانە و ئەگەردا دەکرێتەوە. دەشێت بڵێین "ئەزموونی ئەدۆنیسی" ئەگەرچی ئارەزوویەکی گەورەی نووسین و کردنەوەی کۆد و نهێنییەکانی دەبزوێنێ, بەڵام لە هەموو رەهەندەکانیەوەو بەشێوەیەکی زانستی لێینەکۆڵراوەتەوە. پێموایە ئەم چەشنە لێکۆڵینەوە زانستیە لە بارەی ئەزموونی ئەدۆنیس یان دیاردەی ئەدۆنیس پێویستی بەو توێژەرانە هەیە کە ئاگادار و شارەزای کۆمەڵێ کایەی مەعریفین, ئەو کایە مەعریفیانەی کە ئەدۆنیس لە چاوگە پاکژەکانیانەوە ئاوی لێخواردونەتەوە و لە سەرچاوە ئەسڵییەکانیەوە وەریگرتوون, بەرهەمە فیکری و ئیبداعیەکانی ئەدۆنیس لە کۆی ئەو مەعریفە جیاجیایانەوە هەڵێنجراون, بێگومان ئێمە لێرەدا ئەو ئەزموونە لە چەند وەسفێکی ئاساندا کورت ناکەینەوە, بەڵام ئەدۆنیس بەهەق شاعیرێکی ڕووناکبیر و بیریارە, ئەگەر شیعر بیرکردنەوەی ئەدۆنیس بێت بە وێنە و داهێنانی وێنەی فیکر بێت و هەموو ئەمانەشی لەو دەفرە چڕکراوەدا چڕ کردبێتەوە کە پێیدەڵێن قەسیدە – ئەوەی کە لە رۆمانە شیعرییەکەیدا خستوویەتیە ڕوو ئەوا فیکر لە لای ئەدۆنیس سەرباری خۆبەستنەوەی بە میتۆدێکی زانستی, خاڵی نییە لە چڕیی شیعر و لە ڕەونەق و گەشانەوەی شیعریی.

کەواتە لە ئەزموونی ئەدۆنیسیدا شیعر و سۆفیگەری, شیعر و فەلسەفەکاری, گەڕان بە دوای کانگاکانی زێڕ و زیو لە کەلەپووردا, جیاکردنەوەی نێوان ستاتیك و دینامیك – الثابت و المتحول –, ئیلهام وەرگرتن لە ناو هێماکانی هەردوو رۆشنبیریی عەرەبی و ئەوروپی, تێکەڵکردن و ئاوێتەکاریی نێوان رۆمانسیزم و سوریالیزم و ریالیزم و سۆفیزم, هەموو ئەمانە لە بەنێویەکداچوونێکی کەم وێنەدا دەردەکەون. بە کورتی ئەم ئەزموونە ئارەزوویەکە بۆ گەیشتن بە کەماڵێکی مەحاڵ. ئەم ئەزموونە لە چەندین کتێبی شیعری و رەخنەیی و فیکریدا گەڵاڵە کراوە, هەر بۆ نموونە: (أغاني مهيار الدمشقي) و (اوراق

في الـريح) و (هـذا هـو اسمـي) و (وقـت بـين الرمـاد) و (ابجديـة ثانيـة) و (المسـرح و المرايـا) و (احتفــاء بالاشــياء الغامضــة الواضـحة) و (النظـام و الكـلام) و (ها أنت ايها الوقت) و (الثابت و المتحـول) و (الشـعرية العربيـة) و (سياسة الشعر) و (كلام البدايات) و (الصــوفية و الســوريالية) و (كتـاب الحصـار) و (الكتـاب أمـس المكان الآن).

ئەوەی وای لـە د. وائل غـالی کردووە ئەم کتێبە نوێیە لە بارەی ئـەدۆنیس دابنـێ، بریتییـە لـە هەوڵــدانێك بــۆ دۆزینــەوەی پەیوەندییــە دیالێکتیکییــەکانی نێوان شیعر و فیکر لـە ئەزموونی ئەدۆنیسـدا، هـەروەها پەیوەنـدی ئــــاڵوگۆڕی کاریگــــەری و کارتێکردن، لەبەرئەوە ناونیشانی کتێبەکە بووە بـە (شیعر و فیکر) تا پتر بچێتە قووڵایی بیۆگرافیای شـیعری و فیکـری و کەسـێتی ئەدۆنیسەوە و ئەم بیۆگرافیایە بە مەرجەعیاتی کولتووری عەرەبی و ئەورووپییەوە گرێ بداتەوە. وائل غـالی لـەم کتێبـەدا دەگاتـە ئـەو دەرەنجامــەی کــە پێــی وایــە ئەدۆنیس شـاعیرێکی گەورەیـە بـە قەدەر ئـەوەی گوزارشـت لـە خـۆی دەکـات هاوکـات گوزارشـت لــە هــەموو ســەردەمەکەی خــۆی دەکــات، واتــە گوزارشــت لــە جەوهـەری ژیـاریی سـەردەمەکەی خـۆی دەکـات. شـیعری ئـەدۆنیس بریتییـە لـە هەڵچوون و سـۆز و شعور و هەستیاری، جگـە لەمانـە شیعری ئەدۆنیس شتێکی تریشـە کـە دەشـێت نـاوی بنـێین فیکـر، چونکە ئەدۆنیس لە میانی سۆز و هەست و هەڵچوونەکانی خۆیـەوە گوزارشـتی لـە جیهـان کـردووە، بەمانایـەکی تـر هەڵوێسـت و ڕای خـۆی لەبەرامبـەر دنیـادا هەیـە. شیعر لەلای ئەدۆنیس فەلسـەفەیە بــەو پێیــەی هەوڵدانێکــە بــۆ کەشـفکردنی دنیـا یـان ناسـینی دیوەکەی تری دنیا و شتەکان.

ئەم کتێبـە لـە پێشـەکی و نۆ بــەش و کۆتــایی پێکهــاتووە و نووســەر لــە پێشــەکییەکەدا لــە بەرامبــــەر ئاگــــایی تیــــۆریی ئەدۆنیســــدا دەوەســــتێ و ئــــەم ئاگاییــــە تیۆرییــــە لــــە کتێبــــە بنەڕەتییەکــــەی ئەدۆنیســــەوە دەردەهێنــێ کــە بەناونیشــانی "سـتاتیك و دینامیـك" (الثابـت و المتحول)ەو تا ئەمڕۆ هەشت جار چــاپکراوەتەوە. وائــل غــالی وایــــدەبینێ ئاگــــایی تیــــۆری ئـەدۆنیس لـەو کتێبـەوە بناغـە دادەنێ و ڕوانینی خۆی بۆ شیعر و سیسـتمی داهێنـان مانیفێسـت دەکات. نووسەر لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا بیۆگرافیای ئەدۆنیس دەگێڕێتــەوەو لــەو کاریگەرییــە کۆمەڵایـــــەتی و سیاســـــی و ڕۆشــنبیرییانە دەکۆڵێتــەوە کــە ڕۆڵیــان لــە پێکهاتــەی ئاگــایی ئــەدۆنیس و شــێوەی ڕوانــین و قەسـیدەکانیدا هــەبووە. بەشــی دووەم بە ناونیشـانی (شیعرییەت و ناسـنامە) درێژەپێـدانی بەشـی یەکەمــەو لەوێـــدا نووســـەر وایـدەبینێ ناسـنامەی شـاعیر لـە زمانەکەیدایـە کـە لێـرەدا زمـانی عەرەبییـە بـەڵام زمـانێکی عـەرەبی تایبەتییــە و لــە کۆنتێکســتی فیکـری زمانەوانییـەوە گەڵاڵـەی کـردووە، لـە قوتابخانـەی نـەحوی بەصـــــری و ئیعتیـــــزالی و عەقڵانییــــەوە وەریگرتــــووە، لەبەرئەوە ماناکان تـەئویل دەکا و بـە دوای هۆکارەکانـدا دەگـەڕێ و بـە بـەردەوامیش ناگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو تێکسـتانەی لـە عەرەبـەوە گــــــوێی لێگرتــــــوون و خوێندوونیەتەوە، بەڵکو زۆر جار دەچـێتە سـەر ئـەو مەخزونـە زمانەوانییــەی لــەلای مرۆڤــدا پــارێزراوە و لەگــەڵ ویژدانــدا کارلێك دەکا، ئەو مامەڵەیـەکی تـر لەگـەڵ ئـەو مەخزونـەدا دەکـا و تەئویلی زمانەوانیان بۆ دەکا و لـە پشــتی ڕووکــاری وشــە و

واژەکانەوە بە دوای مانا شاراوەکانیاندا دەگەڕێ.

لە بەشی سێیەمدا بە ناونیشانی تێڕوانینی ئەدۆنیس بۆ حەقیقەت، نووسەر پشت بە تێڕوانین و تێگەیشتنی ئەدۆنیس بۆ حەقیقەت دەبەستێ. ئەدۆنیس دەڵێ: لەبەرئەوەی حەقیقەت بە ڕووت و قووتی وەکو بەرائەت و بێگەردی و وەکو منداڵی و وەکو خەون وایە، تەنها شێتی دەتوانێ ئەو حەقیقەتە لە ئامێز بگرێ، هوشیاری و ئاگایی حەقیقەتیان بە ڕووتی قبوڵ نییە بۆیە دەیشارنەوەو پەردەپۆشی دەکەن، کەچی شێتی پەردەکان دەدڕێنێ و دەمامکەکان لادەبات بۆیە ئاوێزانی حەقیقەت دەبێ، حەقیقەت وەك ئەوەی بریتییە لە ڕووتی و شێتی، حەقیقەتی ڕووتی و شێتی لە یاسای سروشتدا یەك شتە، بەڵام ئەمە لە یاسای عەقڵدا دژ و پێچەوانەیە و گەڕانەوەش بۆ حەقیقەت – واتە بۆ بەرائەت و منداڵی و خەون – چوونە ناو مەملەکەتی مەرگە.

لە بەشی چوارەمدا لە ڕەوت و ئاراستەی ئەدۆنیس دەکۆڵێتەوە کە بریتییە لە ڕەوتی جیاوازییەکی ڕەها، ئەدۆنیس بیریاری فرەیی و پلورالیزمە و یەکێکە لە گەورەترین نەیارانی یەکگرتن، ئەدۆنیس پێیوایە ئێمە لە قۆناغی گواستنەوەداین لە تاکڕەهەندیی تێگەیشتنەوە بۆ فرە ڕەهەندی، یان لە تاکانەیی شیعرییەوە بۆ فرەیی شیعریی، ئەم فرەییە گەواهیەکە بۆ دینامیکیەت و زیندەگی زمانی شیعری و هاوکات بۆ زیندەگیی خودی شاعیر، هەروەها بەڵگەیە بۆ نوێکردنەوە لە ڕوئیادا و لە هەستیارییەکی دەوڵەمەندا و لە ڕێگە و شێوازەکانی گوزارشت کردندا، واتە نوێکردنەوەی بەردەوامی روانین و هەستەکان و بیرکردنەوە و شێوازەکانی تەعبیر. بەشی پێنجەمی کتێبەکە تەرخانە بۆ ئەو پرسیارە قورسانەی ئەدۆنیس ئاراستەی کولتوور و ڕۆشنبیریی عەرەبی و ئیسلامی دەکات، هەروەکو ئەمە لە کتێبە تیۆری و لە ڕامانە فەلسەفییەکانیدا دەردەکەوێ. ئەدۆنیس وایدەبینێ مومکین نییە لە کولتووری عەرەبی ئیسلامی یان ئیسلامی عەرەبی تێبگەین تەنها بە پشکنین و لێکدانەوە و شیکردنەوە نەبێ لە ناو ئەو کولتوورە خۆی و بە ئامراز و کەرەستەکانی خۆی. سەیرە ئەمڕۆ لە چرکەساتێکی مێژوویی وادا دەژین کە پێدەچێ ئەم کولتوورە سەرباری ئەو هەموو گۆڕانکارییانە لە بونیادی ژێرخاندا کەچی بە پاشکەوتوویی و جێگیری بمێنێتەوە و لە شانۆیەك دەچێ تیایدا مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە. ئەم مەسەلەیە لەلای ئەدۆنیس مەسەلەیەکی ئاڵۆزە و ئەو بەردەوام دەگەڕێتەوە بۆ بنەما ئایینییەکانی هۆکاری پاشکەوتوویی ڕۆشنبیریی عەرەبی. لە بەشی شەشەمدا لە میتافیزیکای مرۆڤ دەکۆڵێتەوە نووسەر لەو بەشەدا بنەمای تێڕوانینی سۆفیگەرانەی ئەدۆنیس بۆ ئینسان ئاشکرا دەکا و وەکو شاعیرێك شێواز و ڕەوانبێژی کۆنی عەرەبی جێدەهێڵێ و لە ڕاستیدا شێوازی ئەدۆنیس شێوازێکی تەفکیکی ئامێزە و وەکو ئاوێزەیەك لە چەندین ڕووەوە دەخوێنرێتەوە. ئەزموونی شیعریی ئەدۆنیس پرۆژەی ئازادبوونە لەو کۆتانەی سنوور بۆ ئازادیی ئینسان و بۆ بزاوت و جووڵانەوەکانی دادەنێن. ئەدۆنیس ڕەهەندێکی هیومانیستی بە مرۆڤ بەخشیوە کە هەموو سنوورەکانی نەتەوەو ڕەگەز و ئایین جێدەهێڵێ و مرۆڤ وەکو خودێکی ئازاد دەمێنێتەوە، ئەم تێگەیشتنە –وەکو ئەدۆنیس دەڵێ– بەجۆرێکی تر لەلای

هەندێ لە شاعیرە داهێنەرەکانی عەرەبدا هەبووە، بۆ نموونە موتەنەبی و ئەبونەواس و ئەبولعەتاهیە و ئەبوعەلای مەعەڕی و ئیبن ئەلرومی و بەشار بن بورد.

نووسەر لە بەشی حەوتەمدا دێتە سەر پەیوەندیی نێوان سروشی ڕەها و شیعری هیومانیستی و دواجار ئەم دووانە لێکدی جیادەکاتەوە. ئەدۆنیس پتر مەیلی ئەوەی هەیە نووسینێك بەرهەم بهێنێت پێشتر نموونەیەکی لە نوسینی عەرەبیدا نەبووبێت، دەبێ نووسەر لە خۆیەوە دەست پێبکات نەك لەسەر نموونەیەك بوەستێ، واتە دەبێ شاعیر ئاسۆی تر و روانینی تر لە تەعبیر و لە چوونە قوڵایی دەروون کەشف بکات و دیدێکی تری بۆ دنیا و شتەکان هەبێت. نووسەری ئەم کتێبە لە ئەزموونی ئەدۆنیسدا دەگاتە سەرەنجامێك کە ئەمە ئەزموونێکە لە دابڕان لەگەڵ واقیعدا پەنجەرەیەکی بەرین دەکاتەوەو پەیوەستێکی بەهێز لەگەڵ خەیاڵ و خەیاڵکراودا دادەمەزرێنێ. ئەزموونێك سنوورەکانی واقیع دەبڕێ بۆئەوەی قووڵتر شۆڕبێتەوە ناو سوچە تاریکەکانی واقیع، لێرەوە شاعیر شتێك دەڵێت دوورە لەو دەلالەتەی ڕواڵەتی وشەکان دەریدەبڕن، واتە دەقێك لەسەر زمانێکی تر بنیات نراوە کە بە تەنها نهێنییەکانی خەیاڵکراو هەڵناگرێت بەڵکو نهێنییەکانی خودیش دەهێنێتە سەرەوە، دەقێك لە دوو سەرەوە دابڕان دەنوێنێت: لەگەڵ نووسینی شیعریی سەردەمەکەی خۆی و هەروەها لەگەڵ زمانی ئەو نووسینە، لێرەوە شاعیر پرۆسەی سیستمێکی تری روانین و نووسین و ڕێگەکانی تەعبیر و پەیوەندیی نێوان زمان و شتەکان ئەنجام دەدات. ئەدۆنیس لە نووسینیدا شتەکان لە رابردووی خۆیان دەردەهێنێ و ناوەکۆنەکانیان لێدەستێنێتەوەو شێوازە کۆنەکانی گوزارشت رەتدەکاتەوەو بەمجۆرە دەیانخاتە ناو وێنەی تر و گوزارشتی تر و زمانێکی ترەوە و ناوی نوێیان بۆ دادەنێ، لێرەدا نووسین گۆڕانکارییە، شتەکان نوێ دەکاتەوە و لەگەڵیدا وێنەکان و پەیوەندییەکانی نێوانیشیان نوێ دەکاتەوە، زمان نوێ دەکاتەوە بەو پێیەی کۆمەڵێ پەیوەندی نوێ لە نێوان وشەکان خۆیان و لە نێوان وشەکان و شتەکاندا دادەمەزرێنێ.

## سەرچاوە

لە ئینتەرنێتەوە – سایتی: (www.albayan.co.ae).

